

# مرۆڤ

د.عەلی شەریعەتی

وەرگێڕانی موسعەب ئەدهەم

چاپی سێیەم

٢٠١٤

**بەناوی خودا**


***ناسنامەی کتێب***

- ☐ ناوی کتێب: **مرۆڤ؟**
- ☐ ناوی ن وسەر: **دکتۆر عەلی شەریعەتی.**
- ☐ وەرگێر: **موسعەب ئەدهەم.**
- ☐ بابەت: **فیکری**
- ☐ پیتچنین: **رێبوار عومەر ، بیلال ئەدهەم**
- ☐ بەرگ و دیزاین: سەیوان سەعیدیان
- ☐ **هەڵەچن، وەرگێر.**
- ☐ نۆرەی چاپ: **چاپی سێیەم ٢٠١٤**
- ☐ نرخ: **٦٥٠٠ دیناری چاپی نوێ**
- ☐ تیراژ: **١٠٠٠ دانە**





لە بەڕیوەبەرایەتی گشتی کتیبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٤١٩ ) سالی پیدراوە.

**پێشکەشە:**

به نیوەکەی تری رۆحم، هاوسەرم "کەیغان "خان.

## پێرست

# رۆحی مرۆڤـ – جیهانی مرۆڤ [1]

مرۆڤ بەرپرسیارە، چونکە مرۆڤ خاوەنی ئیرادەیە هەر ئەمەش گەورەیی و مەزنی پێ بەخشیوە. تەنانەت بە هۆی ئەم ئیرادەوە جیاوازترە لە فریشتەکان ولەسەرووی ئەوانیشەوەیە، ئەمەش گوتەی گەلێك لە زانایان و بیرمەندانی ئایینە. ئەگەر مرۆڤ گەورەترین بوونەوەری عاقڵ بێت و بە گوتەی بیرمەندی ناسراو (علی عزت بیگۆڤیچ) مرۆڤ تاکە توخمێکی جێگیرە لە جیهاندا، ئەوا پێکهاتەی دوو بەشە، یاخود دوولایەن بەشداری دەکەن لە بوونیادی مرۆڤدا ئەوانیش لایەنی (مادی ) ولایەنی ( مەعنەوی)ن واتە ( رۆح) و (جەستە)، لەگەڵ ئەوەشدا هەر لایەنێك پێویستی بە گرنگی پێدانی خۆی هەیە بۆ ئەوەی هاوسەنگی پارێزراو بێت، چونکە گرنگیدان بە لایەنێکیان دەبێتە هۆی کەمبوونەوە ولاوازبوونی روو بەری لایەنەکەی دی و دەرەنجام مرۆڤێکی ناهاوسەنگ پەیدا دەبێت و لەسەر رەوتی ئاسایی خۆی نامێنێت.

ئیدی لێرەوە مرۆڤ دوو دیوی هەیە، دیوی بینراو و دیوی نەبینراو هەروەك چۆن رواڵەت و روخساری مرۆڤەکان جوانترین شێوەیە (لقد خلقنا الانسان فی احسن تقویم) ئەوا لایەنە نادیارەکەشی گەلێك مەزن و هەلگری دونیایەك راز و نهێنیە و بە گوتەی مەولانای رۆمی:

---

[1] ئەم پێشەکیە لە دوو ژمارەی گۆڤاری"هەژان" دا لە دوو بابەتی جیاواز لەمەڕ مرۆڤ نووسراوە و بە پێویستم زانی لە پێشەکی ئەم کتێبە کە بەناوی "مرۆڤ" ەوەیە وەکو خۆی بڵاویان بکەمەوە.

شەپۆلی توندی دەریاکانی رۆح

گەلێ مەزنترن لە دەریاکەی ن ووح

سەیدای هەورامیش دەفەرموێت:

هەزار کەس وەی تەور، بە شێوەش ئێ بازین

نیم بە حەقیقەت، نیم بە مەجازین

تا مەجاز نەبۆ، حەقیقەت نەمەبۆ

حەقیقەت بێ مەجاز، تەحقیق نەمەبۆ

واتە: (خەڵکان هەر یەکە و بەجۆرێك خەریکی یاری و ژیانن نیوەی بە حەقیقەت و نیوەی دیکەی بە شێوەی مەجازی، تاکو مەجاز نەبێت، حەقیقەت نابێت، و حەقیقەت بە بێ مەجاز نایێتەدی).

بۆیە جیهانی نەبینراو و دیوە نەبینراوەکەی مرۆڤ نە هەر هێندەی جیهانە بینراوەکەی بەڵکو زۆر لەوە زیاتر فراوانتر و گەورەترە (د. عبدالکریم سروش) گوتەنی: جیهانی نەبینراو، جیهانی نەبینراوی خستووەتە باوەشی خۆیەوە ولە هەناوی خۆیدا هەڵیگرتووە، بۆیە مەولانای رۆمی کاتێك بەراوردی جەستە و گیان دەکات وەکو جیهان و کوچەیەك یان شەقامێك یان وەکو دەریایەك و ئاوی گۆزەیەکن لە چاو یەکدیدا و دەڵێت: جەستە بەشە وگیان گشتی گشتە و خۆت بە بچووك مەزانە.

این جهان چون کوزه، دل دریای آب

این جهان چون کوچه، دل شهر عجاب

چیست اندر کوزه کاندر بحر نیست

چیست اندر کوچه کاندر شهر نیست

جسم تو جزو است و جانت کل کل

خویش را قاصر مبین در عین ذل

یان دەفەرموێت :

بیرون تو نیست هرچه در عالم هست
از خود بطلب هر آنچه خواهی که تویی

واتە: (لەدەرەوەی تۆدا نیە ئەوەی کە لە جیهاندایە، لە خۆت داوا و بووێت ئەوەی کە خۆت دەتەوێ و داوای دەکەیت).
بۆیە هیچ دروستکراوێکی دی ناتوانێت دەوری مرۆڤ بدات و هیچ بوونەوەرێکی دی بازنەی بوونی هێندەی مرۆڤ گەورە و فراوان نیە و تەنها یەزدانی مەزنە دەوریداوە.
ئیمامی عەلی لە دێڕە شیعرێکی جواندا دەفەرموێت:

اتزعم انك جـــــرم صغير
و فيك انطوى العالم الاكبر

واتە: تۆ وادەزانی کە تەنها بەشێکی گچکە و زۆر بچوکیت، لە کاتێکدا جیهانێکی مەزن لە نێو تۆدا بوونی هەیە.
فەیلەسوف و عاریفی گەورەی کورد کاك ئەحمەدی موفتیزادەش پێی وایە بۆ هەموو شتێکی ماددی دەبێت پێشەکیەکی مەعنەوی هەبێت و هەروەها بۆ هەموو شتێکی مەعنەوی دەبێت پێشەکیەکی ماددی هەبێت.
ئەگەر مرۆڤ هێندە گەورە و مەزن بێت ئەی نابێت شتێکی مەزن هەبێت بۆ ئەوەی بەردەوام وەکو چۆن جەستە ولایەنی دیار و ماددیەکەی پێویستی بە وزە و خۆراك بێت بەوجۆرەش لایەنە نادیار و فراوانەکی تێر بکات و خۆراکی پێ ببەخشێت بۆیە عاریفێك دەڵێت: ئەگەر ئاژەڵ لە ڕێگەی دەمەوە خۆراك وەربگرێت ئەوا مرۆڤ لە ڕێگەی گوێکانیەوە خۆراکی وەردەگرێت. بەدرێژای مێژوی مرۆڤایەتی.

مرۆڤەکان پێویستیان بە شتێك هەبووە لەدەرەوەی خۆیانەوە بۆ ئەوەی پێداویستی رۆح و ناتەواوی و بۆشاییەکانی ناخ و دەرونیان پڕ بکاتەوە، هەر بۆیە ئایین ئەو هۆکارە بێ بەدیل و زۆر مەزنەیە کە هەمیشە مرۆڤەکان تین وی بوون و لەگەڵ بوونی مرۆڤەکاندا بوونی هەبووە ئەو رۆڵەی کە گێراویەتی بە هیچ شتێکی دیکە و ئەلتەرناتیڤێکی دیکەی نەبووە و نابێت، ئاخر ئەوە نیە چەندین زانست و رێگەی جۆراوجۆر دروستبوون بۆ ئەوەی لایەنە ناتەواو و کە موکورپەکانی دەرەوەی تاکەکان پڕ بکەنەوە بەڵام هەرگیز نەیان توانیووە جێگەی ئایین یاخود دیوی نەبینراوی مرۆڤەکان پڕ بکەنە و بۆیە بەگوتەی زۆربەی فەیلەسوفەکانی فەلسەفەی ئایین لە جیهاندا ئەو بۆشاییەی لە نێو ژیان و دەرونی مرۆڤەکاندا هەیە بە ئایین نەبێت بە هیچ شتێکی دیکە پڕ ناکرێتەوە، ئەمەش دەبێت لە دەرەوە بێتە ناوەوەی مرۆڤەکانەوە و ناخ و رۆحی ئاڵۆز و فرەڕەهەندیان رووناك بکاتەوە، بۆیە خودای گەورە دەبێتە ئەو خۆرەی ژیان و رۆحی مرۆڤەکان رووناك دەکاتەوە.

مرۆڤ لە نێوان دوو نهێنی گەورەدایە. نهێنیەکیان سەرەتاو ئەوی دی کۆتایی، هیچ شارستانیەتێك ناتوانێت لەم دوو بابەتە خۆی دەربازبکات و شتێکە هەرگیز گۆرانی بەسەردانایەت. ئەم وەستان و بوونی مرۆڤەیە لە نێوان دوو نادیاردا پەیامی حیکمەت و عیرفان و دین بەنەمری دەهێڵێتەوە. چونکە سەرووکاری لەگەڵ ئەم دووبابەتەدایە.. بەشێوەیەکی سادە ئێمەی مرۆڤ لەجیهانی رۆحەوە هاتووین و جارێکی دیش بۆ جیهانی رۆح دەگەرێینەوە.

گەڕانەوە بۆ زاتی حەق "خودا"کەهەم "غایە الغایات"ە و هەم "مبد المبادی"ە. عاریفێك دەفەرموێت:

انچه ازدریـــا بەدریا مـی رود
ازهمان جا کە امدانجا مـی رود
مازدریائیم و دریا می رویم
مازبالائیم و بالا می رویم

واتە:

ئەوەی لــــە دەریـــایە بۆ دەریــا دەڕوات
لـــەو جێگەوەی کەهاتووە بۆ ئەویٚ دەڕوات
ئێمـــە لـــــــە دەریاین و بۆ دەریا دەڕۆین
ئێمە لەسەرەوەین و بۆ سەرەوە دەڕۆین

هەموو شتەکان دوو دیویان هەیە یاخود دوولایـەنن. دیـوێکی ببینـراو "ظـاهر"دیـوێکی نەبینراو"باطن" مرۆڤ کـە بـەرێزترین و گـەورەترین دروسـتکراوەکانە "ولقـد کرمنـا بنـی ادم"

وەك مـەولانا دەڵـێ: نیوەمــان لــە ئــاو و گڵـە – نیوەمــان لـەگیان ودڵـە. لەلایــەن دروستکەری بوونەیشەوە پلەی تایبەتی هەیە زۆر بـەرووني و جـوانی هەردوولایەنەکـەی تێدا بەرجەستەبووە، علی عزت بیگـوڤیچ دەڵێـت: "مـرۆڤ تاکـە تـوخمێکی جـێگیرە لـە جیهاندا"بۆیەنەك هەر بەنەبووني یەکێك لەو دوولایەنە "ماددی و جەسـتە "و"مەعنـەوی و رۆح"ناتەواو دەبێـت، بـەڵکو مـرۆڤ بـووني خـۆی لەدەسـت دەدات."ئایـەتی پـیرۆزی: ﴿ولقد ذرانا لجهنم کثیرا من الجن والانس..لهم قلوب لایفقهون بهـا ولهـم اعـین لایبـصرون بهـا لهـم اذان لایـسمعون بهـا اولئـك کـا الانعـام بـل هـم اضـل﴾ ئاماژەیـەکی گرنگـە بەبەکارنەهێنان و سوود وەرنەگرتنی لایەنە نادیارو دڵ وچاوو گوێی مەعنەوی.

زانای بەناوبانگی جیهانی و وەرگری دووجاری خـەڵاتی نۆبـڵ لـە بـواری فـسیۆلۆژیادا "د.الکسس کارل"لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا "الانسان ذالك المجهول" دەڵێت و دەنوسێت:

لە کاتێکدا جەستەی ئێمە بەهۆی ئەندامەکانی دەرەوە و ناوەوە خەریکی کارکردنـە. کارو کاردانەوە رۆحیەکانیش بەهەمان شـێوە لەلایـەکی دیکـەوە کاردەکـەن وە کـردارە کیمیاوی و ناوەکیەکان ئەنجام دەدەن، ئەوەی کە دەبینرێت و بووني هەیە ئەوەیـە کـە

ئێمە لەرووی جەستەوە چالاکیەکانی رۆح دەبینین، بۆ نموونە: لە خەوداین جەستەمان خەوتووە، بەلاَم رۆحمان لە پەیکەری هەمان جەستەدا شارەکانی دیکە تەی دەکات.

ئەو پێی وایە هەڵەی گەورەی "دیکارت" ئەوەبوو کە بەو جۆرە بیری دەکردەوە کە "رۆح "و"جەستە" پەیوەندیان بەیەکەوە نیە، ئەم بیرە هەڵەیەش ماوەیەك تاکی مرۆڤی خستە نێو هەڵەوە.

بەرتراندراسل"B.rasel" فەیلەسوفی گەورەی ئەوروپا پیّ ی وایە مرۆڤ بەردەوام لە ژیاندا سیّ گرفت و کێشەی هەیە:

١- کێشەی لەگەڵ خودی خۆی.

٢- کێشەی لەگەڵ دەورو بەرو مرۆڤەکانی دی وەکو بوونی شەرو ستەمکاری...

٣- کێشەی لەگەڵ سروشتدا و دەرکەوتنی دیاردە سروشتیەکان وەکو بومەلەرزە ولافاو... بەلاَم دەلێت: گەورەترین کێشە کێشەی یەکەمە "کێشەی مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا"وە ئەگەر ئەمە چارەسەر بکرێت، هەموو کێشەکانی تر چارەسەردەبن، ئەمەش ئەو ئاماژەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ان اللة لایغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بانفسهم﴾.

عاریفانمان فەرمویانە: هەرکات خۆت ناسی، ئیدی خوای خۆت ناسیوە "من عرفە نفسە، عرفە ربە".

مرۆڤ بوونەوەرێکە لەسەر روی زەوی دەژی، بەلاَم تەنها زەمینی نیە، بوونەوەرێکە هەڵواسراولە نێوان ئاسمان و زەویدا کە لە لایەکەوە سروشتی رۆحی وە لەلایەکی دیکەوە سروشتی ماددی. مەبەست لە دروستبوونی و بەدیهاتنی ئەوەیە کە نوور"بارەگایی خوایی" لە ناخ و لە نێو جیهاندا شەوق بداتەوە و لەرێگەی بلاَوبوونەوەی ئەو نوورەوە کاربکات و بەو جۆرەی لە ژیاندا بە یەکسانی لەگەڵ

واقعيەتى ناوەكى"باطن"دا پارێزەرى هەماهەنگى لەجيهاندا بێت كە لەسەرەوەى خۆى وەرى دەگرێت.

لەديدى قورئانى پيرۆزيشەوە، مرۆڤ بوونەوەرێكە تواناى ئەوەى هەيە جيهان بخاتە ژێر دەستى خۆيەوەو فريشتەكان لەخزمەتيدا بن وە دەتوانێت بەرەو"اسفل السافلين"يش بروات و دابەزێت. مرۆڤ هێندە مەزنە كە ئەوە خودى خۆيەتى دەبێت دەربارەى خۆى بڕياربدات و چارەنووسى كۆتايى خۆيشى ديارى بكات ﴿ فمن شآ فليؤمن ومن شآ فليكفر..﴾.

"مورتەزا موتەهەرى" بيريارى ئێرانى سەبارت بەمرۆڤ دەڵێت: مرۆڤ پێكهاتەيەكە لە سروشت و ئەوديو سروشت"مابعد الطبيعة" لە ماددە و مانا، لە جەستە و گيان.﴿ الذي احسن كل شي خلقة وبدا خلق الانسان من طين، ثم نسلة من سلالة من.........ثم سواة و نفخ فية من روحة.......تشكرون﴾ سورة السجدة اية"٧-٩".

ئەوانەى مرۆڤ بچوك دەكەنەوە بۆ ئاژەڵێكى تەواو، وەكو ماددیگەراكان، ياخود بوونەوەرێكى بايۆلۆژى"biology" وەك ئەوەى لاى بايلۆجيستەكان هەيە و زيندەوەرزانەكانى وەك "داروين" كە سروشتێكى ئاژەڵى هەيە.. لەبەرئەوەى سيفەت و تايبەتمەندى مرۆڤ ناتوانرێت بەهۆى زانستى زيندەوەرزانى ياخود دەروونناسى...هتد باس بكرێن و پيشان بدرێن، بەڵكو سيما و سيفەتە مرۆييەكان كۆمەڵە بابەتێكى رۆحين، ئيدى دەبێت لەو جيهانە مەزنەوە سەيرى بكەين و مرۆڤ بناسين.

"د.سروش" دەڵێت: جارێكيان پرسيارم لە كارل پۆپەر"carel poper" كرد كە يەكێكە لە عاقڵترين عەقڵانيەكانى ئەوروپا سەبارەت بەگوناه، وەڵامەكەى ئەوە بوو پێناسەيەكى نەبوو بۆ ئەم چەمكە و نەيدەزانى گوناه چييە؟ پاشان دەڵێ: گوتم ئەمە عاقڵترين كەسى ئەوروپا بێت و يەكێك لەعاقڵەكان بێت، دەبێت ئەوانى دى چۆن بن!!.

ئەمەيە ئەو شتەيە كە شتە رۆحيەكان بەعەقڵ "عەقڵى رووت" لێكنادرێنەوە، بۆ نموونە عاريفى گەورەى كورد "نوورسى" پێناسەى بۆ گوناه ئەوەيە كە بريتيە لە برينداركردنى رۆح، ئەو كەسەى تاوانێك ئەنجام دەدات بە نەشتەرێكى تيژ بەرۆتە

رۆحی خۆی..لە فیلمەکاندا بینیومانە کەسێك تاوانێك دەکات، مرۆڤ دەکوژێت، شەو تاکو بەیانی خەوی نیە، ئارامی نیە...بۆچی؟ چونکە ئازاری رۆحی و دەروونی هەیە نەك جەستەیی! !و رۆحی بریندارە..!

لەدیدی عاریفانەوە، مرۆڤ پلەیەکی زۆر گەورەی هەیە بەتەعبیری خودی عاریفان هێماو نیشانەی تەواوی خودایە. ئاوێنەی"کمال"ی رووی حەقە، تەنانەت مرۆڤ بەجیهانێکی گەورەو جیهان بەجیهانی بچوك ناودەبەن.

ئیدی دەردەکەویٚ هەموو مرۆڤێك جیهانێکە، بەلأم سەربەخۆ، جیهانێك وەك ئامازەمان پێدا گەورەترو فراوانتر لە جیهانی بینراو هەستپێکراو... ئەو کاتە گەورەیی یەکەی ن ومایان دەبێت و پیشان دەدرێت بۆیە لەلای پەروەردگار "کوشتنی مرۆڤێك وەکو کوشتنی هەموانە و زیندوکردنەوەی وەکو زیندوکردنەوەی هەموانە...﴿ ومن احیاها فکانما احیا الناس جمیعا﴾ ئەمەیە ئەولایەنە گەورەیەی کە باسی دەکەین. عاریفی گەورەش "عەتتاری نیشاپوری" دەڵێت:

توپی گنج وهمه عالم طلیسم است

تـوپی معنی وبیرون تو اسم است

واتە: تۆ گەنجینەیت و هەموو جیهان تەلیسمە – تۆ مانایت ولە دەرەوەی تۆ ئیسمە.

کەواتە دەردەکەویٚ بەرونی مرۆڤ بەرۆح و ئەندێشە و هاوسەنگی نێوان دوولایەنەکەی وە هەستکردن بە هەردودیوەکەی مرۆڤ بوونی دەسەلمێت و ئیدی ئەو بوونەوەرەیە کە سەردار و تەنها دروستکراوی مەزنە.

لە کۆتاییدا و ئەوەی پەیوەندی بەم کتێبەوە هەبێت ئەوەیە کە یەکێکە لە کتێبە هەرە نایابەکانی خوالێخۆشبوو "د. عەلی شەریعەتی" لە کۆی بەرهەمەکانی، چونکە دەبێت ئەوە بزانین کە ئەم بیرمەندە جیا لەوەی مێژوونووس و یەکێکە لە گەورەترین نەك تەنها کۆمەڵناسەکانی ئێران بەڵکو بە یەکێك لە کۆمەڵناسە بلیمەت و ناودارەکانی

◆ مرۆڤ

جیهانی ئیسلامی و رۆژهەلاتیش دادەنرێت ولە هەماتکاتیشدا مرۆڤناسیکی بەناوبانگە و بۆچونەکانی جێگای گرنگیپێدان و خوێندنەوەن بە تایبەت ئەم پیاوە بە کە لە گوزەرەکانی مێژوو ئاشنایە ولەوێشەوە هەمیشە بەدوی ئەوەوە بووە کە رۆڵی مرۆڤ و مەزنی مرۆڤی بۆ ن ومایان بێت و مانای مرۆڤبوونی مرۆڤ بدۆزێتەوە، هەر ئەمەش وای لە بەندە کرد کە لە کۆبەرهەمەکانیی تریدا ئەم بەرهەمەیم کە دووەم بەرهەمی ئەم بیرمەندەیە وەربگێرم و زێدەتر لە نووسیەکانی دیکەی سەرنجی راکێشام و تەنانەت وەرچەرخانێکی رۆحی و هزری قوڵی تێدا دروستکردم بەو ئومێدەی تۆی خوێنەری ئازیزیش ئەو گۆڕانە رۆحیت بۆ دروست بکات و دیدگایەکی نوێت بۆ بکاتەوە و دەروازەی خۆناسین و خودناسینت بۆ ئاوەلا بکات.

لەمەڕ چۆنیەتی وەرگێران و جۆری وەرگێڕانەکەش هێندەی لە تواناما بوویێت خۆم ماندوو کردووە لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئەوەش روون بێت گەلێك لە نووسینەکانی شەریعەتی لە زمانی قسەکردن و گوتنەوە خراونەتە سەر نووسین و ئەم کتێبەش بەدەر نەبوولەمە و بەشێك لە بابەتەکانی زمانی قسەکردن بوون و بەندەش بۆ ئەوەی هەناسەی گەرمی و چێژی دەقەکە نەشێوێنم زۆر گۆڕانکاریم لەو بارەوە نەکردووە و بە هیوای ئەوەی خزمەتێکم بە رۆحی ئەم پیاوە و تێزە مەعریفی و هزریەکانی کردبێت و داوای لێبوردن لە خودا و پاشان لە تۆی خوێنەریش دەکەم لە هەر هەڵە و کە موکورتیەك کە بێگومان مرۆڤ شایەنی هەڵەیە و ئەگەریش پاش خوێندنەوەی هەستت بە گۆڕانێك کرد لە دیدو روانین و رۆحدا ئەوە مەزنی دەقەکەیە و بە نزاکانت منیش بێبەش نەکەیت. دواجار ئەوەی توانیومە خاکیانە ئەنجاممداوە وەگەرنا زۆر لەوە زیاترم خواستوە.

**موسعەب ئەدهەم**

**سلێمانی – ١ /١٢/ ٢٠١٠**

musabadham@yahoo.com
keaghanqader@yahoo.com

## مرۆڤ و ئیسلام

بابەتی قسەم مرۆڤ و ئیسلامە، ئەو بەرنامەیەی کە پێشتر بیستمان، بۆ من زۆر سەرسورهێنەر بوو. بەهۆی ئەوەی ئەگەر کەسێك نەزانێت، بەجۆرێك هەست دەکات کە کۆی ئەو بابەتانەی کەمن بۆ ئەم دانیشتنەم هەڵبژاردوون و هەروەها ئەو قسانەی کە پێشتر هاوڕێیانی فێرخواز فەرموویان، بەئاگایی و بڕیاری پێشتر بووە، لە کاتێکدا من تاکو ئەمڕۆ ئەم دۆستانەم نەبینیبوو و ئەو شیعرەی([2]) کەئێستا گوێمان لێبوو، بۆ ئەمشەو هەڵبـژێردراو بوو، گونجاوە لەگەڵ ئەو قسانەی ئەمشەو عەرزی دۆستانی دەکەم. ئەم هاوخوانی و سازگاری قسانەش هێمایەکی جوانە و نوێنەری هاوبیری و هاوباوەڕی کەسانێکە کە لە خاڵی دوور و ماوەی زۆر دوور لەیەك، بەیەك جۆر بیردەکەنەوە و تەنها یەك ڕێگەیەك و ئازارێکیان هەیە. ڕاستە کە تەکنیك دووریەکان نزیك دەکاتەوە، بەڵام بیروباوەڕی هاوبەش، دوورییەکان نزیکتر دەکاتەوە.

بابەتی مرۆڤ، بابەتێکی لە ڕادەبەدەر گرنگە. شارستانیەتی ئەمڕۆ بینای مەزهەبی خۆی لەسەر مرۆڤگەرایی"هیومانیزم" داناوە، واتە (بنەرەتی مرۆڤ) و مرۆڤ پەرستی. ئەمەش لەبەرئەوەیە کە مەزهەبەکانی رابردوو ئایینەکان، کەسێتی مرۆڤیان وردکردووەو، مرۆڤیان ناچار کردووە، تاکو ببێتە قوربانی خوداکان. مرۆڤیان ناچار دەکرد کە ئیرادەی لە بەرامبەر ئیرادەی خودادا بێ توانا بزانێت. ناچاریان دەکرد تاکو بە نزا و پاڕانەوەکان و پەیوەست بەخوداوە داوای شتێك بکات. لەم ڕووەوە هیومانیزم،

---

[2] - سەفەری پەیدابوون.

مەزهەبێکە کە لەدوای ڕێنیساسەوە لە بەرامبەر مەزهەبە خوداییەکاندا، ئەو مەزهەبانەی کە لەسەر غەیب و ئەودیو سروشت و سەروو سروشت بوونیاد نرابوون، بوونی هەبێت و ئامانجی ئەوەیە مرۆڤ بنەڕەت و بنەما بێت، ئەمەیە بەڵگەی هیومانیزم. ڕەگ و ریشەکانی مرۆڤگەرایی لە"ئەسینا"دا، بەڵام بەناونیشانی مەزهەبێکی جیهانی و بنەڕەتی شارستانی ئەمڕۆ سەرزەمینی ڕۆژئاوایە. ئەمەش کاردانەوەیەکە لە بەرامبەر مەزهەبی"سکولاستیك" و مەزهەبی مەسیحیەتی سەدەکانی ناوەڕاست. ئامانجی من ئەوەیە کە ئەمشەو تاکو ئەو جێگەیەی فرسەت هەیە و توانام هەیە بەم بابەتە بگەم و تاکو بزانم بۆ نموونە: مەزهەبی ئێمە، کە مەزهەبی ئیسلامە، سەبارەت بە مرۆڤ بەناونیشانی چۆن دیاردەیەك بیری کردۆتەوە؟

ئایا مرۆڤی بەهێمای بوونەوەرێکی بێ توانا داناوە کە ئامانج و مەبەست و ئایدیای ئەوەیە کە لە بەرامبەر خودا بێ توانا و دەستەوسان بێت؟ وە ئایا ئیسلام، مرۆڤبوون بەناونیشانی بنەڕەت و بنەمایەك وەرناگرێت؟ ئایا باوەڕداربوون بە ئیسلام، پێویست بەوە دەکات مرۆڤ بێ توانا بێت؟ یاخود بە پێچەوانەوە، باوەڕداربوون بە ئیسلام و بیروباوەڕ بەحەقیقەتی ئیسلام، خودی ئەمە جۆرێك لە بنەڕەت بەخشینە بە مرۆڤ و مرۆڤ بنەما بێت و بە بەها گەلێك رازی بووە بۆ فەزیلەتەکانی؟ ئەمە باسی ئەم شەوی من دەبێت.

بۆ ناسینی ئەوەی کە مرۆڤگەرایی لە مەزهەبەکاندا چیە، یاخود ئەوەی کە مرۆڤیان لە مەزهەبەکاندا چۆن باسکردووە و چ بەهایەکیان بۆ داناوە، تەنها ڕێگە یاخود باشترین ڕێگە ئەوەیە کە خوێندنەوە بۆ فەلسەفەی دروستبوون لەم مەزهەبانەدا بکەین. من لێرەدا فرسەتی ئەوەم نیە کە لێکۆڵینەوە لە هەموو مەزهەبەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا لە رووی فەلسەفەی دروستبوونی مرۆڤەوە بکەم، بۆیە بەناچاری لەسنورێکدا سەبارەت بەفەلسەفەی دروستبوونی مرۆڤ لە ئیسلامداو مەزهەبەکانی پێش ئیسلام کە بەدوای ئەوانیشدا ئیسلامە، وەکو مەزهەبی موسی وعیسی و ئیبراهیم شتێك باس دەکەین.

دروستبوون و بەدیهاتنی مرۆڤ لە ئیسلامدا یاخود لە قوتابخانەی ئیبراهیمدا کە ئیسلام تەواوکەری ئەو راپەڕینەیە چۆن باس کراوە وتیشکی خراوەتە سەرو (ئیسلام)یش چۆنە؟ ئایا دەکرێت پلەی مرۆڤ لەرووی چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤ لە قورئاندا، گوتەکانو فەرموودەکانی خودا، یاخود قسەکانی پێغەمبەری ئیسلام لەم رووەوە بدۆزرێتەوە؟

هەر بەوجۆرەی کە عەرزمکردن لە لێکۆڵینەوەی چۆنیەتی داستانی دروستبوونی مرۆڤ کە سومبولی مرۆڤە، لە قورئاندا دەتوانرێت لەوە تێبگەین کە مرۆڤ لەلای خوداو لە بۆچوونی ئایینەکانو لەتێڕوانینی ئایینی ئێمەدا چۆن بوونەوەرێکە. پێشەکی ئەوە عەرز دەکەم کە لەزمانی مەزهەبەکان، بەتایبەتی زمانی مەزهەبە سامیەکان کەئێمە باوەڕمان بە پێغەمبەرایەتیان هەیە، (زمانی هێما)یە، زمانی رەمزو هێما، زمانێکە کە بەهێما مانا روون دەکاتەوە، ئەمە باشترینو بەرزترین زمانێکە کە ئەمڕۆ ئادەمیزاد دەستی پێی گەیشتووە و ئەمەش لەزمانی هەواڵی واتە ئەو زمانە روونەی کە راستەوخۆ مانای شتەکان دەکات، بەهایەتی قوڵترو جاویدانی تری هەیە، زمانی راستەوخۆ و راست، واتە زمانێك کە هێماو رەمزی نیە، زمانێکە مومکینە بۆ فێرکردن سادەتر بێت بەڵام هەرماوە نیەو نامێنێتەوە بۆچی؟

لەبەرئەوەی بەگوتەی (عبدالرحمن بەدەوی) فەیلەسوفی ناسراوی هاوچەرخ: هەر قوتابخانەیەك یاخود هەرمەزهەبێك بیەوێت هەموو حەقیقەتەکان و هەموو ماناکانی قوتابخانەکەی لەووشەی راستەوخۆو یەك لایەن روون بکاتەوەو دەریانبخات – ئەم مەزهەبە– نامێنێتەوە چونکە گوێگرانی مەزهەب شێوازو جۆری جیاوازن، نەزانو زاناو توێژی جۆراو جۆری تێدایە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کەسانەی کەمەزهەبێکیان هەیە، تەنها وەچەیەك ولە کاتێکدانیە، بەڵکو وەچەی جیاوازو جۆراوجۆرن کە لە درێژای مێژووی

بەدوای یەکدادێن. ئەمانە لەڕووی بیرکردنەوە، لـەڕووی قـوڵی بـیرەوە، لـەڕووی بیـنین‌و گۆشەی رامانەوە تێڕوانینەوە لەگەڵ یەکدا جیاوازییان هەیە.

ناچـار ئـەو زمانـەی کـە دەبێـت مەزهـەب بـۆ رونکردنـەوەی مانـای قوتابخانەکـەی هەڵیبژێرێت دەبێت زمانی چەند لایەن‌و چەند بوار بێت، کە هەرلایەکی لەوەچەیەك‌و هەر بوارێکی بۆ تاقم‌و کۆمـەڵێك روون ببێتـەوە. ئەگـەر تەنهایـەك لایـەن بێـت، بـۆ کۆمـەڵێك روونە و بۆ کۆمەڵ‌و گروپەکانی دی بەهایەکی نیە. یان لە وەچەیەکدا ئەم بابەتە روونە، بەڵام لەوەچەی دووەم‌و سێیەمدا ئیـدی ناتوانرێـت ووشـەیەکی تـازەی لێ دەربهێنرێـت. هـەر لەبـەر ئەمەشـە کـە هـەموو ئـەو بەرهەمـە ئەدەبیانـەی کـە رەمـزو هێمـان، نـەمرو جاویـدانن. شـیعرەکانی"حـافیز" نـەمرن و هـەرجارێك کـەدەیان خوێنیتـەوە شـتێکی تازەیان لێ تێدەگەین و بەرادەی قوڵی هزرمان، بەپێی هاوسەنگی وزەق‌و چـێژی نیگـاو ڕوانینمان، لەقسەکانی"حافیز" شتانی نوێ دەردەهێنین‌ودەستمان دەکەوێت.

بـەڵام مێـژووی بەیهـەقی بـەم جۆرەنیـە، گولـستانی سـەعیدیش بـەم جۆرەیـە، کاتێـك گولستان دەخوێنیتەوە ماناکەی بەتەواوی لەلامان روونە. لـەڕووی لـەفزەو دەربڕینـەوە چێژ وەردەگرین، بەڵام لەڕووی مەعنەوییەوە زۆرێك لـەم مانایانـە سـڕاونەتەوە، چـونکە روونە کەچی دەڵێت و ئەوەی دەیڵێت ئێستا نەماوە. بەڵام قسەی"حافیز" چەند لایـەن ورەمزە هەریەکەمان لەهەر رەمزێکی بەپێی زەوق‌و جۆری هزری خۆی لەگەڵ مانایەکی تایبەتیدا هاوڕای دەکات و ووشەیەکی نوێ‌و دیدێکی نوێی لێ دەردەهێنێت.

لەم رووەوەیـە کەمەزهەبـەکان، لەبەرئـەوەی بـۆ چـین‌و توێـژە جیاوازەکـان ووەچـە جیاوازەکان بوون، دەبوو زمانیان رەمزو هێما بێت. زۆر مانا لـە مەزهەبـدا هەیـە کـە لـە کـاتی دەرکەوتنیـدا روون و ئاشـکرانەبووە، لەلایەکـەوە لەبەرئـەوەی مەزهـەب دەبـوو مانایەك بەمرۆڤ بڵێت‌و ئەگـەر ئـەو مانایەشـی بـەزمانی گـشتی روون نەکردایەتـەوە، بـۆ خـەڵکی ئـەو سـەردەمە ئاشـکرا نـەبوو، ئەگـەریش دەیگـوت بـۆ ئاینـدەش، مەزهـەب

مانایەکی تازەی نەدەبوو، ناچار دەبوو بەرەمز شتەکانی بوتایە تاکولە ئایندەدا ئەم رەمزانە بەپێی گونجاوی گەشەی زانستی و فیکری مرۆڤ، روون ببێتەوە ئەمەیە کە لەئەدەبیاتی ئەوروپیدا، بالاترین شێوازی ئەدەبی، شێوازی رەمزە (سیمبولە) واتە قسەکردن بەرەمزو شاردنەوەی مانای قوڵا لەژێر رەمزەکاندا کە بەرووکەش مانای دیکەیان هەیە، بەلام لەناوەوە بەپێی رادەی قوڵی مرۆڤ، دەتونێت کرۆکو ناوەڕۆکی کەشف بکات.

دروستبوونی ئادەم وداستانی دروستبوونی ئادەم، واتە داستانی دروستبوون و بەدیهێنانی مرۆڤ، بەلگە نەویستە کەدەبوو بەزمانی رەمز دەوترا تاکو ئەمڕۆ پاش چواردە سەدە و پاش پێشکەوتنی زانستە مرۆییەکان و زانستە سروشتییەکان، بۆ ئێمە لە ژینگەیەکی زانستی لەم جۆرەدا شایەنی ئەوە بێت بخوێنرێتەوە. بەلام مرۆڤ لەرووی ئیسلام و بەپێی ئیسلام چۆن دروست دەبێت؟

سەرەتا خودا بەفریشتەکان دەفەرمووێت کەمن دەمەوێت جێنشینێك بۆ خۆم لەسەر زەویدا دروست بکەم (جوان وردببنەوە کە بەهای مرۆڤ لە ئیسلامدا تاکو چ ئەندازەیەکە، تەنانەت هیۆمانیزمی ئەوروپی و هیۆمانیزمی پاش رێنسانس هەرگیز نەیتوانیوە پیرۆزییەکی لەم جۆرە بۆ مرۆڤ دابنێت). خودا کە لەڕوانینی ئیسلامدا ولەتێروانینی کەسێکدا کەئیماندارە گەورەترین و بەرزترین و بالاترینەو بەدیهێنەری مرۆڤ و زاڵو خاوەن دەسەلات بەسەر هەموو بوونەوەران لە بەرامبەر فریشتەکاندا مرۆڤ بەجێنشینی خۆی لەزەویدا دەناسێنێت. واتە پەیامی مرۆڤ لەدیدو روانینی ئیسلامدا لەگەڵ یەکەمین گوتەی خودا لەگەڵ فریشتەکاندا روون دەبێتەوە. واتە پەیامێك کەخودا لەبوونەوەراندا هەیەتی، مرۆڤ لەسەر رووی زەویدا دەبێت بەنوێنەرایەتی خودا ئەنجامی بدات. لەبەرئەوە یەکەمین فەزیلەتی مرۆڤ، نوێنەرایەتی خودایە لەسەر رووی زەویدا،

فریشتەکان هاواریان لێ بەرزدەبێتەوە کەجارێکی دی دەتەوێ لەسەر رووی زەویدا کەسێك بەدی بهێنێت کەدەست بەخوێنرشتنو تاوانو رقو تۆڵە سەندن بکات!

(چونکە پێش ئادەم، ئادەم و مرۆڤی دیکە بوونیان هەبووە کەوەکو مرۆڤەکانی ئەمرۆ خەریکی خوێن رشتنو فەسادو تاوان بوون وپاشتر فریشتەکان بەبیری دەهێننەوە لەلای خوا کە ئەگەر مرۆڤێکی نوێ دروست بکات و قۆناغێکی نوێ لەسەر رووی زەوی بۆ مرۆڤ بەدی بهێنێتەوە، جارێکی دی ئەم مرۆڤە دەست بەخوێن رشتن و تاوان دەکاتەوە)و خودای گەورەش دەفەرمووێت:

"من شتێك دەزانم کەئێوە نایزانن"و پاشان خودای گەورە دەستی بەدروستکردنی مرۆڤ کرد. لێرەوە رەمزو هێماکان دەست پێ دەکەن و سەیر بکەن لەژێر ئەم هێمایانەدا چ خاڵێکی قوڵی مرۆڤناسی شاراوەتەوە.

خودا لەسەر رووی زەوی، لەسەر رووی خاکی نەرم، دەیەوێت جێنشینێك بۆ خۆی دروست بکات. بەپێی رێسا دەبوو پیرۆزترینو بەهادارترین مادده هەڵبژێرێت، بەلام بەپێچەوانەوە ئەم کارە ناکات و لەسەر رووی زەوی نەرمترین وسوکترین مادده هەڵدەبژێرێت. لەقورئاندا لەسێ جێگادا هاتووە کە مرۆڤ لەچی دروست بووە، یەکێکیان (صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ) واتە لەخاکێکی نیشتوو و بەشێکی ووشك بووەوە[٢] لە جێگەیەکی دیکەدا دەفەرموێ مرۆڤم لە "حماء مسنون" دروستکردووە لەقوری کەنیوو بۆنناخۆش و لە جێگەیەکی دیکەدا مرۆڤم لە قوڕ "طين" بەدیهێناوە. کەواتە خودای گەورە دەستی پێکردووە و ئیرادەی کرد کە لەسەر رووی زەوی جێنشینێك بۆ خۆی دروست بکات و مرۆڤ نوێنەرو خۆشەویستی خۆی لەقوڕ یاخود گڵی ووشك بووەوە دروستکرد و پاشان لە رۆحی خۆی کردەبەری ئەم قورە وشك بووەوە و مرۆڤ بەدیهێنرا.

---

[٢] کاتێك کەلافاو دروست دەبێت یاخود رووبارێك لەرێرەوێکەوە دەگوزەرێت، بەشێکی لە تەنیشتەوە هەندێك نیشتن دروست دەبێت کاتێك ووشك بوویەوە، مرۆڤ لەم مادده دروست بووە.

لە زمانی ئادەمیزاددا، نزمترین و پەسترین سیمبولی نزمی و گەنین و سەرشۆڕی قوڕە، لە بوونەوەرە سروشتیەکاندا لە قوڕ نزمتر و خراپتر نیە و لەگەڵ ئەوشدا لەزمانی مرۆڤدا بەرزترین و بالآترین و پیرۆزترین و ڕێزلێگیراوی بوونی، ڕۆحیەتی. ئەم مرۆڤە کە نوێنەری خودایە، لەقوڕ یاخود گڵی نیشتوو دروست بووە، واتە لەنزمترین ماددەی سەر رووی زەوی و پاشان خودای گەورە نەك لەهەناسە یاخود خوێنی و نەلەشتی دیکە، بەڵکولە رۆحی خۆی کردیەبەری ئەم مرۆڤەدا، واتە بالآترین بوونێك کە مومکینە ئادەمیزاد لە زمانیدا ووشەیەك بۆ ناونانی هەبێت.

خودای گەورە بالآترین بوونە و رۆحی بەرزترین بوون شایەنی وێنا، واتە بەرزترین و بالآترین چەمکێك کە مومکینە لە هزرو مێشکی مرۆڤدا بدۆزرێتەوە. لەبەرئەوە مرۆڤ لە قوڕو رۆحی خودا دروست بووە، کەواتە مرۆڤ بوونەوەرێکی دوولایەنە، دەیەوێت ئەمە بڵێت کە مرۆڤ بوونەوەرێکی دوالیزمە، بوونەوەرێکی دووانیە (ثنائی)، بەپێچەوانەوەی هەموو بوونەوەرانی دیکە کە یەك لایەنن.

لایەنێکی حەزی بەپەستیو نزمی هەیە، سروشت و هەویری بەرەو نیشتنو مانەوەو وەستانە. هەروەك رووبار سەرکەشی دەکات و دەجوڵێتو ئەوەی کە دەمێنێتەوە، واتە خۆڵو قوڕی نیشتووە، سەرکەشی نیە، جووڵەو شەپۆلی نیەو جێگیرو وەستاوە و دەوەستێت. سروشتی مرۆڤیش حەزی لە نیشتنو وەستانو داخوازی ئاسا نیە.

لەلایەکەی دیکەوە و بوارەکەی دیکەی واتە رۆحی خودای گەورە (بەدەستەواژەی قورئان) حەزی لەبەرزبوونەوە (تعالی)یە، بەپێچەوانەی لایەنی یەکەمی حەزی لە بەرزبوونەوەو بەرەو سەرەوە رۆیشتنە تاکو تالوتکە کەشایەنی وێناکردن بێت، واتە خودا و رۆحی خودا، کەواتە مرۆڤ لەدوو دژو شتی جیاواز دروست بووە، یەکێکیان قوڕ و ئەوی تریان رۆحی خودا. گەورەیی مرۆڤ و گرنگی بەم جۆرەیە کە بوونەوەرێکە دوولایەن وماوەی نێوان دوولایەنەکەشی لە گڵو قوڕە وە تاکو رۆحی خودایە و هەر

مرۆڤێك خاوەنی دوولایەنیەكی لەم جۆرەیە. پاشان ئیرادەی ئەوە كە دەتونێت بریار بدات كە بەرەولای جەمسەری قورو گڵ ونیشتوی خۆی بڕوات یان بەرەو جەمسەری بەرزبوونەوەو خودایی‌و رۆحی خودایی، ئەم هەوڵ و كۆششە جەنگ هەمیشە لە دەوری مرۆڤدا هەیە تاكو یەكێك لەم دوو جەمسەرە بۆ چارەنووسی خۆی هەڵدەبژێرێت.

پاشان خودای گەورە ناوەكانی فێری مرۆڤ كرد (ئەمانە ئایەتی خودای گەورەن و منیش خودی ئەو ئایەتانە راڤەدەكەم) و بەڵام ئەوەی كە (ناوەكان مان فێری مرۆڤ كرد) مانای چیە؟ هێشتا دیار نیە. هەر كەسێك شتێكی وتووەو هەر راڤەكارێك تەفسیرێك، یەكێك وتویەتی رەمزەو...هتد

بەكورتی هەر كەسێك بەدەربڕینی خۆی وشێوازی دەربڕینی خۆی، مانایەكی بۆ كردووە، بەڵام گومان لەوەدانیە كەباس لە فێركردن و فێربوونە. كاتێ دروستبوونی مرۆڤ بە كۆتا گەیشت، خودای گەورە جێنشینەكەی فێری ناوەكان دەكات و مرۆڤ دەبێتە خاوەنی ناوەكان پاشان فریشتەكان هاواردەكەن كەئێمە لە(مَارِجٍ مِنْ نَارٍ) واتە لە ئاگری بێ دووكەڵ دروست بووین و ئەم مرۆڤە لەقوڕ دروست بووە، چۆن فەزیلەتی ئەو بەسەر ئێمەدا دەدەیت؟ خودای گەورە لەوەڵامدا دەفەرموێت، من شتێك دەزانم كە ئێوە نایزانن كڕنوش بۆ ئەم بوونەوەرە دوولایەنە ببەن هەموو فریشتەكانی خودا گەورەو بچوك فەرمان بەردار دەبن كە لە بەردەم بوونەوەرێكی لەم جۆرە كڕنوش بەرن.

ئەمە مانای (هیومانیزم)ە. دەكرێت گەورەیی مرۆڤ ببینرێت كەتاكو چ جێگەیەكە، تاكو ئەو جێگەیەی كە هەموو فریشتەكان بەبوونی سەرووتری نەژادی‌و پێكهاتەیان لە نوورن و ئادەم لە گڵ‌و قوڕ دەكەونە سەرخاك‌و كڕنوش دەبەن. ئەوان لەبەرخاتری ئەو رەخنەو داوایەی كەهەیان بوو تاقیان دەكاتەوە، ناوەكان لەفریشتەكان دەكات‌و ئەوان

نـایزانن، لـه کاتێکـدا کـەئادەم دەزانێـت، لـەم تاقیکردنەوەیـەدا فریـشتەکان شکـست دەخۆنوکەسـێتیو فەزیلـەتی ئـادەم دەرکـەوێتو ئـەم فەزیلەتـەش زانینـی ناوەکانـە کەفریشتەکان لەگەڵ بوونی رەگەزی باڵاترو بنەڕەتیی سەرووتر یان لە مرۆڤ، دەکەونە بەردەم پێی ئادەم. ئەمە بابەتێکە بۆ ڕۆشنکردنەوەی کەسێتی مـرۆڤ لـە ئیسلامدا. مرۆڤ شت گەلێك دەزانێت کە فریـشتەکان نـایزانن ولێرەدایەکە بـەبوونێکی سـەرووتری بەڵگەنەویـستی رەگـەزی فریـشتەکانو شـەیتان مـرۆڤ بـەرزتر دەبێـت. واتـە بنـەرەتی بوونەوەر بەزانستی ودانایيە نەك بەنەژاد.

بابەتێکی دیکە، بەدیهاتنی ژنە لەپەراسوی پیاو، بەمجۆرەی کە لـە عەرەبییـەوە بـۆ فارسـی وەرگێـڕدراوە. ئـەم ووشـەی پەراسـووە بەهەڵـە راڤـەکراوە ولـەخودی زمـانی عەرەبیو عیبریدا ئەم ووشە بـەمانای سروشـتە. "حـەوا، واتـە ژنمـان لەسروشـتی پیـاو بەدیهێنا." لەبەرئەوەی ئەم ووشەیە مانای پەراسوش دەدات، گێڕانەوەیەك پەیدابوو کە " ژنمان لەپەراسوی چەپی پیاو دروستکردو لەم رووەوەیە ژنان پەراسویەکیان کەمە"!

پیاوێکی گەورەی وەکو ""نیچە"" دەڵێت: "ژن لەبوونەوەرێك و پیاولەبوونـەوەرێکی دیکە دروست بووە و پاشتر ئەمانە لێکـچوون و بەدرێـژایی مێـژوو لەگـەڵ یەکـدا تێکـەڵ بوون". واتە ئەوەی کە ئەمانە لە بنەڕەتدا لەیەك نەژادن و تارادەیـەك هـەموو زانایـانو حەکیمەکانیش ئەگەر ژنو پیاوی لەیەك نەژاد دانابێت هەمیشە ویستویانە کە سروشـتی ژن بەسـوك سـەیر بکـەنو فەزیلـەتیش ببەخـشنە سروشـتی پیـاو، بـەلاّم قورئـان دەفـەرموێت: حـەوامان لەسروشـتی پیـاو (ئـادەم) دروسـتکرد، واتـە ژن و پیاولەیـەك هەویرو لەیەك سروشتن.

بەلاّم بابەتێکی سەرسوڕهێنەرتر لە دروستبوونی مرۆڤدا هەیـە و ئـەویش ئەوەیـە کـە خودای گەورە بانگی هەموو بـوون دەکـات، هـەموو دیـاردە سروشـتیەکان لـە بێگیـانو

رووەکو ئاژەڵ بانگ دەکات کەمن ئەمانەتێکم هەیەو هەموو ئێوە زەوی وئاسمان و کێوەکان و دەریاکان و ئاژەڵەکان پیشانی دەدەم و بۆتانی دەردەخەم. هەمووان لە وەرگرتنیدا خۆیان دووردەخەنەوەو پشت هەڵدەکەن، بەڵام مرۆڤ وەری دەگرێت. لەبەرئەوە دەردەکەوێت مرۆڤ فەزیلەتێکی دیکەی هەیەو ئەویش ئەوەیە کە ئەو ئامانەتەی خودای گەورە بۆهەموو بوونی دەرخست وەریان نەگرت، بەڵام مرۆڤ وەری گرت. واتە مرۆڤ لەسەر رووی زەوی ولەم جیهانەدا هەم نوێنەری خودایەو هەم ئەمانەتتداری (بەدەستەواژەی قورئان). ئێستا ئەم ئامانەتە ئیرادەی مرۆڤە. هەڵبژاردن و بیروباوەڕی منیش هەر ئەمەیە.

تەنها فەزیلەتێك کە مرۆڤ بەسەر هەموو بوونەوەرانی جیهاندا هەیەتی، بریتیە لە ئیرادەی، واتە تەنها بوونەوەرێکە کە دەتوانێت پێچەوانەی تەنانەت سروشتی غەریزەی کردار ئەنجام بدات. لە کاتێکدا هیچ ئاژەڵێکو گیایەك بەپێچەوانەی پێکهاتەی سروشتی خۆی ناتوانێت کردارەکان ئەنجام بدات. هەرگیز ناتوانن ئاژەڵێك ببینن کە بۆ نموونە رۆژوو بگرێت. هیچ گیایەك نەبینراوە کە لەداخ و رەقدا خۆی کوشتبێتەوە، یاخود خزمەتێکی گەورەی ئەنجام دابێت. یان خیانەتێکی کردبێت. واتە توانای ئەوەی نیە شتێك بەو جۆرەی کەدروستکراوە کرداریش ئەنجام بدات.

تەنها مرۆڤە کە دەتوانێت تەنانەت بەپێچەوانەی ئەو شێوازو رێگەیەی کەدروست کراوە تەنانەت بەپێچەوانەی نیازو پێویستیە مەعنەوییەکان یان نیازە ماددیەکان راپەرێتو بجوڵێتەوە. دەتوانێت بەپێچەوانەی چاکەو خێرەوە رێگەکەی بکات. دەتوانێت بەپێی عەقڵی خۆی کار ئەنجام بدات. دەتوانێت پێچەوانەی عەقڵی خودی خۆیشی کردار جێبەجێ بکات. ئازادە کەچاك بێت یان خراپ. دەتوانێت قوراوی بێت یان خودایی. واتە ئیرادە گەورەترین تایبەتمەندی مرۆڤە و لەبەرئەوە نزیکی مرۆڤ و خودا لێرەدا دەردەکەوێت.

مەگەر ئەوە نیە کە خودا لەرۆحی خۆی کردە بەری مرۆڤەوەو کردیە ئەمانەتداری خۆی؟ کەواتە مرۆڤ لەسەر رووی زەویدا جێنشین ونزیکی خودایە و رۆحی خوداو مرۆڤ لەیەك فەزیلەت تێر دەبێت و ئەوەش هەبوونی ئیرادەیە. واتە خودا کەتەنها کەسێك و تەنها بوونەوەرێکە کە لەجیهاندا ئیرادەی رەهای هەیەو دەتوانێت هەر کارێك کە بیەوێت ئەنجامی بدات، تەنانەت بەپێچەوانەی رێسا و یاساولەرۆحی خۆی کردووە بەبەری مرۆڤدا، مرۆڤ دەتوانێت وەك ئەو کار بکات، هاوشێوەی خودا، بەلام نەك بەئەندازەی ئەو، تەنها لەرووی لێکچوونەوە دەتوانێت وەکو ئەو هەرجۆرێك کە بیەوێت، بەپێچەوانەی یاساو سروشتی فیسیۆلۆژی خۆی کردار ئەنجام بدات. لەبەرئەوە رووی هاوبەش یاخود نزیکی مرۆڤ و خودا هەر ئەم ئیختیارەیە. هەر ئەم ئازادیەیە بۆ چاك بوون یان خراپ بوون، سەرکەشیکردن یاخود گوێڕایەڵی، لەبەرئەوەی ئەوەی کە لەم سروشتو فەلسەفەی دروستبوونەوە دەردەکەوێت ئەوەیەکە:—

یەکەم: هەموو مرۆڤەکان لەگەڵ یەك، نەك بەرامبەر بەڵکو بران وجیاوازی نێوان بەرامبەری و یەکسانی و برایەتی بەتەواوی روونە، بەرامبەری زاراوەیەکی مافە، لە کاتێکدا کە برایەتی، راگەیاندنی سروشتی یەك جۆری هەموو مرۆڤەکانە لەگەڵ یەکدا، کە هەموو مرۆڤەکان بەهەموو رەنگەکان لەیەك شوێنەوە سەرچاوەیان گرتووە.

دووەم: یەکسانی ژن و پیاوە. واتە پێچەوانەی هەموو فەلسەفەکانی کۆن و شێوازی بیرکردنەوەی دێرین کە ژن و پیاو لەیەك سروشتو پێکهاتەو هەوێرن و لەیەك شوێن و بەدەستی تەنها کەسێك دروستکراون. لەبەرئەوە لە هەرلایەکەوە لەگەڵ یەك هاو پێکهاتەو هاوشێوەو سروشتنو لەیەك نەژادن، یەکسانو خوشكو بران، واتە لەباوكو دایکێك یاخود لەشوێنێکەوە سەرچاوەیان گرتووە.

سێیەم: فەزیلەتی مرۆڤ بەسەر فریشتەکانو هەموو جیهاندا فەزیلەتێکی زانستیە.

لەبەرئەوەی ناوەکان فێربوون، هەموو فریشتەکان کڕنوشیان بۆ بردوونو فریشتەکان بەزانیاری بنەڕەتی نەژادو گەورەیی سەرووتری سروشتی خۆیان دەبێت کڕنوشی بۆبەرن. لە هەموو شتێك گرنگتر، مرۆڤ لە نێوان قورو خودادایە و لەبەرئەوەی خاوەنی ئیرادەیە، دەتوانێت جەمسەری خاکی یان جەمسەری خودایی هەڵبژێرێت.

لەبەرئەوەی خاوەنی ئیرادەیە، بەرپرسیاریەتی دێتەبوون کە هەڵبژاردن و ئازادی ئەم بەرپرسیاریەتە پێویست دەکەن. لەبەرئەوە لە بۆچوونی ئیسلامدا، مرۆڤ تەنها بوونەوەرێکە کە بەرپرسیاری چارەنووسی خۆیەتی، نەك تەنها بەرپرسیاری چارەنووسی خۆی، بەڵکو بەرپرسیاری ئەنجامدانی پەیامی خودایی لە جیهانی و ئەمانەتتدار لە جیهان و سروشت. ئەوەکە ناوەکان فێربووەو باشترین مانا بۆ ناوەکان، بە بۆچوونی من بریتیە لە راستی جۆراو جۆری زانستی، چونکە ناو هێماو رەمزی هەر شتێکە، واتە رووی دیاریکراوی هەر چەمکێك. لەبەرئەوە فێربوونی ناوەکان لەخوداوە، واتە دەرکو تێگەیشتنی راستی زانستی کە لەجیهاندا بوونیان هەیە. ئامادەگی تێگەیشتنی هەموو ئەو مانایانەی لەجیهاندا هەن.

لەبەرئەوە مرۆڤ لەگەڵ یەکەمین فێربوونێك کە لە خودای وەرگرت، دەتوانێت دەستی بە هەموو ئەو راستیانە بکات کە لە جیهاندا هەن و ئەمەش خودی بەرپرسیاریەتیو گەورەترین بەرپرسیاریەتیە. چارەنووسی مرۆڤ دەبێت بەدەستی خۆی دروست ببێت، هەم کۆمەڵگەی مرۆیی بەرپرسیاری چارەنووسی خۆی دەبێت، هەم تاکی مرۆڤیش بەرپرسیاری چارەنووسی خودی خۆی. (لَهَا مَا كَسَبَتْ ولكُمْ مَا كَسَبْتُمْ) ﴿سورە البقرە﴾. چارەنووسی شارستانیەتەکان رابردوو هەمان ئەو چارەنووسە بووە کە خۆیان بەدەستیان هێناوە و چارەنووسی ئێوەش هەمان ئەو شتە دەبێت کەخۆتان

بەدەستەکانی خۆتان دروستی دەکەن. لەبەرئەوە مرۆڤ بەرپرسیاریەتیەکی گەورەی لە بەرامبەر خودا لەئەستۆدایە، چونکە خاوەنی ئیرادەو هەڵبژاردنە.

لەبەرئەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مرۆڤ، ئەمانەتداری خودا، نزیکی خودا لەسەر رووی زەوی و خاوەنی دوولایەنە، یەکێکیان نزمی و پەستی. (حمأ مسنون) یاخود قوڕی بۆنکراو، ئەو دیکەیان. رۆشتن و جوڵان بەرەولای خودا.

لێرەدا دەبێت ئاماژە بەبابەتێك بکەم و ئەوەش ئەوەیە کە بەداخەوە مێژوو شاهیدی تراژیدیایەکی گەورەو ئەویش بریتیە لەوەی کە مرۆڤ بەم شێوەیە دوولایەن نەناسراوە. بەپێچەوانەی ئایینەکانی دیکە کە(الله) و (شەیتان) لە سروشتدا بوونیان هەیەو لەگەڵ یەکدا شەڕ دەکەن، لە ئیسلامدا هێزێك لەسروشتدا بوونی هەیەو ئەو هێزەیش (الله)یە.
بەلآم لەدەروونی مرۆڤدا شەیتان لەگەڵ (الله)دا دەجەنگێت و مرۆڤ مەیدانی ئەم دووانەیە. لەبەرئەوە ئەو دوالیزمەیەی کە لە ئیسلامدا بوونی هەیە، بەپێچەوانەی مەزهەبەکانی رابردوو، دووانەپەرستی و دوو خودایی لەناخ و دەروونی سروشتی خودی مرۆڤدایە، نەك لەسروشتدا.
سروشت یەك شت و تاکە و تەنها لەقەڵەمڕەوی‌و ئیرادەی یەکێکدایەو ئەویش خودایە. ئەمەیکە شەیتان لە ئیسلامدا، لە بەرامبەر خودا نیە، بەڵکو لە بەرامبەر مرۆڤدایە، لە بەرامبەر ئەو نیوە خوداییەی مرۆڤ وە لەبەرئەوەی کە مرۆڤ بوونەوەرێکی دوولایەنە و پێکهاتەیەکە لەخاك و خودا، لەبەرئەوە نیازمەندی خاك و پێویستی بەخودایە. مەزهەب و ئایدۆلۆژیا یاخود ژیانێك کە دەبێت بوونیادی بنێت و باوەڕی پێی هەبێت، دەبێت مەزهەب و ژیانێك وشارستانیەتێك بێت کەنیازو پێداویستی هەردوولایەنەکە بەدی بهێنێت‌و چاوی لەهەردووکیاندا بێت. تراژیدیا ئەوەیە کە بەداخەوە مێژوو بەم جۆرە

باس ناكات وناگێڕێتەوە: مێژوو دەڵێت هەموو كۆمەڵگەكان یاخود بەرەولای دوارۆژگەرایی‌و زوهدگەرایی رۆیشتوون یاخود بەرەو خاكگەرایی‌و دونیاگەرایی.

هەموو شارستانیەتەكان بەم جۆرە بوون. شارستانیەتی چین سەرەتا دونیاگەرابوو، بنەڕەت بەخشین بەچێژەكان‌و جوانیەكان و هەوڵدان بۆ بەشداربوونی هەرچی زیاتری بەخششە سروشتیەكان كە نموونەشی ژیانی كەسەباڵاكانی چین بوو، "لائوتسو" هات و مەزهەبێكی هێنا كەدوارۆژ گەرابوو، واتە پەیوەستی و حەزێكی توند بەو نیوە نامادی‌و مەعنەوییەی مرۆڤ. پاشان چینیەكان تارادەیەك بەرەو ئەو دیوەو نیوە مەعنەویە رۆیشتن و ئەو كەسانەی كە بەتەواوی سووربوون لەسەر بێبەش نەبوون لەچێژەكانی دونیا، بوونە راهیب و عاریف وسۆفی. پاشان "كنفۆشیوس" هات و كۆمەڵگەی بەرەولای دونیاگەرایی راكێشا و چینیەكانی بەرەولای چێژەكانی ژیان هاندا وچین دووبارە لەورووەوە لایدا. هیند سەرزەمینی ئەفسانەكانی هەزارویەك شەوە، لەگەڵ مەزهەبی "ڤیدای مهاڤیرا" و"بوزا" بەرەو دوارۆژگەرایی رۆیشت و بەرەو رووی زوهدو گۆشەگیری‌و سۆفیگەری پاككردنەوەی دەروون ملی نا، هەر لەبەر ئەمەشە كە سەرزەمینی هیندییەكان ئێستا بەسەر زەوی سۆفیەكان و لەسەر مێخ خەوتن‌و بەتەنها خورمایەك‌و یەك دانە بادەم چل رۆژ رۆژوو گرتن و چلە كێشانی تێدایە و پاشتر كەوتن لە شارستانیەت‌و لە ژیان.

لە ئەورووپادا رۆم بەرەولای تاوان‌و خوێن رشتن‌و دەسەڵاتی سروشتی، سیاسی‌و یاسایی بەسەر جیهان‌و كۆكردنەوەو هەڵگرتنی هەموو سەروەت‌و سامانی ئاسیاو ئەورووپا رۆیشت‌و لەخۆشگوزەرانی وچێژەكان و یارییەكان‌و، گلادیۆتۆری یاری و نموونەی ئەمانە نوقم بوو، پاشان مەسیح هات و كۆمەڵگەی بەرەو دوارۆژگەرایی برد و پاشان رۆم لەچێژو دونیاگەرایی بەرەو گۆشەگیری و دوارۆژگەرایی رۆیشت تاكو ئەو جێگەیەی كە دۆخی سەدەكانی ناوەراستی دروستكرد، سەرزەمینی شەڕو و خوێنڕشتن

دەسەڵاتو زاڵ بوونی یاسای، بوویە سەرزەوی سومعەو پەرستگاو دەیرو گۆشەگیری لەسەدەکانی ناوەراستدا بەجۆرێك لایدا کە ناچار رێنسانس هات و ئەورووپای بەرەو دونیاگەرایی بردو جارێکی دی ئەمرۆ دەبینین شارستانیەتی ئەورووپا بەرادەیەك بوویە دونیاگەراو بەرادەیەك مرۆڤ و مرۆڤبوونی بەچێژو ژیان و خۆشتر ژیان سنوردار کردووە کە بەگوتەی پرۆفیسۆر (شاندل) دونیای ئەمرۆ هەموو ژیانی وەستاندووە تاکو ئامێری ژیان دروست بکات، ئەم شێتیە فەلسەفەی مرۆڤی ئەمرۆیە ئەم مانایەی تەکنیك بێ ئامانجە، مانای شارستانیەت بەبێ ئایدیایە. ئەمرۆ مرۆڤایەتی بەجۆرێك نوقم بووە ولای داوە کەپێویستی بەمەسیحێکی ترە.

بەڵام بەوجۆرەی کە لە فەلسەفەی مرۆڤ لە ئیسلامدا دەردەکەوێت لێی دەردەهێنرێت، مرۆڤ بوونەوەرێکە دوولایەن، دەبێت مەزهەبێکی هەبێت کەدوولایەن بێت کە بەشێوەیەکی بەردەوام لەدوولایەنی دژیەکدا، هێز بخاتە سەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و رۆحی مرۆڤ تاکو مرۆڤ هەمیشە بەشێوەیەکی هاوسەنگ بمێنێتەوە و ئەم مەزهەبەش ئیسلامە، بەچ بەڵگەیەك بۆ ناسینی هەر مەزهەبێك دەبێت خودای، کتێبی، پێغەمبەری و باشترین پەروەردەکاری ببینرێتو بناسرێت.

یەکەم: خودا، خودایەکە کەدوولایەن، دوو رووخسار، هەم روخساری"یەهود" خودای یەهود، کە کۆمەڵگە گەراو دونیاگەراو زبرو سیاسیو (شَدِيدُ الْعِقَابِ)و توندی، هەبێت و هەم وەکو خودای مەسیح، بەبەزەیی (رَحِيمِ و رَحْمَنِ)ە بێت و ئەمەش هەموو ئەو سیفەتانەیە کە لە قورئانەوە بۆ (الله) دەردەهێنرێن.

کتێب: قورئان کتێبێکە وەکو تەورات کە بریار و حوکمی کۆمەڵایەتی، سیاسی یاسایی و تەنانەت دەستورو رێسای شەرکردنو دیلگرتنو دیل ئازاردکردنی تێدایەو حەز بەژیان و حەز بەدروستکردن و ئاوەدانکردنەوەو خەبات لەگەڵ دوژمنو هۆکار گرتنەبەر

و هـەم کتێبێکـە کـە داوای پاککردنـەوەی دەروونو پارێزگـاری ڕۆحو ئـەخلاقی بـاڵا دەکاتو ئەمانەی تێدایە.

پێغەمبەری ئیسلام: جارێکی دی مرۆڤێك خاوەنی دوو ڕوخساری پێچەوانە ئـامێز _بەوجۆرەی کە لەمێژوودا کەسێتیەکان دەبینین_ بوونی هەیە کە لە ڕۆحێکدا کۆبووەتەوە. هەم پیاوێکە کە هەمیشە بەهەوڵو کۆششو خەباتی سیاسی لەگەڵ دوژمنو هۆکاری تێکدەری کۆمەڵگەیە و هەمیشە بەدوای دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی نوێو شارستانیەتێکی نوێ لەدونیای خۆی بێت و ڕێنمونی ئادەمیزاد بەئامانجێکی تایبەتو هەم پیاوی نوێژ و لەخواترسان و پارێزگارییە.

پاشان ئەوانەی کەپەروەردەی کردوون "عەلی و ئەبوزەڕ و سەلمان" ئەمانە تەنها مرۆڤە دوولایەنەکانی جیهانن، واتە ئەو مرۆڤانەی کە هەم پیاوی سیاسەتو هەم پیاوی خەبات بۆ باشتر ژیان– بەوجۆرەی کەدەبینین هەمیشە لەمەیدانی هەوڵ و کۆشش ولەمەیدانی فێرکردن و باسی زانستی ولێکۆڵینەوەن و هەمیش پیاوی لەخواترسانو پاکداوێنیو هەروەك ڕاهیبەکانو عاریفانی گەورەی ڕۆژهەڵات. ئەبوزەر پیاوی سیاسەتە و پیاوی خەبات لەبەر خاتری هەژاری و پیاوی لە خواترسانو زانست. ئەمڕۆ بەو لێکۆڵینەوانەی کە لە "ئەبوزەر" کراون سەبارەت بەناسینی خودا، ئەو یەکێك لە باشترین نموونەکان و کلیلەکانە بۆ ناسینی قورئان. سەیری هەموو سەحابیەکانی پێغەمبەر (د.خ) بکەن، هەموویان پیاوی شمشێرو پیاوی باشتر ژیان و باشتر دروستکردنی کۆمەڵگەن و پیاوی عەدالەتو جێگیرکردنی عەدالەتو پیاوی گەورە بیرکردنەوەو باشتر هەستکردنن.

ئەو ئەنجامەی دەمەوێت پێی بگەم ئەوەیەکە: لە ئیسلامدا مرۆڤ لە بەرامبەر خوادا زەلیلو سەرشۆڕ نابێت، چونکە ئەو هاوکاری خودایە ودۆستو ئەمانەتدارو نزیك ئەوە

## ✦ مرۆڤ

لەسەر زەویدا، خودا فێری کردووە و هەموو فریشتەکان کڕنوشیان بۆ بردووەو مرۆڤێکی دوولایەنە لەگەڵ بەرپرسیاریەتیەکی لەم جۆرە ئایینێکی پێویستە کە بەرەو دواڕۆژگەرایییەکی تەواو یان بەرەو دونیاگەرایییەکی ڕەهایی لانەدات و نەبات و هەمیشە حاڵەتی هاوسەنگی بپارێزێت. واتە ئایینێکی دوولایەنی پێویستە تاکو بەرپرسیاریەتی گەورەی مرۆڤ بهێنێتەدی.

# ئـــازادی

دیارترین تایبەتمەندی مرۆڤ خود ئاگاییە، ژیان و جوڵە و بزاوتی تـەنها شـوێنکەوتەی کوێرانەو جەبری هۆکارو رێساو یاسای ژیانزانی (بایۆلۆژی) و غەریزە سروشتیەکانی نیە کە لە پێکهاتەی بوونیدا هەن و تێکەڵ بە فیترەتی بوون.

لـەرێ گـوزەری تەواوکاریـدا بـەو رادەیـەی کـە "ئاگـایی" مـرۆڤ گەشـەدەکات، هێـزی"هەڵبـژاردن، بـەکارهێنان و داهێنـان و دروسـتکردنی" تێـدا بـەهێز دەبێـت و لـە ئەنجامدا بەسەر ئەوهێزانەی سروشت کە فەرمانڕەوایی بەسەردادەکەن وە ئەو هێزانـەی فیترەت کە دروستی دەکەن، زاڵ دەبێت و ئەم (زاڵبـوون)ە، کـە لـە لایـەنی تـەواوکاری بوونی رووندەکاتەوە و دەریدەخات ناوی"مرۆڤ بوون"ە.

لەبەرئەوە مرۆڤ — بە پێچەوانەی مانا زاراوەییەکەی لە زانستدا کە هـەربێ قـۆچ ودەم لێوو روخسارێك و دەست وپێیەك کە مووی نەبێت و راست و رێك بڕوات بە رێگادا ئـەوە مرۆڤە _ بەڵکو بە ئادەمیزادێك دەوترێـت کـە "ئاگـایی" تێیـدا "ئـیرادە"یـەکی لـەناودا دروستکردووە کە "ئازادی"پێدەبەخشێت و ئازادی واتە توانای سەرپێچی لەو جـەبرەی فەرمانڕەوا و ڕاکردن لە زنجیری هۆکار کـە جیهـان و گیـان دروسـت دەکـات و دەیخاتـە جووڵە و بەرەو یاساو رێسای دەبات و بەڕێوەی دەبات.

ئەمە بەم جۆرەیە کـە لـەم زنجـیرەی هـۆ و هۆکـارەدا کـە سروشـت، ژیـان، مێـژوو، کۆمەڵگـەی شـوێنکەوتەی ئـەون. هـەروەها فیزیـا، زینـدەوەزانی، زانـستی مێـژوو، کۆمەڵناسی قسەی لە بارەوە دەکەن، هێزێك دروست دەبێت کە خـودی هێزەکـە وەکـو هۆکارێـك کـار دەکـات و رێـڕەوی جـەبری دەسـت درێـژ دەکـات و بـەو رادەیـەی کـە

تەواوکاری و بەرەو کامڵ بوون دەچێت، گەشەدەکات، بەدڵی خۆی گۆڕان لە سروشت، مێژوو، کۆمەڵگەو خۆی دەست پێدەکات و ئەم دروستکراوە "مخلوق"ە دەبێتە بەدیهێنەر"خالق" و بەسەر ئەو قەدەرەی کەدروست بووی ماددی بۆی دروستکردووە، شەرکەش دەکات، خود، دروستکەری سروشت و بەرپرسیاری چارەنووسی خۆی دەبێت و "سەرکەشی مرۆڤ بەسەر خوایدا" کە بەشکانی دیواری"ڕێگری وقەدەغە" دەستی پێکردو پاشان بە"نیشتنەوە لە زەوی" و ڕەهایی لە جەبری سروشتی و تەرککردنی"ژیانی پێش دروستبوونی غەریزە"و "بەهەشتی بێ ئازاری و بێ بەرپرسیاریەتی" وازی لێهێنرا بۆ خۆی تاکو تەقدیری خۆی لە جووڵەی مێژوو بەدەستی خۆی دروست بکات و لەگەڵ ئەوەشدا خودا لە جیهانی ئەودا ولە سروشتدا خودایی بکات و بەدەستەواژەی قورئان، لە زەویدا ببێتە جێنشینی خودا.

بێگومان هەر قوتابخانەیەك یاخود هەر مەزهەبێك ئینکاری ئەم هێزەی مرۆڤ بکات، هەم شتێکی نەزانانەیە، هەرچەندە زانایانە ئەم کارە بکات، چونکە واقیعیەتی دیاری مرۆڤ و ڕۆڵی لە سروشت و مێژوو شارستانیەت و فەرهەنگ و ژیانی بەهەند وەرنەگرتووە و ئەوەی کە بەڵگەنەویست و هەستپێکراوە، لەبەرئەوەی لەتەسکی جیهانبینی مرۆڤدا ناگونجێت و بە بڕیاری پێشینەی هزری لۆژیك پێکهاتەی نایەتەوە کە ئەمەش نەفی دەکات و هەم مرۆڤ لە مرۆڤبوونی خاڵی دەکاتەوە، چونکە "ئیرادە"ی لێدەستێنێتەوە لە ئەنجامدا قسەکردن لە "بەرپرسیاریەتی" سەبارەت بە مرۆڤ، لە بنەڕەتدا بێ جێ و بێمانا دەبێت و لەبەرئەوە "بەرپرسیاریەتی" لە مرۆڤ وەربگرینەوە، هەموو "بەهاکان"ی ئەومان تێك شکاندووە.

جەبری"ویستی ئیلاهی" یاخود "ویستی نەژادی و ژینگەیی یان ویستی مێژوویی (مێژووگەرایی) یا کۆمەلآیەتی (سۆسیۆلۆژی) و یان ویستی ئامێری...چ جیاوازیەکی هەیە؟ جەبرە و جەبری نەرێی" ویستی مرۆییە" واتە، نەفیکردنی مرۆڤ و پاشان نەفیکردنی"ئازادی" و وەرگرتنی"بەرپرسیاریەتی"پاش ئەوەش جارێکی دی لە "گوێڕایەڵی"و یان "پەیماندان"ی مرۆڤ، قسەکردن و مانای"بانگهێشتکردن"و ئیمان و

بەهاو کرداروو هەڵبژاردن و خێرو شەڕ وپاداشت و تاوان و خزمەت و خیانەت..سەلماندن لە ژیانیدا، ئاراستەکردنی سۆفیستاییەیانە تەنها دەستەواژەی ئەدەبی و جۆرێك ووتارە. بەو جۆرەی کە "جەبری"یەکان دەبینن کاتێك کە قسە لەسەر پەیامی پێغەمبەران دەکەن، "مارکس"یەکان کە رۆڵی"جێبەجێکار" لەمێژووی مرۆڤدا راڤە دەکەن.

مرۆڤ بە ئاگایی دێتە دی و باڵاترین جیلوەی ئەوەش "خودئاگایی"یە خودئاگایی نەبە رێککەوتێك دەست دەکەوێت و نەبەبڕیاری پێشینە و نەلەرێگەی ئیلهامی غەیبییەوە یاخود هەستی دڵ و دەروونی دەست دەکەوێت. لەپەیوەندی لەگەڵ ئەوی ترە (lautrui)ە کە مرۆڤ بە من (le moi) دەگات بەناسین و هەستی"ئەو"ی ترە کە"خۆی" کەشف دەکات ([4])

ئەمە روونترین و خێراترین پەیوەندی دیالکتیکیە کە لە تەواوی لایەنەکانی بوونی مرۆڤدا راستە. دەڵێن : (کەسێك زمانی خۆی تێدەگات کە زمانێکی بێگانە بزانێت) کەسێك لە کۆمەڵگەی خۆی پێی نەخستۆتە دەرەوە و کەسێکی دی نەناسیوە ژینگەو مەزهەب و فەرهەنگ و نەژادو ئەخلاق و ئەدەب و هونەرو فەلسەفە و مێژووی ئەوی تری نەبینیوە و نەخوێندۆتەوە و تێنەگەیشتووەو زیندانی ژینگەو سنوری خۆی بووە، بێگومان لەگەڵ خۆی و لەگەڵ هەموو ئەوەی لە نێویدایەو ئەوەی کە خودی خۆیەتی بێگانەیە.

"خودئاگایی" مرۆڤ، کاتێك دەگاتە ترۆپك و خۆی لە تەواوترین "حاڵەتی بوونی"دا هەست دەکات کە خەریکی (تێڕامان و وردبوونەوە بێت لە جیهانی بووندا).

---

[4] - ﴿یاایها الناس انا خلقناکم من ذکر و انثی و جعلناکم شعوبا و قبائل لتعارفوا ان اکرمکم عندالله اتقاکم.﴾ ( بە روونی دەبینین بۆ ناسینی یەکتر" چەندین میللەت و خێڵی جیاوازی بەدیهێناوە.) "

خودئاگایی، نایتەدی مەگەر ئەوەی کە مرۆڤ سەبارەت بە "باروبۆخی خۆی" وەکو مرۆڤێك بە ئاگا بێت و هەستی پێبکات و تەنها لە پەیوەندی لەگەڵ جیهاندایە کە دەتوانێت بەروونی و بە ووردی و تەواوی تێبگات و پەی بەوە ببات کە لە "کوێ"دایە و لە ئەنجامدا پەی بەخۆی ببات و تێبگات کە "کێ"یە؟

مرۆڤ هەرکات لە ووتن و ووتەکانی ژیان، گیرۆدەیی کۆمەڵایەتی، هەڵچوون و داچوونی ژیانی رۆژانە، سنورداری کاتی وشوێنی ژینگەی دەورو بەر، هەوڵ و نیازو چێژو ئازارو حەسوودی و هەوەس و دەسەڵات و ناوبانگ و سەروەت و سامان و پلەوپایەی لاوەکی و کاتی و گۆڕاو وخۆشەویستی و تورەییەکان و پەیوەندییەکان و سەنگەرەکان و لایەنگریەکان و ئومێدەکان و ئارەزووەکان و هەموو ئەو شتانەی کە پێیانەوە خەریکەو ئەو ودوودڵیانەی کە ناوییان ژیانە و سەرگەرم و بێئاگایان کردووە، ساتێك وکاتێك خاڵی دەبێتەوە، بەلێدانێکی لەناکاو کە لە هەست یان ئەندێشەی دەدات، لەژێر ئەم شتانەدا سەربەرزدەکاتەوەو کاتژمێرێك و ماوەیەك دەواری ژیان بۆی دەوەستێت.

دەڵێی هەموو شتێك لە جووڵە دەوەستێت، کات دەوەستێت و دەستی غەیب بەئاگای دەکاتەوە و جووڵەی پێدەدات و هێزێکی دیار لەسەری دەدات و هاوارێکی بێدەنگ دێتە دەرەوە کە:

"ئەی تۆ!

بوون ! ئەم جیهانە، ژیان، تەمەن، مەرگ..."

کام مرۆڤی بیرمەند هەیە کە بتوانێت چاودێری خۆی لە چنگی بەهێزی و زبری ئەم وشانە نەهێڵێت ؟ لە بەرامبەر لێدانەکانی ئەمانەدا، خۆی رابگرێت، بۆ نەبیستنی ژاوەژاوی درێژو دووبارەی ئەم تەپلانە لۆکە بخاتە گوێیەکانیەوە و بۆ نەبینینی ئەم نووره زەقانە کە هەروەك نەیزەکەکان لە ئاسمانی ویژداندا دەکشێن، خۆی بهێنێتەوەیەك و خۆی بەجەنجاڵیەکانی رۆژانە بسپێرێت و بەئەفیونی و ووڕژێنەرو تورەیی و ڕق وچێژ و جوانی و هەوڵ ودەرگیری و ناتەواوی و تامو چێژو دوودڵی بەناوبانگ و پێشکەوتن و دەسەڵات وسەرکەوتن و خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی...

هەموو ئەوەی هەموومان گەرد گەرد دەجوێت و کێشمان دەکات و دەگەنین و پاشان دەمان مرێنێت و هەریەکەیان وەکو پارچەیەك بەرەو مەرگ دەمانبەن، کەناوی ژیانەو سرپکات.

هەرگیز! ناتوانرێت مرۆڤ بە "بیرمەند"بزانرێت، بەڵام" ئاگایی" لێ قەدەغە بکرێت و رێگری لێ بکرێت، بە ئاگا و هۆشیار بژمێردرێت خەریك بوون بەوەی کە لە "خودئاگایی"ی ئەوەوە دروست دەبێت، هەڵەی تێدا بکرێت. مرۆڤ هەروەك کەمێك لە وردە کرم ناچێت و ناژی گەر بە گوتەی"ئەندەر ژیدە" لە چاڵێکدا دەخولێتەوەو بەشەوق و زەوقە و خێراییەکی ماندوونەبووەوە دەسورێنەوەو سەما دەکەن و لە چالاکی و چێژی لە رادەبەدەردێن ودەچن.

بێئاگایی رۆشنبیر لەم حەقیقەتە، بۆ مرۆڤ نەزانینێکی ترسناك ئامێزەکە مرۆڤ تەنها ئاژەڵێکی پێشکەوتوو نیە. ژیانی مرۆڤ، تەنها بەشارستانیەت بەمانای ئاڵۆزی و پێشکەوتن لە شێوەو مەرج و هۆکاری ژیان و زاڵبوون و دەسەڵات بەسەر سروشت و هەرجی بەشداربوونی زیاتر نیە.

بەڵکو مرۆڤ، لەرێڕەوی تەواوکاری جۆری بوونێکە کە لە رووی چۆنیەتی و ناوەرۆکی بوونی لەگەڵ ئاژەڵدا ماوەو نێوانی هەیە. ئەوەی کە مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە، جیاوازی پلە نیە، پێشکەوتن نیە، لایەنێکی نوێ و تایبەتمەندیەکی خودی و بوونیە. مرۆڤبوون، لە بنەڕەتدا (نەشئەیەکی دیکە)یە. تایبەتمەندی و جیاکەرەوەی لە بەرامبەر ئاژەڵدا، نەك "تەواوکاری" بەڵکو"ئاگایی" یە. جیاکەرەوەی لە بەرامبەر ئاژەڵدا "نەك شارستانیەت" بەڵکو "خود ئاگاییە" یە. "باسکاڵ" دەڵێت: مرۆڤ کۆی دوو ناکۆتایە، ناکۆتایەکی بچوك و لە هەمانکاتدا ناکۆتایەکی گەورە، شتێکی لاواز دەتوانێت لەناوی بەرێت، ئەگەر هەموو جیهان خۆی ببەستێت بۆ کوشتنی، ئەوە لەوانیش بەرێزترە، چونکە تێدەگات کە دەکوژرێت و کوژەری کێیە، بەڵام جیهان بێئاگایە لەو کارەی کە دەیکات.

ئەوەی کە من لە مرۆڤدا پشت بە ئاگایی و خود ئاگایی دەبەستم، نەك پێشکەوتن و شارستانیەت ئەوە تەنها تیۆرێکی فەلسەفی یان خاڵێکی زانستە نیە، هەڵبژاردنی ئەم یاخود ئەو پەناگەیە چارەنووسی جۆری و دەرخەری بوون مرۆڤ دیاری دەکات، مرۆڤ بەناونیشانی (توانای) قسەکردن یاخود بەناونیشانی (فەزیلەت) بەها دەربرینە.

لە یەکەمین تێڕوانینی فەلسەفەی مرۆڤناسی، چەمکی ژیان، مانای فەرهەنگی ڕێڕەوی مێژوو و بەرپرسیاریەتی ڕێبەری و ئامانجی فیکری و پەیمانی زانستی ولایەنی تەواوکاری مرۆڤ، پەناگەیەکی هاوبەشی هەیە و ئەویش (توانایی)یە. مەبەستێکیشی هەیە کە ئەویش (بەشداربوون)ە، بەڵام لە دووەمین پەناگەدا بریتیە لە (لە خواترسان و پارێزگاری) و ئامانج و سەرکەوتن و سەربەرزی. دەبێت هۆشیاری و بنەرەتی و زۆربوونی مرۆڤ هەبێت تاکو قوڵایی و پان و بەرینی ئەو مانایەی کە لەم دوو زاراوەیەدا شاردراونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا تەمبەڵی و دواکەوتوویی کە لە فەرهەنگی دواکەوتوویی ئێمەدا هەیە، دۆزییەوە و دەریهێنا.

ئەوەی کە مرۆڤی ئەمرۆی لە ترۆپکی زانستدا بەرەو گومڕایی بردووە و ئەمرۆی لەوپەری پێشکەوتندا بە بن بەست گەیاندووە، هۆکاری ئەوەیە لەبەر خاتری هەڵبژاردنی ئەو دیدگایە و بەو دیدەوە خەریك دەبێت.

کۆتا شانامەیەك کە ئەمرۆ شاهێد و بینەری ئەوین، بەرهەمی حەماسەتێکی شومە کە "بیکن" بۆ زانستی نوێ لەشەڕدا لەگەڵ مەزهەب خوێندییەوە ئەویش بریتیی بوولەوەی کە دەبێت (زانست) گەڕان بەدوای دۆزینەوەی (حەقیقەت) بخاتە لاوەو پاش ئەمە، تەنها بەدوای گەڕان بەدوای (دەسەلات)ەوە بێت.

ئەمە بەم جۆرەیە کە ڕۆستەمی سەدەی زانست لەسەرەتای سەدەی نوێدا و بەیارمەتی تەکنیك، تەخت و تاراجی لە مەزهەب وەرگرت و خستیە سەر برادەری نوێی — بورجوازی— تاك شارستانیەت بە هەموو درندەکانی جیهان ببەخشێت. لەسەر زەویدا بەهەشت بۆ منداڵانی ئادەم دروست بکات، کەچی ئێستا خۆی کەوتۆتە چاڵی

برادەرەکەیەوە و دەناڵێنێت و هەروەك (رۆستەمی فەرەخزاد) هەست بە ئایندەی ترسناك و لێڵ بکات.

ئەم دژیەکیەی کە مرۆڤ ئەمڕۆ ئازار و رەنجی لێ دەبات، جگە لەوانەی کە کورت بینن کە هەمیشە زیندانی زەمینە و سەردەمی خۆیانن و وونبووی رووداوەکانی رۆژ و پەرێشانیەکانی رۆژانەی ژینگەی خۆیان، هەر ئەندێشەیەکی بە ئاگا و دڵێك کە مانا دەدۆزێتەوە و هەستی پێدەکات و جگە لەمە چ راڤە و هۆکارێك هەیە کە زانست کاتێك لە (حەقیقەت پەرستی) یەوە بەرەو (دەسەڵات پەرستی) رۆیشت ولە حەرەمی(خودا) جیابوویەوە و بوویە چێژ و خۆشی و (بورجوازی) و پاکی و پیرۆزی و حورمەتی دێرینی لە دەستدا و پیس و بۆگەن و بێئاگا و دڵڕەق و بێ ئیمان بوو.

نە ئیدی مریەم کە مەسیحی دەبوو، بەڵکو تایی سی بوویە ئەسکەندەر کە تەنها دەسەڵات وەردەگرێت و دەبەخشێت و لە ئەنجامدا لایەنی تەواوکاری لە شارستانیەت گەشەی کرد ولە ژیاندا دەسەڵاتی پەیدا کرد، گەشەی بەکارهێنان و کەنارخستنی پارێزگاری – بەمانای پاراستن و چاودێری لە بەهامرۆییەکان– و فەرامۆشکردنی رزگاری و سەرکەوتن بەمانای رەهایی و رزگاری بوونی مرۆڤ لە بەندایەتیەکان و لەگەڵ خود بێگانەیی سروشتی و غەریزی و ئابووری و چین و توێژ و سیاسی و فیکری و فەرهەنگی کە دوو دڵی وجودی و ئارەزووی فیتری و عیشقی خامۆش نەبووی لەسەراپای مێژوودا بووە– وە رۆحی هەموو مەزهەبەکان و فەلسەفەکان و ئەدبیاتەکان و هونەرەکان و فەرهەنگەکان و گەرموگوری هەموو داستانەکان و ئەفسانەکان کە لە درێژایی ژیانیدا دروستی دەکردن– سەردەمێکی هێناوەتە ئاراوە کە زانستی کرۆتە پەنجەی و سەقفی فەلەك دەپشکنێت و لەسەر با دەنیشێتەوە و بەسەر مانگدا فەرمانرەوایی دەکات، بەڵام لە بازاری سەوداگەران ئاسانتر لە زەلیلترین کەنیزەکەکان بە پارە دەکڕدرێت و دەفرۆشرێت ولە نێو کۆری سەربازان و کرێکاران و چاودێران و غولامان و خاوەن دەسەڵاتداران و بەردەستان و دەلالان و گۆرانیبێژان و موتریبان و سەماکەران و وتاربێژان و موفتیان و خەڵوەتی کۆشکی ئەمیران و فەرمانڕەوایانی ئەم

رۆژگاره به خزمەت دەبێت و لەبەرئەوەی دەمارگیری لەگەڵ زانستدایە، ئەوا پەیمانی ئازادی زانست سنوردار دەكات و ئیمان بە بێ لایەنی زانست بریندار دەبێت و ئەخلاقی بەها نازانستیەكان و هۆكارە نالۆژیكیەكان و ئایدیالیەكانە كە لە بەردەم زانستدا كە تەنها پشت بە واقیعیەتەكان دەبەستێت بێ بەها و نرخە و هیچ جیاوازییەكی بۆی نیە كە شوێنی كاروباری كۆشكی سپی بێت یان سور و رەش، ئەم رەنگانە، رەنگی ئایدۆلۆژین و ئەمرۆ ئایدۆلۆژیاكان رەنگیان نیە و سەردەمی ئێمە سەردەمی تەكنۆلۆژیایە و راست و چەپ لایەنگری ئیعتیبارین، لایەنگری هێزی و بیرو باوەری و زانست ئەمرۆ بێلایەنن و سەردەمی ئێمە سەردەمی "زانست بۆ زانست"ە.

ئەمەیە كە ئەمریكا بە سەدەها كیسەی پارەوە دێت و لەبەردەم زانكۆكانی ئەوروپا و ئاسیادا، زیرەكی دەكرێت و هیتلەری بێ مێشك بۆسوراندن و جوولەی ئۆتۆمبیلی ترسناكی مرۆڤكوژی و سەلماندنی زانستی لە نەزانی و درندەیی هەر ئەندازەیەك كە بیەوێت چ دەڵێم؟ بەو ئەندازەیەی كە پارەی هەیە- دەتوانێت مێشكی درەخشانی زانستی بكرێتت و ستالین بۆ گۆڕینی (كۆمۆنیزم) بۆ (ئابووری). بەهەر ئەندازەیەك كە "كمینترن" یان كا.گ.ب هەواڵی پێ بدەن و ئاگاداری بكەنەوە، بە هۆی "بریا" فەیلەسوفی مێژوو و زانای ژینگەناس و فیزیكزانی ماددیگەر و كۆمەڵناس و مرۆڤناسی "ماركس" خاڵی بكاتەوە.

شتێكی رێكەوت نیە كە ئەمرۆ بە دەستهێنانی پارە كە كاری رێگری بیابان و خانی لادێ و دزی شار و بازرگانی بازاڕ بوو، شەڕكردن و پیاوكوشتن كە كاری پیاوكوژان و خراپەكان و كوشتنوقات و قڕی شارەكان و بردنی ماڵ و سامانە خەڵكی و داگیركردن و دەست بەسەرداگرتنی میللەتەكان و كە كاری درندەكان و خوێنمژان و جەللادان و ریباخۆرانە، خەڵەتاندنی خەڵكی و سڕكردنی هزر و بیرەكان و جولاندن و بزواندنی نەوان و گۆمڕایی ولادانی گشتی و بلاوكردنەوەی خراپەكاری و گەندەڵی و داروخانو سەرخۆشی و كۆمەڵ و گروپ بازی و ئایین دروستكردن كە كاری ساحیرنی فیرعەون و راهیبانی یەهود و كەشیشانی قەیسەر لایەنگرانی خەسرەو موفتیانی دادوەرانی خەلیفە

و رۆحانیـانی سـولتان و جادوگـەران و پێغەمبـەرانی درۆزن و نـەزانی فێڵبـاز و چـاو بەستران و فالگیران و دەلالانی خۆشەویستی و خـاوەن مەیخانـەکان و گـۆرانی بێـژان و سەماکەران و مارگیران و ئەفسون خوێنان و شەرکەران و بەدرەوشـتان و سـەوداگەرانی بنگ و حەشیش و قومار و شـەهوەت و ئـارەزوو..رەگ و ریـشەی خـەڵکیان دەرهێنـا و جاسوسیکردن و گرتن ولێدان و خستنە زیندان و هونەری خستنە زیندان و ئەشکەنجە و ئـازاردان کـە کـاری مـیری تـورە وکـارگوزاران و جـەللاد و جـل سـورانی خوێنمـژ و درندە...هەموویان، هەموو ئەم کارانە بە تەنها زانست لە ئەستۆی گرتوون، زانستێك کە هەر جۆرە پەیماندانێك بە تەنها بە شیاوی شان و شەوکەتی خۆی دەزانێت و دەژمێرێت تاکو (ئـازادی و بێلانـی) خـۆی کـە پـاش چـەندین سـەدەها خـەبات لەگـەڵ مەزهـەب و ئایدۆلۆژیا بە دەستی هێناوە، ڕێگرێك شتێك نەیەتە ناوەو!

ئەنجام چی بووە، دەتوانێت ئەنجام بە چاو ببینی و ڕۆژ بە ڕۆژ خێراتر و قورستر لـە کۆمەڵگە و تەنانەت لە شێوازی ژیان و ئەخلاقی خودا دا هەست پێ بکەیت:

"کۆمەڵگەیەکی شارستانی، بە مرۆڤی درندەوە!".

دوێنی کە چەندین سەدە لە دەروازەی ئـەم شارسـتانیەتە گەورەیـە دوور بـووین، روخساری زانست پیرۆزیەکی هـەبوو کـە درنـدەترین سـولتانە خـوێن مـژەکانیش وەکـو طغـرل بیـل و ناصـرالدین شـا، لەبـەرخاتری راپـەرین بـۆ بـەها فـەرمانڕەواکان بەسـەر سەردەم و شوێنیان لەرۆحی کۆمەڵگە و بیرۆکە گشتیەکان و جێگیر بووە لە فەرهەنگ و ئیمـانی خەڵکیـدا ولەوێـشەوە دەرۆیـشت بـۆ مـاڵی زانـا و لەبەردەمیـدا چۆکی دادەدا و دەسـتی مـاچ دەکـرد. ئەبوحەنیفـە شـیلاقی دەخـوارد تـاکو پلـەی (قاضـی القـضات) ئیمپراتۆری ئیسلام بگرێت تاکو زانست کە دەبێت ئەمیری خەلیفە بێت و خەلیفە نەبێتە ئەمیری و زانستیش بەدەستی بێت. شوێنی سروشتی زانست ئەمـە بـوو و ئەگـەر چـەند کەسـێکیش خزمـەتی دسـەلاتیان بکردایـەو تەنانـەت لێیـان نزیـك دەبوونـەوە. نزیـك بوونایەتەوە، ڕاستەوخۆ پلەی زانستیو ڕۆڵـی کۆمەڵایـەتیان، شـێوەو ڕەنگـی خیانـەتی

دەگرت و بەخزمەتکاری ستەم ناودەبران و ئەو کەسانەش ئەو سەودا گەرانە بوون کەئاینییان بەدونیاو زانستیان بەزانی فرۆشت بوو. شەهید ئانی زانای گەورەی شیعە لەترسی ئەوەی داوێنی پیرۆزی زانستی بەدونیا پیس نەبێت، بۆ بژێوی ژیانی دڕک و داڵی دەچنیەوە.

ئەمڕۆش "فون براون" روخساری زانستی بێ پەیمان و ئازادی سەدەی ئەمڕۆمانە. سەدەی"زانست بۆ زانست!" زۆر سروشتی و ئاساییە کە زانا لە زانکۆدا بەرهەم دێت و دێتە دەرەوە، خۆی لە بازاڕدا ن ومایش دەکات و بە پێی ئەو نرخەی کە دەیخوازێت خۆی دەفرۆشێت.

لەو ویژانەی کەفەرمانڕەوایە لەسەر سەدەکەمان هیچ شەرم و نەنگی نیە کەدەبینین زانا گەورەکانی سەردەکەمان، پێش ئەوەی لەزانکۆ، تاقیگە یاخود لەپێش مێزی کارکردنەو پلەی زانستی و لێکۆڵینەوەی خۆیاندا بدرەوشێنەوە –هەروەك یاریگایەکی وەرزشی یاریزانێك یاخود یاریچیەکی مشتەکۆڵە دەکرێت– و کارگەیەك یاخود کۆمپانیاو شوێنێکی بازرگانی یان دامەزراوەیەکی داگیرکاری دەکڕن و زانایەکی لەم جۆرە خۆی بەسەرمایە دارێك دەفرۆشێت تاکو ببێتە خزمەتکاری، لەگەڵ هەموو بیرتیژیەك وزیرەکی و زانستێك، لەقوڵێیی رۆحیدا هەست بەکەمترین شەرم ناکات، چونکە "زانست" لەگەڕانە بەدوای"حەقیقەت" "دەسەلات"ەوەیە و بەرپرسیاریەتی دێرینی لە "رێنمونیکردنی مرۆڤ" و پاسەوانی"بەها مرۆییەکان" تەواوکاری بوون و "پاککردنەوەو بەرزکردنەوەی جەوهەری فیتری" کەناری گرتووە و تاکو هەموو لە خزمەتی بەشداربوونی هەرچی زیاتر و فراوانتر و تەواوکاری بەکارهێنان ودابینکردن "پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی ئابووری"و "داخوازی لەسەر بریق و باق وگەڕان بەدوای چێژ"ی ئەو بێت، سروشتیە"ئایدۆلۆژیا" کە پەناگەی"حەقیقەت"ە و

ئامانجی "رزگارکردنە" قوربانی تەکنەلۆژیا بکاتو (بەپێچەوانەی ئایدۆلۆژیاکە نیازی بە خۆبەخشیو فیداکاریو فەزیلەتو دڵسۆزیو خودئاگایی پێغەمبەرانە هەیەو لەناخەوە لەگەڵ مەسرەف پەرستیو داخوازی چێژخوازی دەسەڵات و سەرمایەداریو جوانکاری ورازاندنەوەو خۆشیو چێژ لەململانێدایەو ئەمانە هەموویان "دونیای" دەیانگرێتو خۆیشی "ئایین") لە بنەڕەتدا مندالّی نامەشروعی نزیکی نێوان زانست و سامانە. دیاریشە کەسیستەمی بۆرجوازی یاساو سیستەمێکی "باوكو پادشایەتی" یاخود "پیاوسالاری" یەو باوکی پارەیەو تەنها خاوەن پارەکان پیاون.[1]

سەیری زانست بکە کە چ خیانەتێکی ترسناکی بەمرۆڤ کردووە. ئەگەر رۆشنبیرێك لەم خیانەتە تێبگات، خودی قوربانی ئەو خیانەتە بووەو چ بگا بەوەی کە لە خۆوە، هاودەستو هاوداستانی ئەم خیانەتە بێت وناوی بەرپرسیاریەتی بێت!

زانست مەزهەبی خستەلاوە و لەسەدەی نوێدا لەمەیدانی ژیانی مرۆڤی دوورخستەوەو لەپەرستگاکاندا سنوریداو خۆی بوویە جێنشینیو بەڵێندەری خۆشبەختیو ئازادیو عەدالەتو تەواوکاریو رزگاریو راستی ویستی و ئەخلاقی زانستی!

رۆشنبیرانی سەدەکانی نوێ کە لە بەستویی و بێ جووڵەیی و دواکەوتنی کلێساو رۆحانیەتیو ووشك هاتبوون، باوەڕیان بەم بانگەشەیەکرد "رۆحی خودایی" جێگەی خۆیدا بە "روانینی زانستی" و "زانست" بوویە جێنشینی "ئیمان" و ئەوەی کە هەمیشە

---

[1] شاعیر بەڵخی ئێمە.. "سەدساڵ پێش ئێستا، پەیوەندی نێوان زانستو سەرمایەداری بە دەربڕینێکی شاعیرانە لە سیستەمی کۆمەلایەتی پێش بۆرژوازی وەسف دەكات.

دانشو خواستە است، نرگس وگل — کــــە بەیك جای نشکفند بەهـــم

هرکــە را دانش است، خواستە نیست — هەرکە را خواست است، دانس کم

—— زانست و پارە و ماڵ داواکردنە، وەکو نێرگسو گوڵە، هەردووکیان بەجێگەیەکەوە ناپشکوێن هەرکەس زانستی هەیە، خواست و داخوازی نیە، هەرکەس خواستی هەیە، زانستی نیە"دەکرێت.

"مەزب" قسەی لەبارەوە دەکرد، زانست خستیە ئەستۆی خۆی تاکو بە هەرزانکردنی "ئایدۆلۆژیای مرۆڤ"ی نوێ لێ بێ نیاز بکات.

بەم جۆرە، زانست لەپەیوەست بوونی بەمەزهەبەوە خۆی رزگارکرد تاکو ئازاد بێت‌و مرۆڤیشی بەپەیمانی ئایدۆلۆژی لە ئیمان جیای کردەوەو بەرەولای خۆی رای کێشا. بەم ئومێدەی کە "عیشق بۆ بەها مرۆییەکان" کە بە "خوداپەرستی" تێیدا گەرم وگور دەبوو و پەروەردەی دەکردو و لە بێدەنگی و فەرامۆشیو لەرزینو کەوتن پارێزراو بوو، جێگەی بە"زانست بۆ بەها مرۆییەکان"ی سپارد و"ئاگایی"ی مرۆڤ لە "رۆح"و "عەقڵی لۆژیکی" لە "ئیمانی فیتری" وبوون وویژدانی"ئەخلاقی" بێ نیاز بکات.

ئەمە بەم جۆرەبوو کە جارێکی دی، مرۆڤ سەرکەش کردوو ئەم جارە "میوەی قەدەغەی" زانست بوو وە"شەیتان"یش بورجوازی و پارە!

(رەنگە لەهەمان سەرەتاشدا ئەمانە بوونیان هەبوو بێت!؟)

بەهەر حاڵ بینیمان بە گۆڕانێکی لەم جۆرە، زانست لەگەڵ مرۆڤدا لە پەرستگا هاتنە دەرەوە تاکو زانست لە جیاتی"عیشق و بەها"، بەهێزی"تەکنەلۆژیا و سوود" هەر لەسەر ئەم زەویە بەهەشت بۆ مرۆڤ بوونیاد بنێت و بینیمان کە دروستی کرد، بەڵام بەهەشت، بەهەشتی شەداد بوو.

بەهەشتێك کە تیایدا تەنها پارەیە کەقسە دەکات، بەهەشتێك کە تیایدا عیشق، بەها، خۆشەویستی، فەزیلەت، شەرەف، شانازی، هونەر، جوانی، مانای ژیان، ناسکترین پەیوەندییەکان و زوڵاڵترین هەستەکان وقووڵترین پەیوەستیەکان و بنەڕەتیترین سوننەتەکانو بەرزترین وباڵاترین ئامانجەکانو پیرۆزترین خاوەنداریەتیو هەموو شەوقو تاسەکان وشوعیەکانو ئینگلیزەکان کە لەقوڵێی بوون مرۆڤدا

دەفرۆشـان و بـەژیان و خێـزان و پەیوەنـدی و ئـەدەب و هونـەر وجـوانیو فەرهـەنگ وئیمانمـان سـەرەو ژێـر دەبویـەوە ولـە جووڵـە دابـوون و مانایـان بـەبوون دەداو رۆحو ناوەرۆكو پێکهاتەو هەستیان بەجیهان دەبەخشی، هەموویان و هەموو شـتەکان، وەکـو کاڵایـەك لـەبازاڕدا مامەڵـەیان پێـوە دەکـرد، واتـە: "ڤـان کـوخ"، وێنەکێـشێکی سەرسـوڕهێنەر کـە نـەك جـوانی، بـەڵکو فەلـسەفەو رۆحیـشی بەوێنـە دەبەخـشی، بـۆ دروستکردنی بەرهەمە سەرسوڕ هێنەرەکانی، پارەی پارچـەو رەنگـی لـە...*(°) هـەژار دەژیا و لەسەر رووی پەنجەرەی میترۆکـان و رێڕەوەکـانی ژێـر زەوی لەکوچـەو کـۆڵانو شەقامەکانی شاردا دەخەوتو لە کاتێکدا کـە برسـیەتی ئـازاری دەدا، چـەندین تـابلۆی کێشا کە موعجیزەی مرۆڤ و سەرمایەی فەرهەنگو شانازی و سەربەرزی هونەرن.

ئەم تابلۆیانە لەکوێن؟ لـە کۆشـکی پارەپیـسانەی کەسـیفەتی بـەرازیان هەیـە و بـۆ بەخشینی مانای درۆینە بەبوونی بێمانایان، بەپارە کڕیویانو بەدیواری کۆشكو تـەلارە رازاوەکانیان هەڵیان واسیون کەجگەلە هیچیو پوچیو پارە هـیچ شـتێکی دیکـە بـوونی نیە.

تـەنها رازو نهێنیـەکی گـەورە کـە لەم بەرهەمە سەرسوڕ هێنەرانەدا هەست بەکەسـیو شهودو بینینی خۆی دەکات، نهێنیەك کەبۆ خـودی "ڤـانکوخ"یـش نـەزانراوە، هـەزاران فرۆشـانێك کـە ورگـن و کەللـە گـەورە کـە تـەنها پێکهاتـەی بوونیـان، دەسـتە چـەكو پارەکانیانـە و پـاش بەشـداریکردن لەپێـشانگایەکدا، سـەرێکیش لێـرە دەدەن تـاکو جوانترین بەرهەمە کۆنەکان، گەنجینـە بـێ وێنـە هونەرییـەکان، نوسـخە کۆنـەو دەسـت

---

- (*) ئەم هێمایە لە هەندێ شوێنی کتێبەکەدا دانراوە و لەبەرئەوەی لە شێوەی وتارەوە بابەتەکە خراوەتە سەر شێوەی نووسین بۆیە مانای هەندێ لە رستەکان نەزانراون یـان رەنگـە کاسـێتەکە پـچڕا بێت بۆیە تەواو نەبووە. بڵاوکراوەی کتێبەکەش ئاماژەی بەوە کردووە."و.کوردی"

نوسەکان و موعجیزەی تابلۆو وێنە کێشانو میناتورو دورینو چنینو کاری وردی سەرتابلۆکان کە بۆ هەرکامیان جووتێك چاو – چاوەکانی مرۆڤێکی هونەرمەند– کوێربوون و دواجار، خۆشەویسترین بەرهەمەکانی فەرهەنگو هونەرو زەوقو داهێنانی مرۆیی، شتە دروستکراوە بێ بەدیلی مێژووەکان بەدەستەیەك پارە بیکڕنو بەناونیشانی جەژنی لەدایك بوونی فاسیقان یاخود بۆ هاوکاری نزیکیان ویاخود لەسالۆنی میوانداریان، بەمێزو کورسی ودیکۆرات و ئالتون و پەردەو شتومەکی جوانکاریو بووکە لە ی رازاندنەوەو پەیکەری ورچو بەرازو مانگاو وێنەی باوکو باپیرەو باپیرەگەورەو خاقانو سەلتەنەتو مەلیكو دەوڵەتو رازێنەرەوەی بەشێکی دیوارەکانیان بێت!

## مرۆڤ، ئیسلام و قوتابخانەکانی سەرزەمینی رۆژئاوا

## مرۆڤ لە هەڵبژاردنی مەترسی یان سەرکەوتن

ناوەرۆک:

١- بنەڕەتی مرۆڤ (Humanisme) مرۆڤگەرایی.

پێویستی ناسینی مرۆڤ - مرۆڤگەرایی، وێنای مرۆڤ.

٢- کارەساتە نوێکان.

أ- یاساو رێسا کۆمەڵایەتیەکان، سەرمایەداری عەرەبی، کۆمۆنیزمی رۆژهەڵاتی.

ب- یاساو سیستەمە ئایدۆلۆژییەکان، مێژووگەرایی، بایۆلۆژی، کۆمەڵناسی ماددیگەرایی، "مارکس"یزم.

٣- مرۆڤ لەهەرەشەی سێ مەترسی:

نزمی سەرمایەداری رۆژئاوایی، چەق بەستویی "مارکس"یزم، پوچی بوونگەرایی.

٤- مرۆڤ لەدژیەکی نێوان "مارکس"یزم و مەزهەب.

٥- ئەنجامگیری: "مارکس"یزم و ئیسلام.

# بنەڕەتی مرۆڤ "Humanisme"

## پێویستی ناسینی مرۆڤ

تارادەیەك هاوڕابوون لەسەر "پێناسەیەکی وردی لۆژیکی"بۆ مرۆڤ شتێکی مەحاڵە، چونکە بەپێی تێڕوانینە زانستیەکانو قوتابیخان فەلسەفیو بیروباوەڕی مەزهەبی جۆراوجۆر جیاوازە.

زانستیش هێشتا پەردەی لەسەر رووی ئەم " جیهانە بچوکە" هەڵنەداوەتەوە و بەگوتەی ئەلیکسس کارل (Alexis carel): "مرۆڤ بەو ئەندازەیەی کەسەرنجی لە جیهانی دەرەوەی خۆیداو تێیدا پێشکەوتووە، لەخۆی دورکەوتۆتەوەو حەقیقەتی خۆی بیرچۆتەوە." شتێکی رێککەوت نیە کە ئەم زانایە بەناونیشانی یەکەمین بوونیادنەرو دامەزرێنەری دامەزراوەی تایبەتی" مرۆڤ ناسی زانستی" و لە هەمانکاتدا، یەکێك لە دیارترینو ناسراوترین کەسە دیارەکانی زانستە لەم سەردەمەدا باس لە مرۆڤ دەکات و مرۆڤ بە "ئەم نەزانراوە" وەسف دەکات.([1])

---

[1] بەرهەمی ئەم زانا بلیمەتە بەناوی Lhomem,ceticopwu، ئەم کتێبە بە فارسی وەرگێردراوە بەناوی "انسان موجود ناشناختە" و هەروەها بەزمانی عەرەبیش لەژێر ناونیشانی "انسان ذالك المجهول" هەیە و بە زمانی کوردیش بە ناوی "مرۆڤ، بوونەوەرێکی نەناسراوە" بلاوبۆتەوە. (وەرگێڕ)

بەلام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ناتوانرێت لەهەوڵو کۆشش لەرێگەی ناسـنی مـرۆڤ و هەبوونی جۆرێك لەپیشاندانی خودو حەقیقەتی جەوهەری چاو دابخرێت.

چونکە یەکەم، ناسینی مرۆڤ، واتە ناسـینی خـودی خۆمـان و بـەبێ ئـەوەش جۆرێك لە"ناخود ئاگایی" رەش دەمانگرێتەوەو چرای دەرەخشان و رووناکی زانست "ئاگایی" ناتوانێت بەرەو جێگەیەك رێبەریمان بکات.

ئەمەش هەمان کەمهێنانی مەترسیدارە کە مرۆڤـی ئـەمڕۆ لەگـەڵ بـوونی سـەرکەوتنە سەرسوڕ هێنەرەکانی لەجیهانی زانستدا، لەتێگەیشتنی تـەواوی مانـای ژیـانو چـەمکی بوون (وجود)ی خۆی مەحروم بووە وەبەگوتەی "دیفی": مرۆڤی ئەمڕۆ زیاتر لە مرۆڤـی کۆن لەفەرمانڕەوایکردن بەسەرخۆیدایە و لە بنەڕەتدا، ئەم ناسینە، ناسینێکی ژیانیە.

زیادەڕۆیی نابێت ئەگەر بوترێت کە هۆکاری سیاسی شکستی هەموو هەوڵە زانـستی و کۆمەلایەتیو ئایدۆلۆژیەکانی هاوچـەرخ لەرێگـەی رزگـاری راسـتەقینەی جـۆریێ مـرۆڤ و بەلایەنی کەمەوە پێدای جۆرێك "هەستی خۆشبەخت بوون" پێی لێرەدایـە کـە بابـەتی بنەڕەتی هەموو ئـەم هـەوڵو سـەرکەوتنانە کـە مرۆڤـە بەنـەزانراوی ماوەتـەوەو یـاخود بەگشتی فەرامۆش کراوە.

وتەیەکی بێمانایەکە ژمارەیەك لە دیارترین و دەرکـەوتوترین ئەنـدازیارانو بیناسـازان لەسەر بنەمای بنەڕەتی تەکنیکی زۆر پێشکەوتوو، لە "باشترین و ئاسـایش بەخـشترین خانوودا" قسە بکەن، پێش ئەوەی ئەوەی ئەوەیان بۆ دەرکـەوتبێت کـە ئـەو خێزانـەی کە دەبێت تیایدا نیشتەجێ بن، چ جۆرێکن، چ رۆحیەتێكو چ ئامانجێکیان هەیە و نیـازو پێویستی بنەڕەتی ژیانیان چیە؟

ئەمەیە کە لەگەڵ بوونی ئەو پێشکەوتنە حیرەت ئەنگێزانەی کە سیستەمی فێربوون و پەروەردەی نوێ ئەنجامیداون و لە توانا مەزنەکانی تەکنەلۆژیا تاکو کۆتا دۆزینەوە زانستیە دەروونناسیەکانی لەبەردەستدایە، جگە لە پڕکردنی وەچەی نوێ لەزەمینەی بابەتە زانستیو هونەری و گەشە فیکرییەکان، نەك تەنها هیچ جۆرە سەرکەوتنێکی درەوشاوەی نەبووە، بەڵکو لە زۆرێك لە لایەنەکانەوە، تەنانەت سەبارەت بەرێساو سیستەمەکان و قوتابخانە پەروەردەییەکانی رابردوو، نەزۆك بووەو بەشێوەیەك دەرهێنراون کە مرۆڤی ئەمڕۆ زیاتر لە مرۆڤ دەتوانێت مرۆڤ دروست بکات، بەڵام کەمتر لەوە "دەزانێت" کە چ شتێك دروست بکات؟

هەر بەو جۆرەی کە لەبارەی ژیانیشەوە بەم جۆرەیە، دەتوانێت هەرجۆرێك کە بیەوێت بژی، بەڵام نازانێت "چۆن"؟ چونکە، نازانێت "بۆچی"؟

ئەم پرسیارە بنەڕەتیانەن کە لە کۆمەڵگە سەرمایەدارەکاندا، کەسێك ناتوانێت وەڵامێکیان بۆ بدۆزێتەوە و لە کۆمەڵگە کۆمۆنیستیەکاندا کەس ناتوانێت تەرحیان بکات و بیانخاتە روو!

لێرەدایە کەدەتوانرێت پەی بەوە ببرێن کەبۆچی ئایدۆلۆژیە نوێکانیش کەهەوڵدەدەن تاکو ببنە جێنشینی مەزهەبە کۆنەکان، لەوەڵامدانەوەی نیازو پێداویستیە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ بێ توانا ماونەتەوە و لە کۆتاییدا مرۆڤەکان یاخود بە"پوچی" گەیشتوون وە یاخود "بەند" کراون. ئیستاش "فەلسەفەی ژیانی مرۆڤ"لەدوو جیهاندا دروست بووەو دابینکراوە ئەوانیش "لیبرالیزمی رۆژئاواییو کۆمۆنیزمی رۆژهەڵات" جگە لەم دووانە شتێکی دی نیەو لەهەردووکیاندا ئەوەی کە بووەتە قوربانی"گەشەی ئازاری فیترەتی مرۆڤ"ە.

بەلاّم بۆ گەیشتن بەبڕیاردانێکی لەم جۆرە، سەرەتا دەبێت بزانین کەمانای"فیترەتی مرۆڤ"چیە و پاشان باس لەگەشەی ئازار یاخود سڕینەوە یان داڕووخانی بکەین. لەبەرئەوە جارێکی دی بەپێویستی پێناسەی جەوهەرو حەقیقەتی مرۆڤ دەگەین، چونکە مرۆڤ پێوەری ڕاستو ناڕاست (حق وباطل) و نەفیکردن و سەلماندنی هەر قوتابخانەیەك هەر شێوەو شێوازێکی ژیانە.

## ڕێبازی مرۆیی"مرۆڤگەرایی" — ڕەسەنێتی مرۆڤ

لەگەڵ هەموو ئەو نەزانینەو شتە نادیارانەی کەسەبارەت بەچەمكو بوونی مرۆڤ بوونی هەیەو لەگەڵ ئەوشدا هەر قوتابخانەیەك و مەزهەبێك جۆرێك ڕاڤەی مرۆڤ دەكات، لەهەمانکاتدا دەتوانین دەربارەی مرۆڤ لەسەر ڕووی بنەڕەتیترین بنەمای هاویەش و جێگەی ڕێککەوتنی قوتابخانە گەورە زانستیو مەزهەبیو کۆمەلاّیەتیەکان ڕێککەوین.

کۆی ئەم پایەو بنەما مرۆییانە کەزۆربەیان لەسەریان کۆکین، لەمانایەکی فراوانتردا دەتوانین ناوی"ڕێبازی مرۆیی — مرۆڤگەرایی" ناوبنێین بەو مانایەی کە: "قوتابخانەیە کە ئامانجی بنەڕەتی خۆی ڕزگارکردن و تەواوکاری مرۆڤ لەجیهاندا رادەگەێنێتو مرۆڤ بەبوونەوەرێکی بەڕێز دەژمێرێتو ئەو بنەمایانەی کە پێشنیاریان دەکات لەسەر پایەی وەلاّمدانەوەی ئەو نیازو پێداویستیە بنەڕەتیانەیەکە جۆری مرۆڤ دروست دەكات".

ئەمڕۆ چوار ڕەوتو بزاوتی فیکری گەورە لە بەرامبەرماندا بوونیان هەیە کە لەگەڵ ئەوەشدا دژیەکی ناوەکی و ململانێی بنەڕەتیان لەگەڵ یەکتر هەیە. دژی مرۆڤگەراییەتی لەم جۆرەن ئەوانیش:

١- لیبرالیزمی ڕۆژئاوایی.

٢- "مارکس"یزم.

٣- بوونگەرایی.

٤- مەزهەب.

لیبرالیزمی رۆژئاوای خۆی بەمیراتگری سەرەکی و بنەڕەتی فەلەسەفەو فەرهەنگی مرۆڤگەرایی مێژوو دادەنێت و بەرووداوێکی پەیوەستی بەفەرهەنگو فیکر دەزانێت کە لە یۆنانی کۆنەوە دەستی پێکردووە ولە ئەورووپای ئێستادا بەتەواوی ڕێژەیەکی خۆی گەیشتووە. مرۆڤگەرایی رۆژئاوایی، لەسەر بنەمای هەمان ڕوانینی تایبەتی (جیهانی خودایان و جیهانی مرۆڤەکان) چاودێری‌و دژیەکی‌و تەنانەت جۆرێك بەخیلی و ڕەق بوونی هەیەو خودایان دەسەلاتدارە دژە مرۆییەکانن کە هەموو هەوڵ و هەستیان لەسەر فەرمانڕەوایی سەپێنەرانە بەسەر مرۆڤ و زیندانی و پاراستنی لەلاوازی‌و نەزانی‌و نزمی خاکی وەستاوە و هەمیشە لەخود ئاگایی، سەربەخۆیی، ئازادی‌و حکومەتی مرۆڤ بەسەر سروشتدا ترسیان هەیەو هەرمرۆڤێك کە لەم ڕێگایانەدا هەنگاو هەڵبگرێت، تووشی گوناهێکی گەورە بووە و بەسەر خودایاندا زاڵ بووەو خراپترین ئەشکەنجەو سزاکانیان بەسەردا دەسەپێت.

لەلایەکەوە، هەمیشە مرۆڤ لەگەڕان بەدوای ڕزگاری خۆی لەم زیندان‌و دەست بەسەریەدایەو هەوڵدەدات تاکو لەڕێگەی بەدەست هێنانی دەسەلاتە خوداییەکانەوە، خۆی بەسەر بەخۆیی بکات‌و جێگەی خوداکان لەسروشتدا بگرێت‌و چارەنووسی خۆی لەچنگی ترسی ئەوان پاك بکاتەوەو نەهێلێت خۆی چنگ بخاتە ئیرادەو هەڵبژاردنی خۆیەوە.

هەڵبەتە پەیوەندیەکی لەم جۆرەی پڕ لەڕق وتۆڵە لە نێوان مرۆڤەکان‌و خوداکاندا لە ئەفسانەکانی یۆناندا بەتەواوی سروشتی ولۆژیکی بوو و لەلایەکی دیکەوە بەتەواوی ڕاست و دروست و پێشکەوتوو، چونکە خوداکان لەئەفسانەکانی یۆناندا ئەربابی

جۆرەکـانن و سـیمای هێـزی مـاددی سروشـت لەلایـەن دەریـا، رووبـار، زەوی، بـاران، جوانی، هێزو توانای جەستەیی، فـەڕو بـەپیتی ئـابووری، وەرزەکـانی سـاڵ و هـەروەها لافاو، بومەلەرزەو، نەخۆشیو برسیەتی، مەرگن...

لەبەرئەوە شەڕی خوداکـان و مرۆڤـەکان، لەحەقیقەتـدا شـەڕی مرۆڤـە دژی سـولتەی هێزی سروشت کە بەسەر ئیرادەز چارەنووسو ژیانی مرۆڤدا فەرمانڕەوانو مـرۆڤ هـەوڵ دەدات تاکو بەدەسەلات و تواناو ئاگایی رۆژانەی زیادی خـۆی، لەفـەرمانڕەوایی کردنـی ئـەم هێزانـە رزگـاری ببێـتو خـۆی جڵـەوی خـۆی بەدەسـتەوە بگرێـت وبەشـێوەی گەورەترین هێزی دەسەلاتداری سروشت دەربکەوێت، واتە ببێتـە جێنـشینی زیـۆس کـە سیمای حکومەتی سروشتە بەسەر مرۆڤدا.

هەڵەیەکی گەورە وسەرسوڕهێنەرە کە مرۆڤگەرا نوێیـەکان – لەدیـدی "ڤـۆڵتێرەوە تاکو "فیورباخ"و "مارکس"– کردوویانە ئەوەیەکە جیهانی ئەفسانەناسی یۆنـانی کـۆن کە لەم سنورو چوارچێوە سروشتیەی ماددەدا تێدەپەڕێت، لەگەڵ جیهـانی مەعنـەوی و قودسی لەجیهابینی مەزهەبـە گـەورە رۆژهەلاتیـەکان کەلێکـچوونی جەوهـەریی لەگەڵدا هەیە، بەهەمان شتیان داناون و پەیوەنـدی مـرۆڤ لەگـەڵ "ئـەهوررا مـزدا، رامـا، تـائو)، باوکی رزگارکەر (مەسیح) و (الله) لەگەڵ پەیوەندی مرۆڤ و زیۆس یان بەراورد کردووە و تەنانەت بەهەمان شت دایانناون.

لە کاتێکدا ئەم دوو پەیوەندیە، بەتەواوی پێچەوانەی یەکترن. لەوێدا ""پرومتە"" کە "ئاگری خودایی بەمرۆڤ دەبەخشێت"، یەکەم لەدەستی خوداکـانی دەسـتێنێت وکاتێـك کەخەوتوون، بەپەنهانی بۆ زەوی دەهێنن و پاشـان بـەتاوانی ئەنجامـدانی ئـەم گوناهـە تاوانباری سزای خوداکان دەبن.

لێرەدا فریشتەی گەورەی خودا – ئیبلیس– کەخودا نەفرەتی لێ دەکات و دەری دەکات، لەبەرئەوەیە کە بەپێچەوانەی فەرمانی خودا، هەروەك فریشتەکانی تر، لەبەردەم ئادەمدا کڕنوشی نەبردووە.

لێرەدا ئەم ئاگرە خوداییە، بەشێوەی نوور "حیکمەت، پەیام" لە لایەن ئاسمانەوە دەدرێتە دەست خاوەنانی پەیامی خودایی تاکو بەمرۆڤ بگەیێنرێتو بەبانگهێشتکردن و هەوڵ و ترس وئومێدی خودایی، منداڵانی ئادەم "تاریکیەکان، بەرەو ئەم نوورە" بانگ بکەن.

دەبینین لێرەدا – بەپێچەوانەی زیۆس– خودا دەیەوێت مرۆڤ لە چنگی بەندایەتی سروشت رزگاری ببێت و رێگەی رزگاریشی لەدوای هەمان رووناکی "پرومتە"یی رابگەیێنێت وله ئەنجامدا دەگەینە ئەم بڕیارەی کە لە جیهانبینی ئایینە گەورەکان، خودا، مرۆڤ بەزاڵ بەسەر زیۆسدا ناودەبات و رایدەگەیێنێت کە:– "فریشتەکان هەموویان لەبەردەم ئادەمدا دەستیان بەکڕنوش بردووەو وشکانی ودەریا بۆ ئێوەی مرۆڤ گوێڕایەڵن"!

ئەمەیە کە لە جیهانبینی ئەفسانەکانی یۆنانی کۆندا، سروشتی و لۆژیکی کە "مرۆڤگەرایی" لە بەرامبەر "حکومەتو پەرستشی خوداکان" ئەربابی جۆرە سروشتەکان شێوەیەك بەخۆیەوە بگرێتو لە نێوان "بنەڕەتی مرۆڤ" و"بنەڕەتی خوداکان" دژیەکی دروست ببێت.

لەسەر ئەم بنەمایە، مرۆڤگەرایی یۆنانی، هەوڵیدەدا تاکو بەنەفیکردنی خوداکان و ئینکاری حکومەتەکەیان و پچڕانی پەتی بەندەیی مرۆڤ، ئاسمان، بەبنەڕەتی مرۆڤ بگات، پێوەری دروستی و نادروستی مرۆڤ وەربگرێتەوە و پێوەری جوانی ئەندامسازی

بسەپێنێت(١) و تەنها بەو توخمەی گرنگی نێوان ژیان رازی بێت کە بۆ مرۆڤ تواناو دەسەڵات یان چێژ دروست بکات.

هەرچەندە ئەم جۆرەی مرۆڤگەرایی، لەو روەوە کە لە بەرامبەر مرۆڤدا شێوەی گرت، بوویە زەمینی و بەرو رووی"ماددیگەرایی" و ئەمەیکە "مرۆڤگەرایی" لەتێروانینی رۆژئاوایی– لەیۆنانی کۆنەوە تاکو ئەورووپای ئێستا– بەرەو "ماددیگەرایی – ماتریالیزم" پەلکێش کردولەلیبرالیزمی دۆستانی "دائرەالمعارف"، لە فەرهەنگی بۆرژوازی رۆژئاوایی‌و لە"مارکس"یزم چارەنووسێکی هاوشێوەی هەبوو.

ئەوەی کە بوویە هۆی ئەوەی کە مرۆڤگەرایی لەرۆژئاوادا، لەلایەنی پێچەوانەی خوداگەرایی هەرچی زیاتر شێوە بگرێت، کاسۆلیزمی سەدەکانی ناوەراست کە مەسیحیەت – بەناونیشانی مەزهەبی رەها– لە بەرامبەر "مرۆڤ" بووندایە ولە نێوان زەوی و ئاسماندا هەمان ئەو دژیەکی‌و دژایەتیەی دروستکرد کە لە ئەفسانەناسی یۆنانی کۆن و رۆحی کۆن بوونی هەبوو و بەراڤە چەندین تەفسیری یۆنانی گەرانەوە بۆ "تاوانی یەکەمین و دەرکردنی مرۆڤ لە بەهەشت"، مرۆڤ مەحکومی جەبری ویستی خودای گەورە لەزەوی نزمدا جیلوەی پێکرد و مرۆڤی بە" گوناهکاری نزم ونەفرەتی ولاواز" ناوبرد و تەنها چینێك لە کۆمەڵگەی مرۆیی بەناوی"رۆحانیەکان" جیاکردەوە کەهەڵگری رۆحنو ئەوانی تر تەنها رێگەی رزگارییان، لە شوێنکەوتنی بێ چەندو بۆچی

---

١ لێرەدایەکە لەجوانیناسی یۆنانیدا، سەرنجدان لەپەیکەری مرۆڤ وپێشاندانی جەستەی رووتی مرۆڤ پەناگەی بنەرەتی وسەرەکی دەبێت وپەیکەر سازی یۆنانی کەجوانترین—پاشماوەی پەراوێزی پێشوو_ نهێنیەکانی مرۆڤ پیشان دەدات وجوانیەکانی پەیکەری رووت دەست مایەی بنەرەتی خۆی دەکات، ئەمە شێوازێکە کە لە مرۆڤگەراییەکی لەم جۆرە سەرچاوە دەگرێت‌و ئەمەشە کە هونەری سەردەمی رێنسانس لە ئەورووپای نوێ دەناسێنێت.

و بۆ مانەوەی چاولێکەرانەو کوێری ئەم پیادە رۆحانیانەیەو ئەندامییەتی لەدامەزراوەی سەرەکی بەهۆی ئەم دەرکەوتە سەرەکیەی خودا لەزەویدا بەڕێوە دەبرێت.

ئەم شێوازو رێگە هزریە، خوداگەرایی (Theisme) لە بەرامبەر مرۆڤگەرایی داناو بەناچاری رێگەی هێناوی سەڵتەنەتو دەسەلاتی ئیلاهی، لە شوێنی قوربانی"بنەڕەتی مرۆیی" تێدەپەڕینو ئەمەیکە لەسەدەکانی ناوەراستدا، مرۆڤگەرایی لەنێودەچێت و زانستو فەرهەنگو ژیان و ئەخلاق و تەنانەت لە هونەرو جوانیناسیدا، مروڤێکی تر ئیعتیباری بۆ دانانرێتو لەم رووەوەیەکە هەموو رووخسارو شێوەی هونەری و جوانیناسی سەدەکانی ناوەراست، بریتیە لە رۆڵی داستانە ئەودیو سروشت و بان مرۆییەکانی: رۆح القدس، مەسیح، فریشتەکان، موعجیزەکان و کەراماتەکانو... ئەگەر روخسارێکی مرۆیی هەیە، تەنها حەواریەکان و رۆحانیەکان، ئەوانیش سەراپای ئەندامە مرۆییەکانیان لەدوو توای پەردەی بەرزو فراواندا شاردراوەتەوە و زۆرجار روخسارەکانیشیان داپۆشراوەیان لە هالە نوورینە مەلەکوتیەکاندا وون بووە!

ئەدەبیات؟ گواستنەوەی ئەم داستانانەیە،

هونەر؟ رولّی و وێنەی هەر ئەم چیرۆکو روخسارانەیە،

زانست؟ سەلماندنی ئەم چەمکانەیە،

ئەخلاق؟ کوشتنی هەموو حەزو ئارەزووە سروشتیەکانە بۆ پاکبوونەوە یەکەمین گوناه، ژیانی ئەم جیهانە؟ ئەوەی کە دەبێت فیداکردنو بەختکردنی بێت بۆ گەیشتن بەژیانی جیهانەکەی دی! دەبینین کە هەموو جیگەیەك بەنەفیکردنی شتە بنەڕەتیە مرۆییەکان لەکاسۆلیکی سەدەکانی ناوەراست، مرۆڤ بەخودا دەگات. واتە دەبێتە هۆی رازیبوونی خودا.

چ لێکچوونی نزیکی نێوان خودای مەسیحیەت و زیۆسدا هەیە!

ئەمەیە کەبتوانین بڵێین، مرۆڤگەرایی پاش ڕێنسانس لەئەورووپای نوێدا، شوێنکەوتەی مرۆڤگەرایی یۆنانی کۆنە، دەتوانین بڵێین کە" ئاسمانگەرایی" ئەفسانەکانی یۆنانیەولە ڕۆژئاواشـــدا، چ لەســـەدەکانی ناوەڕاســـت، چ لـــە ســـەدەنوێیەکان، هەمووشـــتێك لەسەرچاوەی یۆنان ئاودەخواتەوە ومێژووی فەرهەنگی ڕۆژئـاواش درێـژە پێـدەری ئـەم دوو ڕەوتە دژیەکە لەو سەرچاوەوەیە، ناوی چ مەزهەب بێت، چ زانست.

ئیستاش، زیاتر شایەنی تێگەیشتنە کەببینین، ئەمڕۆ هەردوو ڕەوتی دژیەك هـەر لـەم "مرۆڤگەرایی یۆنانی"یەوە سەرچاوەی گرتووە: هەم بورجوازی، هەم "مارکس"یزم کـە هەردووکیان لە "مادیگەرایی مرۆیی"– چ لەکردار وچ لە ئایدۆلۆژیا– هاوبەشـیان هەیـە، و هەم "ڤۆڵتێر" و هەم "مارکس"، هەردووکیان بەتەنها جۆرێك چاوی خۆیان بۆ بەهەند وەرنەگرتنی لایەنـە مەعنەوییـەکانی نـاخ و ڕوونـی مـرۆڤ داخستووە وەهـەم کۆمەڵگـەی دامەزراوەی کۆمۆنیزمی لە کۆتاییدا بەجۆرێك دەربڕین لە مرۆڤ، ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگـەی مرۆیـی کۆتاییـان پێـدێت و بۆرجوازیگـەرایی کۆمەڵگـە پێـشکەوتووە کۆمۆنیـستەکان – کەئێـستا ئیـدی شـایەنی ئەوەنیـە سـەرنجی لێ بـدرێت– نـە ڕێککەوتـە، نـە تێپـەڕبوو ونـەلادانی عـەقڵانی، چـونکە هـەموو شـتێك بـەمرۆڤ کۆتـایی دێـت و سروشـتیە کەئـەو فەلسەفەی کـە سـەبارەت بـەمرۆڤ دەربڕینێکـی لێکچوویان هەیـە، لەهـەر ڕێگەیـەك کـە دەسـت پێدەکـەن سـەرەنجام، ڕێگـەیان دەبێتـەوە بەیـەك ڕێگـاو سـەری مەنزڵیـشیان هەمان شوێن.

بەهەرحاڵ، هەم لیبرالیزمی بۆرجوازی ڕۆژئاوا هەم "مارکس"یزم هەردووکیان باس لە "مرۆڤگەرایی" دەکەن، ئەو بانگەشەی ئەوەدەکات کە لە ڕێگەی ئـازادکردنی تاکـەکان و بـیرو هزرەکـان لەلێکۆڵینـەوەی زانـستی و بەریەکـدا کـەوتنی فیکـری و بەرهـەمهێنانی ئابووری، دەگاتە ئەو پەڕی ئامادەگیەکانی مرۆڤ و ئـەمیش بانگەشـەی ئـەوەدەکات کـە لە ڕێگەی نەفیکردنی ئەم ئازادیانەوەو سنوردار کردنی لەتەنها ڕێبـەرێکی دیکتـاتۆرەوە

کۆمەڵگـە بەشـێوەی دامەزراوەیـەك لەسـەربنەمای یـەك ئایـدۆلۆژیا بـەڕێوە دەبـات و مرۆڤـەکان دەگاتـە یـەك ڕەنـگ وشـێوە، بـەڵام فەلـسەفەی ژیـان ودەربڕینـی بۆچـوون سەبارەت بەمرۆڤ هەمان ئەو شتەیە کە لە فەلسەفەی بۆرژوازی لیبرالـدا شـاردراوەتەوە ئـەویش بریتیـە لـە: " گشتاندنی ژیـانی چـینی بۆرجـواز بەسـەر هـەموو ئەندامـەکانی کۆمەڵگەدا." !

ئایا ئەمە نوکتەیەکی پێکەناوی نیە کە بوترێت:
"کەواتە "مارکس"یزم لەبورجوازی، بۆرجوازترە"؟

بەڵێ، جێگای پێکەنینە کە لە دیدی مرۆڤگەرایی واقیعیـەتی بەرچاوی هەیـە. لەگـەڵ ئەوەشدا کـەلیبرالیزمی بۆرجـوازی ڕۆژئـاوا، خـۆی بـەمیراتگری فەرهـەنگی مرۆڤگـەرایی مێژوو دەژمێرێت و"مارکس"یزمیش خۆی بەشێوەی ڕێگەیەك بۆ هێنانەدی مرۆڤگـەرایی (مرۆڤی تەواو- Lhomme total) دەناسـێنێت، بوونگـەرایی، پـێش ئـەم دووانـەش بانگەشـەی ئـەوەدەکات کـە لـە بنەڕەتـدا، بەگوتـەی "سـارتەر": "بوونگـەرایی خـودی مرۆڤگەراییەکـە"و هەڵبەتـە پـێش دوو وەچـەی پـێش خـۆی مـافی بانگەشـەیەکی لـەم جۆرەی هەیە.

بەڵام چوارەمین ڕەوتی فیکری و هزری گەورە کە لە هەرسێ ڕەوتو بزاوتـی پێـشوو ریـشەدار تـرو کـۆنترە بریتیەلـە جیهـانبینی مەزهـەب. لـەورووەوە کـە هـەر مەزهـەبێك بنەڕەتی بانگەشەی خۆی بە"ڕێنمونی مرۆڤ بۆرزگاربوونی کۆتایی" رادەگەیێنێت، ناچـار خاوەنی فەلسەفەیەکی مرۆڤناسی دیاریکراوە" چونکە ناتوانرێـت قـسە لەسـەر رزگـاری مرۆڤ بکرێت بەبێ ئەوەی پێـشتر روون بووبێتـەوە کـە مـرۆڤ چـۆن مانـا دەکرێـت؟ لـەم رووەوەیە کە هەموو مەزهەبەکان بەفەلسەفەی دروستبوونو دروستبوونی مـرۆڤ دەسـت پێدەکەن.

لەبەرئەوە دەتوانرێت لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئەم چوار ڕەوتە جۆراوجۆرە فیکریی‌و مزریە – کە ئەمڕۆ لەجیهاندا دەخرێتە ڕوو– کە مرۆڤ بەناونیشانی "*بنەڕەتێك*" یاخود "*جۆرێکی بنەڕەتی*" خستویانەتە ڕوو و بەپێی بانگەشەی قوتابخانەکەیان لەسەر ئەوەن پێناسەیەك بەناونیشانی بنەمای هاوبەش بۆتەرحکردنی بابەتەکان‌و دەست پێکردنی باسەکە بن وسریێ:

## وێنای بوونی مرۆڤ:

رادیکاڵەکان – کە لە دیارترین بانگەشەکەران‌و بیرمەندانی "مرۆڤگەرایی ن ویێ"ی ئەوروپای سەدەی هەژدەیەم وسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمن، لەو راگەیاندنەی لەساڵی (١٨٠٠)دا بڵاویان کردۆتەوە، ئەوەیان ڕاگەیاند کەخودا لەپێگەی ئەخلاقدا واز لێ بهێنین‌و لە جیاتی‌و جێگەیدا "ویژدان" دابنێت، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکە خاوەنی"ویژدانێکی ئەخلاقی بنەڕەتی"([1])

ئەم "ویژدانە ئەخلاقیە" – لەدیدی ئەوانەوە– لەسروشت‌و ناخی مرۆڤدا سەرچاوە دەگرێت وداخوازی سروشتی خودی"مرۆڤ"ە.

پشت بەستن لەسەر سروشتی مرۆیی ( Nature humaine) و هەروەها ویژدانی ئەخلاقی (Conscience morale) پایەی بنەڕەتی وجێگیری مرۆڤگەرایی "بێ خودای ڕۆژئاوا" نە لەم سەردەمەدا.

---

[1] هەرچەندە ئەم فەلسەفەی پەروەردەو فێرکردنە بەزوویی بەرهەم وجێکەوتە شومەکانی هاتنەدی ودەرکەوتن تاکو ئەو جێگەیەی بەرەسمی خرایە کەنارەوە ولەقوتابخانەکاندا لابرا، چونکە بەگوتەی ئیزولە (Isoulet) ئەم شێوەیە "ئەخلاقێکی ڕەشی" لەفەرەنسادا هێنایەکایەوە و پیشانیدا کەهەموو ئەو هەوڵ‌و کۆششانەی لەسەردەمی سوکراتەوە تاکو ئێستا دراون تاکو خودا لەژێر بنەمای ئەخلاق لابەرن، لەگەڵ شکستدا ڕووبەڕوو بونەتەوە.

هەرچەندە بەهاتنەکایەو دروستبوونی سەردەمی بەش بەش بوونو شیکردنەوەی زانستی بەتایبەتی گەشەی کۆمەڵناسی – کە دەروونناسی دارنی و بەتوندی دوای خست– بنەمای جێگیرین بەناوی سروشتی مرۆیی کردە جێگای دوودڵی و پاشان نینکاری لێکراو ئەو کاتە ویژدانی ئەخلاقی لە جیاتی ئەوەی لەقوڵیی ئەم سروشتەوە سەرچاوەی گرتبێت، بەشێوەی"ویژدانێکی کۆمەڵایەتی" گۆڕاوکە لە سروشتی ژینگەی کۆمەڵایەتی مرۆڤ کەزۆرجار نەگۆڕە، سەرچاوە دەگرێت و بەگۆڕانی دەگۆڕێت و بەم جۆرە، ئەخلاق، بەناو نیشانی کۆمەڵێك لە بەهای پیرۆز و ئەودیو ماددە کەوتنە لەرزینو هەرەشەی کەوتنیان لێکرا.

لەگەڵ هەموو ئەمەشدا مرۆڤگەرایی نوێ – کە لیبراڵیزمی بورجوازی رۆژئاوا خۆی بەرێسایەك لەسەر ئەو بنەمایە دەژمێرێ– وە بەناونیشانی بوونەوەرێکی خاوەن فەزیلەتی ئەمری ئەخلاقیو بەها بەرێزەکان و ئەودیو سروشتەکان سەیری مرۆڤ دەکات، ئەو فەزیلەتو بەهایانەی کەتەنها مرۆڤ جێگەو شوێنی بنەرەتیان ولێرەدایەکە لە بەرامبەر سروشت و لە بەرامبەر ئەودیو سروشت پشت بە رەسەنایەتی مرۆڤ دەبەستێت.

لەم مرۆڤگەراییەدا، ئەخلاقی مرۆیی، کۆی گشت لە مەزهەبەوە وەرگیراوە، بەلام تەنها رووگەی مەزهەبی ئەوەیە کەئینکار کراوەو جێگەی پەروەردەو گەشەو وەفاداری بەرامبەر فەزیلەتە ئەخلاقیەکان بەبێ باوەڕبوون بەخودا رادەگەێنێت.

"مارکس"یزم لەم رووەوە بۆ دوو بەش دابەش دەبێت:– بەشێك کە تیایدا "مارکس" لە بەرامبەر سیستەمی سەرمایەداری سەردەمی خۆی سەنگەر دەگرێتو بەشێوەیەکی توند هێرشی دەکاتە سەر و بەشێکە کەباس لەتەرحی کۆمەڵایەتی کۆمۆنیزمی خۆی دەکات. لەبەشی دووەمدا کە لە لایەنی جێگیرکردنی "مارکس"یزمە، هەست

بەوەدەکرێت کە "مارکس" ئەو هەستە سەرسوڕهێنەرەی سەبارەت بەبەها ئەخلاقیەکانی مرۆڤ پیشان دەدات، لەژێر تیشکی شەوق و تاسەی سیاسی داخوازی دەسەڵات کەبۆ سەکەوتنی ئاشوختەیی پیشان دەدات گۆڕاوە. بەلام لەرووگەی رەخنەی خۆی کە هەر ئەم رووخسارەی "مارکس"ە کەکاریگەری وجێگەوتی بەهێزی هەیەو گەلێك لەو هزرو هەستانەی کە لە سەرمایەداری ئازارو رەنج دەبەن بۆ خۆ راکێشاوە. "مارکس"، سەرمایەداری کە بەناونیشانی ئەوەی کە"بەها بەرزو باڵاکانی مرۆڤ بەرەولەنێوچوون و داروخان دەبات" دەخاتە بەرهێرش و بەئاوازێکی عیرفانی تایبەتی لە"مرۆڤی خاوەن غیرەت، خودئاگا، راستگۆ، سەرکەش، ئازاد، عاریف بەخودی خۆی وخاوەن فەزیلەتی ئەخلاقی... کە لە سیستەمی نامیهرەبانانە و ستەمکارانەو بێهەستی فاشییزم وچاودێری و بەرهەمهێنانو گەندەڵی ئەخلاقی و خودپەرستی سەرمایەداری" لەخۆی بێگانەبووە، قسەدەکاتو هاوار دەکات کە: "کار جەوهەری مرۆڤایەتیەو سەرمایەداریش بەشێوەی کالایەکی ماددی دەری دەبرێتو بەپارە هەرزانی دەکاتو لە ئەنجامدا مرۆڤی کرێکار دەبێتە بەندەی سکی".

بەلام ئەم "ئاوازە عاریفانە" کاتێك کە لەسەر بنەمای بەرهەمهێنان، رەسەنایەتی ئامرازی بەرهەمهێنان، بنەرەتی ئابووری و بەتایبەت بەرنامە رێژی ئابووری هەموو کۆمەڵگە لە سۆشیالیزم خۆی قسەدەکات بەیەك "ئاوازی ماددی" دەگۆرێت.

لەلایەنی نەفی "مارکس"یزمیش، ستایشکردنی مرۆڤ تاکو ئەو جێگایەیە کە هەندێك وەکو ئارون، دوو ورژە و تەنانەت هانری لوفور -- بەگاڵتەو بەگرنگیش-- لە "مرۆڤگەراییەکی عاریفانە" لەبەرهەمە رەخنەگرەکان و فەلسەفیەکان ناویان هێناوە!

بوونگەرایی، لەراگەیاندنێکی فەلسەفی بەتەواوی سەرسوڕهێنەر لە دروستبوونی مرۆڤ، شتێکی جیا لەجیهاندا دەناسێنێت. بوونێك کە هیچ تایبەتمەندی و سیفەتێکی

دیاریکراوی لەلایەن خودایان سروشتەوە نیە، بەڵام خاوەنی توانای هەڵبژاردنە، چۆنیەتی خۆی لەخۆیدا دروست دەکاتو دادەهێنێت.

لە مەزهەبە گەورەکانی رۆژهەڵاتدا، مرۆڤ لەگەڵ خودای جیهان نزیکیەکی تایبەتی هەی، لە مەزهەبی زەردەشتدا، مرۆڤ هاودەست و هاوداستانی ئەهورامزدایەو تەنانەت لەشەڕی گەورەی بەدیهێناندا بۆ سەرکەوتنی چاکە لە بەرامبەر "انگرە منن و"و سوپاکانی یارمەتی دەدات. لە مەزهەبە عیرفانیەکاندا یەکێتی بوون _ولە کرۆك وناخی هەموو هیندوئیزم_ "خودا، مرۆڤ و عیشق هەرسێکیان لەکاروان تاکو جیهانی بوون سەر لەن وێ دروست بکەنەوە"! مرۆڤ و خودا لەم مەزهەبەدا بەجۆرێك تێکەڵ بەیەکتر بوون کە لێکهەڵوەشاندنی لۆژیکیان شتێکی مومکین نیە، بەو جۆرەی کە لەبەرهەمهێنانی سۆفیەکانی گەورەکاندا بەچاکی روون دەبێتەوە.

لە ئیسلامدا لەگەڵ ئەوەی کە دوریو ماوەی مرۆڤ تاکو خودای تا ناکۆتا دوور کردووە، دوری و ماوەی خودا تاکو مرۆڤی بەتەواوی نەهێشتووەو بەتەنها بوونەوەرێکی لە دروستکراوەکاندا ناساندووە کەخاوەنی رۆحی"خودا"یە و بەرپرسیاری"ئەمانەتی خودا" و دەبێت "سیفەتو خووی خودا بگرێت"([1])

ئێستا دەتوانرێت بنەڕەتیترین پایە جۆرییەکانی مرۆڤ لە مرۆڤگەراییەکدا کە جێگەی رێککەوتن بەم جۆرە وێنا بکرێت:

١- مرۆڤ بوونێکی بنەڕەتیە: واتە نێوان هەموو بوونەوەرە سروشتی و ئەودیو سروشتیەکان، خاوەنی"خودێکی سەربەخۆ"یە و خاوەنی"ناوەرۆکێکی جۆری بەرێز (Essence generigue)".

---

[1] تخلقوا باخلاق الله.

٢- مرۆ ئیرادەیەکی سەربەخۆ: ئەمە گەورەترین دەسەڵاتی لەرادەبەدەرە و راڤە ناکرێت کە لە مرۆڤدایە، مێژوو و کۆمەڵگەی شوێنکەوتەی رەهای خۆی کردووە، ئەو بەناونیشانی هۆکارێکی "سەرەتایی و سەربەخۆ" دێتە ناوەوە و کار دەکات و لەم زنجیرەیەك بەدوای یەکە جەبریەدا بەشداری دەکات.

"ئازادی" و "توانای هەڵبژاردن" کەدوو تایبەتمەندی ولقی سەرەکی بوونی ئەون، سیفەتی خودایی پێ بەخشیوە.

٣- مرۆڤ بوونەوەرێکی ئاگایە: ئەمە دیارترین ودەرکەوتووترین سیفەتی دیاری مرۆڤە. ئاگایی بەو مانایەی کە بە توانایەکی سەرسوڕهێنەرەو موعجیزە ئاسای "بیرکردنەوە"، لە واقیعیەتی جیهانی دەرەوە تێدەگات، شتە پەنهانە داپۆشراوەکان لە "هەست"ەکانەوە ئاشکرا دەکات دەتوانێت و هەر واقیعیەتێك یاخود چەند واقیعیەتێك شیبکاتەوەو شتیەڵیا بکات و لە ئاستی "هۆکارو هەستەکان"دا نەمێنێتەوەو پەی بەئەو دیوو شتە هەستپێکراوەکان ببات و لەرووی هۆکارەوە بەرەو هۆ بڕواتو بەڵگە بهێنێتەوە و بەم جۆرە هەم سنورداری هەستی خۆی بشکێنێتو هەم سنورداری کاتی خۆی بەرەو رابردوو و ئایندەی کەخۆی لەوێ ئامادەنیەو فراوانی بکات و وێنای دروست و فراوان و قوڵی لە ژینگە ودەوروبەری خۆیەوە بەدەست بهێنێت. بەگوتەی "باسکاڵ":

"مرۆڤ دەزوویەکی لاوازە زیاتر خۆیان ببەستن بۆ کوشتنی، جارێکی دی لە هەموو جیهان بەرێزترە چونکە جیهان لەوەی کە مرۆڤ لەناو دەبات. بەئاگانیە، بەڵام مرۆڤ دەزانێت کە لە ناودەچێت."

واتە، ئاگایی جەوهەرێکی سەرووترە لە "بوون"!

٤- مرۆڤ بوونەوەرێکی خود ئاگایە: واتە تەنها بوونەوەرێکی زیندووە کەسەبارەت بەخودی خۆی، زانستی ئامادەی هەیە.

دەتوانین خۆی بەناونیشانی بوونەوەرێکی سەربەخۆ لەخۆی، بخاتە ژێر توێژینەوەوە، شیکردنەوەو شیتەڵکاری بکات، بناسێت، هەڵسەنگێنێت و لەئەنجامدا گۆڕان دروست بکات.

"تایین بی"، فەیلەسوفی گەورەی مێژوو لەم سەردەمەدا دەڵێت: "شارستانیەتی ئەمڕۆی مرۆڤایەتی بەباڵاترین و بەرزترین قۆناغی تەواوکاری مێژوویی خۆی گەیشتووە، چونکە تەنها شارستانیەتی ئەمڕۆیە کە خۆی دەزانێت بەرەو لەناوچوونە."!

٥- مرۆڤ بوونەوەرێکی داهێنەرە: ئەم داهێنان و دروستکردنە کە لە گەڵ کاریدا تێکەڵ بووە، بەتەواوی لە بەرامبەر سروشتدا دایدەنێت و لەکەناری خوادا ئەم داهێنانەی کردۆتە خاوەنی ئەم توانا ودەسەڵاتە لەڕادەبەدەرە گەورەیەکە بتوانێت لەپێوانەو ئەندازە سروشتیەکانی بوون و توانا سنوردارەکانی خۆی زیاتر بڕوات، هەروەها سەرسوڕهێنەری و توانایەکی بێ سنوری بوون (وجودی) دەبەخشێت و ئەوەی کە سروشت پێی نەداوە بەدەستی بهێنێت.

هەر ئەم توانایەی ناوەکیەش لەدەرەوەی سروشت وای لێدەکات ئەوەی کەدەیەوێت و لەسروشتدا بوونی نیە دروستی بکات. بەم جۆرەیە کە لە توانای داهێنانی خۆی، لەیەکەمین قۆناغدا ئامێر دروست دەکات و لەقۆناغی دووەمیندا هونەر دابهێنێت.

٦- مرۆڤ بوونەوەرێکی ئامانج خواز یاخود ئایدیا پەرستە: بەو مانایەی کە هەرگیز لە بەرامبەری"ئەوەی کەهەیە" ناوەستێت وخۆ بەدەستەوە نادات وهەوڵدەدات ئەوە

بەشێوەی"ئەوەی دەبێت ببێت" بگۆڕێت ولەم ڕووەوەیە کە هەمیشە هونەرمەندی دەکات و لەم ڕوەشەوەیە کە بەشێوەی تەنها بوونەوەرێك خۆی دەنوێنێت کە نەك دروست بووی ژینگە، بەڵکو دروستەکەری ژینگەیە و لەدەستەواژەیەکدا "ئایدیای" خۆی هەمیشە بە"واقیعەت"دا جێبەجێ دەکاتو بەم جۆرە یەکە نەك تەنها هەمیشە لە حاڵی جووڵە و گۆڕانو لەحاڵەتی جووڵەدا بەرەو تەواوی و تەواوکاری (کمال)، بەڵکو بەپێچەوانەی خۆی، خودی خۆی دیاری دەکات و پێشتر سەبارەت بەو ڕێڕەو و ڕێگوزەرە ئاگایی هەیە.

ئامانج خوازی گەورەترین هۆکاری جوڵەو تەواوکاری مرۆڤە و وای لێدەکات کە هەرگیز لە سنوری سنوردا و جێگیری"ئەو واقیعەی کە هەیە" _ لەسروشت و لە ژیان _ دانەنیشێتو هەر ئەم هێزەشە کەهەمیشە وای لێدەکات بەرەو بیرکردنەوە، کەشفکردن، گونجاوی، دۆزینەوەی ڕاستی، داهێنان و دروستکردنی ماددی و مەعنەوی بەرێت. پیشەسازی، هونەر، ئەدەبیات، و هەموو فەرهەنگی دەوڵەمەندی مرۆیی شوێنی دەرکەوتنی ڕۆحی گەڕان بەدوای ئایدیای ئەم بوونەوەرەیە کە هەرگیز ڕازی نیە لە بەرامبەر ئەو دۆخەی کە جیهان بۆی ئامادە کردووە.

٧-مرۆڤ بوونەوەرێکی ئەخلاقیە: لێرەدا باسی بەها "Value" دێتە پێشەوە.

بەها، بریتیەلە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و "دیاردەیەك"، "ڕەفتارێك" یان "کردارێك" و"حاڵەتێك" کە تیایدا ئەنگیزەیەکی گەورەتر لە"سوود" (utilite) دەخرێتە ڕوو ولەم ڕووەوەیە کەدەتوانرێت ناوی جۆرێك "پەیوەندی پیرۆز"ی لێ بنرێت کە لە گەڵ "حکومەت وپەرستن" تێکەڵە ، تاکو ئەو جێگەیەی کە لەم بەختکردنی هەست پێ دەکات.

بــەڵام لەهەمانکاتــدا، ئــەوەی کــە شــایەنی زۆر تێڕامانــە، ئەوەیــە کــەلێرەدا "ئاراستەکردنە" هەرگیز ناتوانێت "ئاراستەکردنێکی سروشتی، زانستیو عەقڵی" بێـتو لەم حاڵەتەدا، ئەم هەستە بەناونیـشانی بـاڵاترین جیلـوەی بـوون "وجـودی"ی جـۆری مرۆڤ، بەدرێـژایی مێـژوو و لـە هـەموو مەزهەبـەکانو فەرهەنگـەکان دانـی پێـدادەنرێتو خۆشەویسترین سەرمایەو پرشکۆمەندترین سـەرکەوتنەکانو گرانبـەهاترین عیـشقەکانو رووداوەکان و رێزو حورمەتەکان لە فەرهەنگی هەرمیللەت و مەزهەبێك هەیـە فەرهـەنگی گەورەی مرۆیی دروست دەکات.

لـەو مرۆڤانـەی کـە ژیـانی مـاددی خۆیـان لـە رێگـەی ئـەدەبو هونـەرەو زانـستدا فەرامۆشکردووە، تـاکو شـەهیدانی مەزهەبـەکان، تێکۆشـەرانی حەقیقـەتو قارەمانـانی گەورەی میللەتەکان، لە مرۆڤێك کە ژیانی هاوسەرگیری خـۆی"خۆشەویـستنی" بەسـەر "بەرژەوەندیدا هەڵبژاردووە، تاکو مرۆڤێك کە لـە بەرامبـەر بیروبـاوەڕی میللـەت یـاخود مرۆڤایـەتی، چـاوی لەعیـشقی تـاکی خـۆی پۆشـیوەو تەنانـەت لـەخودی خـۆی ئەمانـە هەموویان داهێنەران و دروستکەرانی"بەها" مرۆییەکانن لە ژیانی مرۆڤەکاندا.

"بــەها" و"ســوود" دوو گوتــەزای دژیــەکن و ئــەوەی کــە مــرۆڤ بەناونیــشانی "بوونەوەرێکی نامادی" لە هەموو بوونەوەرانی دیکـەی سروشـت "سـەربەخۆیی هـاوڕا لەگەڵ سەرووتری ناوەڕۆك" دەبەخشێت "بەهاپەرستی بێ مەبەستی" مرۆڤە.

بەهاکان لەسروشتدا بوونیان نیە، لەماددەدا، شتی دەرەکیو بینینی دەرەکیان نیـە، لەبەرئەوە، واقیعەتگەرایی ناتوانێت دان بە "بەها" دابنێت، چونکە ئەگەر مرۆڤ نـەبێت، بەهاکانیش بوونیان نیە، لێرەدا بـەو ئەنجامـە کۆتـاو ناچارییە دەگـەین کـە "کەواتـە، بەهاکان لە ناخی مرۆڤەکانـەوە سـەر دەرهێـنن، لەبەرئـەوە گوتـەزای ئایـدیالین یـاخود

دەرونین‌و بیان بەناخەوە هەیە" لێرەدایە واقیعیەتگەراکان ناچار دەبێت، ئینکاریـان بکەن. بەلام چۆن دەتوانرێت بالاترین جیلوەکانی بوونی جۆری مرۆڤ رەد بکرێتەوە؟

هەڵبەتە کارێکی دژوارە و لە هەمانکاتـدا ترسـناکو شـەرم هێنـەرە، بـەلام کەسێکی واقیعیەتگەرا چۆن دەتوانێت ئەوەبسەلمێنێت؟ بەبێ ئـەوەی کـەدان بـە"پێشکەوتنی مرۆڤ بەسەر واقیعیەتی ماددی، یاخود پێشکەوتنی هزری بەسەر دیارو بەرچاودا" بنێـت و ئەمەش خودی ئینکاریکردنی واقیعیەتی.

بەلام فەیلەسوفەکانی واقیعیەتگەرایی، وەکو ماددیگەراکان و سرشتگەراکان کە تەنها بەبیرکردنەوەی فەلسەفی و زانستی خۆیان لـە کۆمەڵناسـی و دەروونناسـی و مرۆڤناسـی پشت دەبەستن، لەئینکاریکردنی بەهاکان زۆر گومانیان نیەو بەشێوەی خورافاتو وەهم و چاولێکەری بۆمـاوەی یـان بۆنـەی هەمیـشەیی کۆمەلایـەتی کـە لـە شـێوەی ژیـانی ماددیەوە سەرهەڵدەدات، یان حاڵەگەرایی سۆزداری کە لە پێکهاتـەی ژیـان (بـایۆلۆژی) ئـەم "ئاژەڵـە قـسەکەرە"! سەرچـاوە دەگرێـت. سـەرنج دەدەن و بەشـیکردنەوەو بەشبەشکردنی نامیهرەبانانەو ووشکی"شێوە زانستی" حورمەت و پـیرۆزی و فەزیلـەتی خودی ئەو شتانە تێکدەدەن و هـەروەك "پـەتێکی زینـدوو وناسـكو نـەرمی جووڵـە"بـۆ ماددەی مردوو و توخمە سەرەتاییەکانی خاك شیدەکەنەوە.

بەلام "مارکس"یزم لێرەدا، دووچاری لاوازترین‌و خراپترین دۆخێك بووە کـە مومکینـە ئایدۆلۆژیایەکیش دووچاری ببێت.

چـونکە لەلایەکـەوە "مـارکس" تـەنها ماددیگەرایـەکی فەلـسەفی نیـە کـە وەکـو "سارتەر" بڵێت: "هەر شتێکت لەحاڵەتی ئازادی وئیختیـار یـاخود نیازیـاکی هەڵبـژارد، ئەوە هەمان ئەو شتە ئەرزش و بەها و چاکەیە." هەرچەند خراپ و پەست و نـزم بێـت. چونکە "مارکس" ئایدۆلۆژیەکی کۆمەلایەتیە کە تەنانەت تاکو سنوری رێبـەری سیاسـی

پرۆلیتاری سەردەمی خۆیو دروستکردنی حیزبێک، لە "قۆناغی کارکردن"دا پێشکەوتووە و لەبەرئەوە خاوەن بانگەوازێکی دیاریکراوەو بەپێچەوانەی "سارتەر" دەڵێت: "دەبێت چ شتانێك هەڵبژێری و تەنانەت لەسەرووی ئەوەشەوە، لە بەرامبەریاندا بەرپرسیاریت هەیە و لە بەرامبەر ئەم بەرپرسیاریەتیانەش و بۆ هێنانەدی ئەم ئایدیا دیاریکراوانە هەوڵ بدەیت و فیداکار و خۆبەخش بێت.

واتە هەموو ئەنگیزە مادیەکان، نیازو پێداویستیە ئابووریەکان، کۆششەکانی غەریزەو سوودە مادیەکان و کەسیەتیەکانی خۆت و تەنانەت بوونی خۆت لەم ڕێگایەدا ببەخشیت.

لەبەرئەوە، بێگومان دەیەوێت قسە لەسەر کۆمەڵێك لە "بەهاکان" بکات، بەهاگەلێك پێچەوانەی سەروو بوونی مادی مرۆڤ.

تەنانەت لەو جێگەیەی کە قسە لەسەر سیستەمی سەرمایەداریو دەروونناسی بورجوازی دەکات، بەو ناونیشانە قسەدەکات کە بەها بوونیەکانی مرۆڤ لەگەڵ پارەدا هەڵدەسەنگێنێت و مرۆڤ لەڕووی ئەخلاقیەوە بەرەو نزمی ڕادەکێشێت یاخود "کۆمەڵگەیەکی گەندەڵی" دروست دەکات، ئەوا پشت و پەناگەی سەرەکی لە "بەها ئەخلاقیەکان"ەوە دادەمەزرێنێت.

بەڵام کاتێك کە بنەمای فیکری خۆی دەردەبڕێت قسە لەماتریالیزمی دیالکتیك دەکات بەجۆرێکی دەمارگیرانە هەوڵدەدات تاکو بەرامبەر بەواقیعیەتگەرا خۆی وەفادار پیشان بدات و هەر شتێك کەتەنها لە ئاراستەی مادی و بایۆلۆژی زانستی سروشتیدا دەگونجێت بەراستی بزانێت و بەهامرۆییەکان بەهەمان شێوەی بێ بنەماو پایەو بێ بەها شیدەکاتەوە وەکو مادیگەراکانو زیرترین واقیعیەتگەراکان!

"مـاركس" به‌شـانازی لـه‌و فـێڵ زانسـتیه‌ی كـه‌لێره‌دا بـۆ پاراسـتنی حورمـه‌تی مـرۆڤ بـه‌كاری هێنـاوه‌، له‌چـه‌ندین شـوێندا ئـه‌وه‌ی دووبـاره‌ كردۆته‌وه‌كـه‌: دیالكتیـك، مـرۆڤ به‌وجۆره‌ نیـه‌ كـه‌ سروشـتگه‌راكان و مادیگـه‌راكانی تـر "شـتێكی جێگیری مادیـان" له‌جیهانێكی سه‌یاره‌و ته‌كنه‌لۆژیا بـاس ده‌كـرد، بـه‌ڵكو مـرۆڤ بـه‌ "بوونـه‌وه‌رێك لـه‌حاڵی بوونی ته‌واوكاری"دا ناسێنێت كه‌ به‌ دیالكتیكی مێژوویی له‌ جووڵه‌دایه‌.

به‌م شێوه‌یه‌، "ماركس" مرۆڤ له‌سروشته‌وه‌ به‌ره‌و "مێژوو" ده‌گوازێته‌وه‌، بـه‌ڵام لـه‌م گه‌یشتن به‌پله‌یه‌دا، مرۆڤ هیچ رێزو حورمه‌تێكی بنه‌ڕه‌تی جه‌وهه‌ری په‌یدا ناكات، چونكه‌ مێـژووش به‌گوتـه‌ی "مـاركس": "بـه‌دوای جووڵـه‌ی سروشـتی مـادیی" یه‌وه‌یـه‌ مـرۆڤ، له‌جێگای مێژوویی خۆیشیدا،له‌ شیكردنه‌وه‌ی كۆتـایی، به‌هـه‌مان سروشـتی ته‌كنـه‌لۆژی سروشتگه‌راكان به‌ره‌و دواوه‌ بگه‌ڕێتـه‌وه‌ و به‌شـێوه‌ی"شـتێكی مـادیی" ده‌رده‌كـه‌وێ و به‌م جۆره‌ هه‌موو ئه‌و به‌هایانه‌ی كه‌"ماركس" له‌"پلـه‌و پایـه‌ی كۆمه‌ڵایـه‌تی" ده‌یانكـات به‌خه‌ڵات بۆی به‌ده‌ستی دیالكتیك مادیگه‌را لێی وه‌رده‌گرێته‌وه‌.

ئه‌مه‌یـه‌ كـه‌ ده‌بێـت لێـره‌دا ئـه‌م گوتـه‌ پرمانایـه‌ی شـاندل بهێنینـه‌وه‌ كـه‌ده‌ڵێت: "ماركس" فه‌یله‌سـوف، هـه‌موو بـه‌ها جه‌وهه‌رییـه‌كانی مـرۆڤ ده‌خاتـه‌ ژێرپـێ ی جـه‌بری كـوێری دیـالكتیكی مـادیی، بـه‌ڵام "مـاركس" سیاسـه‌تمدارو رابـه‌ر بـه‌ گـه‌رموگوڕترین ستایشه‌كان له‌م به‌هایانه‌، مرۆڤ بۆ ده‌سه‌ڵات وسه‌ركه‌وتن ئاماده‌ ده‌كات."

ئایا ئه‌م پشت به‌ستنه‌ له‌سه‌ر به‌هاكان كـه‌باوه‌ڕتان وایـه‌ بنـه‌ماو بنـه‌ڕه‌تیان نیـه‌، بۆ گه‌یشتن به‌ سه‌ركه‌وتن نین؟ له‌م كاته‌دا، ئه‌مه‌ روونترین جۆری فێڵبازی سیاسیه‌.

به‌ هه‌ر حاڵ، له‌ كۆی قسه‌ بنه‌ڕه‌تی‌و ئه‌وانه‌ی كه‌جێگه‌ی رێككه‌وتنی ئه‌م چوار بزاوته‌ فیكری و هزریه‌ن كه‌ به‌سه‌ر جیهاندا زاڵن، ده‌توانرێت ئه‌م پێناسه‌یه‌ ده‌ربهێنرێت:—

مرۆڤ بوونەوەرێکی بنەڕەتی و ڕەسەنە لەجیهانی سروشتدا کەجەوهەری تایبەتی خۆی هەیەو بەدیهێنراو یان دیاردەیەکی ئاراوتەو بەڕێزە کە لەبەرئەوەی خاوەنی ئیرادەیە، بەناونیشانی هۆکارێکی سەربەخۆ لەسروشتدا کاریگەری هەیەو توانای هەڵبژاردنی هەیە و لە دروستکردنی چارەنووسی خۆیدا _دەست لەچارەنووسی سروشتی _ خۆی هەیەو ئەم تواناو دەسەڵاتە، بۆئەو پەیمان یان بەر پرسیاریەتی دەهێنێت و ئەمەش مانای نیە، مەگەر ئەوەی لەدوو توێی سیستەمێك لە "بەهاکان" بخرێتە روو.

لە هەمانکاتدا، مرۆڤ بوونەوەرێکی ئامانجخوازە و هەوڵدەدات تاکو "واقیعیەت" لەرووی"حەقیقەت"ەوە، یاخود "ئەوەی هەیە" بەرەو "ئەوەی دەبێت ببێت" _ هەم لەسروشت و هەم لە کۆمەڵگەو هەم لەخودی خۆیدا_ بگۆڕێت و ئەم گۆڕینەش تیایدا، جووڵە بەرەو تەواوکاری دابین دەکات و هەروەها بوونەوەرێکە کە "کاری خۆی" بەشێوەی دەسەڵاتێکی دژی سروشت جیلوە دەکات، چونکە بەم هۆیەوە "هەم سروشتی جیهان" و هەم سروشتی"خۆی" جارێکی دی دروست دەکاتەوە. لەبەرئەوەی توانای داهێنانی هەیە، بەدروستکردن هەم سروشتی فراوان دەکاتو هەم خودی خۆی، بەم جۆرە بەدروستکردنی جوانی، هونەر وئەدەبیات، بەجیهانی ماددی ئەوەی کەنیەتی، دەبەخشێت و هەم بەدروستکردنی پیشەسازی، توانا بۆ خودی خۆی ئاسانتر و هەرزانتر دەکات کە سروشت پێی نەداوە.

لەهەمانکاتدا، بوونەوەرێکە کە بیردەکاتەوە و بەم ئامادەگیە ئەو دیوە ماددەوە هەم بەسەر جیهاندا بەئاگا دەبێت و هەم بەسەر بوون و بەسەرەدۆخی مرۆیی خۆی لەجیهان، کۆمەڵگە و سەردەم ولەم ڕێگەیەوە، داوێنی بوونی بەرەو سەر رووی سنورەکانی بوونی ڕادەکێشێت وداوێنی ئەندێشەی قوڵی لە ئاستی دیاردە هەستیەکان سەرووتر دەڕوات و

لەبەرزاییدا لەسەربانی تەنگو تەسکی جیهان سەرووتر بەرز دەبێتەوە وعروج دەکات ولەوێدا کە "ژینگە" بۆئەوە کۆتایی پێ دێت، ئەو درێژەی پێدەدات و ئەم "بەرزبوونەوەی بوونە" لە مرۆڤدا ناکۆتایە.

دواجار، مرۆڤ جەوهەرو ناوەڕۆکێکی پیرۆزی هەیە کە لەو پیرۆزی روانین بوونی هەیە کە پەرستنیان بالاترین دەرکەوتنی لەرادەی بێسنوور و سەروو لۆژیك بوونی ئەوەو کۆی ئەمەش "بەها مرۆییەکان" پێك دەهێنێت، بەها گەلێك کە عیشقەکان، پەرستشەکان و خۆبەخشەکانی مێژوو بەم جۆرە دروستی کردوون کە هەموو سەرمایەی مەعنەوی وشانازی مرۆڤایەتی دروست دەکات و ئەوانەش "چەمکی" پیرۆزن کە هەر چەندە "راستیەتی" گۆڕاویان هەیە، بەلام نەمرو رەهان و تەنها بە ئەویتربوونی جۆری مرۆڤ یاخود لەناوچوونی، دەگۆڕێن.

""نیچە"، فەیلەسوفی گەورە، لەبەر خاتری رزگارکردنی ئەسپێکی بارهەلگر، گیانی بەخشی"! عەقلی ماددی ئەم کارەی نەك تەنها بەبێهودە، بەلکو بەزیانگەێنەرو تاوانبار بوون دەژمێرێت. چونکە لێرەدا بلیمەتێك لە بەرامبەر "ئاژەلێکی" لەدەست چووە و مردووە.

بەلام لەجەوهەرو ناوەڕۆکی سەرسوڕهێنەری مرۆڤ، توخمێکی سەرووتری حیرەت هێنەر هەیە کە لە بەرامبەر ئەم رووداوە، بەحالەتێکی چاکەویستی و پڕ لەگەرموگوڕو جووڵە ستایشو دەستخۆشیو پیرۆزی دەکاتو ورێز لەم "مامەلەیە" دەگرێت و بەهاکانی زۆری بۆ دادەنێت، چونکە ""نیچە"، بە فیداکردنی خۆی، بەهایەکی دروستکردووەو بەدیهێناوە" بەهایەکی ئەخلاقی کە لە بەهای بوونی جەستەیەك _تەنانەت بلیمەتێك _ زیاتر و مەزنترە.

ئەوەی کە بڕیارێك و ئەنگێزەیەکی لەم جۆرە لە مرۆڤدا دروست دەکات، لایەنی ئەودیوی بوونی مرۆڤە کە ماددیگەری و ماددیگەری دیالکتیك، بەئینکاریکردنی مرۆڤیان نەفی کردووەو بەدان پیانانی خۆیان نەفی کردووە.!

## کارەساتە نوێیەکان:

ئەو کارەساتە نوێیانەی کەدەبنە هۆی داڕووخان و سڕینەوەی مرۆڤ دەتوانرێت بەدوو کۆمەڵەی گشت دابەش بکرێت:

یەکەم: سیستەمە کۆمەڵایەتیەکان.

دووەم: سیستەمە فیکرییەکان.

لە نێوان دوو سیستەمی کۆمەڵایەتی بەرووکەش دژ کە مرۆڤی نوێ وەریگرتوون یاخود بانگەشەی ئەوە دەکات پەیڕەو بکرێت، ئەوەی کە بەڕوونی هەستپێکراوە، کارەساتی فەرامۆشکردنی مرۆڤە بەناونیشانی خودێکی بنەڕەتی و سەرەکی نامادی.

هەردوو سیستەمی کۆمەڵایەتی سەرمایەداری و کۆمۆنیزم، _هەرچەندە لە شێوەی جیاوازدا_ مرۆڤ بەناونیشانی "ئاژەڵێکی ئابووری" دەخەنەروو و جیاوازی شێوازو شێوەکەش لەمەدایە کەکام یەك لەم دووانە لەدابینکردنی پێویستیەکانی ئەم ئاژەلەسەرکەوتووترن.

سیستەمی ئابووری ڕێگەی فەلسەفەی ژیانە لە کۆمەڵگەی سەرمایەداری پیشەسازی رۆژئاوا کە تیایدا بەگوتەی "فرانسیس بیکن": (زانست گەڕان بەدوای حەقیقەت رەها دەکات و وازی لێدەهێنێت و بەدوای توانا و دەسەلاتدا دەگەڕێت)! پێداویستیە ماددییەکان کە رۆژانە لەدایك دەبن و بەشێوەیەك بەرز بوونەوە زیاد دەکەن تاکو داوی بەکارهێنان هەم لەرووی برو هەم لەرووی چۆنیەتی و جۆرایەتی فراوان بکات و بەم جۆرە

سوودی ماددی دەزگا گەورە بەرهەمهێنەرەکان کەسەر سامهێنەر دەسوڕێنەوە، زیاتر بکەن و مرۆڤەکان بکەنە شێوەی بوونەوەری مەسرەف پەرستو بەکارهێنەر باری قورسی هەوڵو کۆششی ململانێ هێنەر ڕۆژانە زیاتر و زیاتر بیخەنە سەرشانی تاکەکان مرۆڤ. بەو جۆرەی کەتەنانەت موعجیزەی سەیارەو تەکنەلۆژیای نوێ _کە دەبێت مرۆڤ لە کۆت وبەند لەکاری ماددی رزگار بکات و کاتە بێ کارییەکانی زیاد بکات_ هیچ کارێکی بۆنەکراو هیچی بەرەو پێش نەبرد و خێرایی بەرهەمهێنانی پێداویستیە جوانکاریو رازێنەرەوە ماددییەکان لەخێرایی لەڕادەبەدەری تەکنەلۆژیای بەرهەمهێنانی زیاتر بووە و مرۆڤ لە نێوان ئەم سەرسامیە جەبرییەی خێراییی، هەر ڕۆژ مەحکومترو زیاتر نوقم دەبێتو لەخۆی زیاتر بێگانە دەبێت و نەك تەنها ئیدی، بوارێك بۆگەشەی بەها مەعنەوىو ریزی ئەخلاقی وهەڵهاتنی ئامادەگی و توانا پیرۆزەکانی بوونی نیە، بەڵکو سەراپا نوقم بوون لەهەوڵدان بۆ بەکارهێنانی ماددی و بەکارهێنان بۆ هەوڵو کۆششی ماددی و ڕۆچوون لەپێشبڕکێیەکی شێت ئامێز لە جوانکاریو رازاندنەوە، بەها سوننەتیە ئەخلاقیەکانی وەستاندووەو بەرەولەناوچوونی بردوون.

لە کۆمەڵگەی کۆمۆنیستیشدا چەماوەی جووڵەی ئەخلاقی مرۆڤ بەم جۆرەیە، زۆرێك لەرۆشنبیران، بەهۆی دژیەکی سیاسی وجیاوازی سیستەمی ئابووری لە نێوان کۆمەڵگە کۆمۆنیستیەکان و سەرمایەدارەکان، لەرووی مرۆڤناسی و فەلسەفەی ژیان و مرۆڤگەراییەوە، حیسابی کۆمەڵگە کۆمۆنیستیەکان لە کۆمەڵگە سەرمایەدارەکانی رۆژئاوا جیادەکەنەوە. لە کاتێکدا بەروونی دەبینین کە کۆمەڵگە کۆمۆنیستیەکان، بەو رادەیەی کە بەقۆناغی تارادەیەك پێشکەوتوو لەگەشەی ئابووری دەڕۆن، لەرووی رەفتاری کۆمەڵایەتی، دەروونناسی گشتی، جیهانبینی دوانەیی و فەلسەفەی ژیانو خوو و نەریتی مرۆیی لێکچوونێکی نزیك لەگەڵ مرۆڤی بورجوازی رۆژئاوا دەدۆزنەوەو ئەوەی ئەمڕۆ بەناوی فورالیزم و بۆورجوازو تەنانەت لیبرالیزم لە کۆمەڵگە کۆمۆنیستیەکاندا

دەخرێتە روو، جگە لە رووکردنە رووی مرۆڤی رۆژئاوا شتێکی دی نیەو سەرنجدانی و بەتوندی رووکرنە جوانی پەرستی و جوانکاری کەنەك تەنها لە ژیانی تاکدا، بەڵکو لە سیستەمی بەرهەمهێنانی دەوڵەتیشدا بڵاوبۆتەوە، بەهۆی ئەم بنەڕەتە بنەمایەشەوە کە کۆمەڵگەی "مارکس"ی و کۆمەڵگەی سەرمایەداری دواجار بە کردار جۆرێك مرۆڤ دەخاتە بازاڕی مێژووی مرۆییەوە.

دیموکراسی و لیبراڵیزمی رۆژئاوایی _لەسەرووی ئەوەی ئەو پیرۆزکردنەی لەچەمکی هزری ئەم دووانە بوونی هەیە، بەکردار جگە لەبوارێکی ئازادو سەربەخۆ بۆ دەرکەوتنی هەرچی زیاتری رۆحێکی لەم جۆرە و مەیدانی تەختی هەرچی زیرترو توندترو خێراتری توانای گەڕان بەدوای سوودو قازانجدا کە بە سڕینەوەی مرۆڤ بۆ گۆڕینی بەئاژەڵێکی بەکارهێنەری ئابووری هەوڵیان خستۆتەگەڕ، شتێکی دی نیە.

هەر بەو جۆرەی کەسەرمایەداری دەوڵەتی – بەناوی سۆشیالیزم – و دیکتاتۆری دەوڵەتی بەناوی حوکمەتی پرۆلیتار –وداگیرکاری فیکری– بەناوی تاکە حیزبێك –و دەمارگیری ئابووری– بەناوی دیامات([1]) و دواجار، پشت بەستن لەسەر بنەمای ئامێرگەرایی و ئابووری– بەناوی گەیشتنی خێرا " زیادکردنی بەرهەمهێنان بۆ تێپەڕ بوون لەسۆشیالیزمەوە بەرەو ئابووری..."! کۆمەڵە شتێکن بەسەر رووی مرۆڤدا، بەناونیشانی"ئیرادەیەکی پیرۆزی ئازادو داهێنەر" دێنەخوارەوە و مرۆڤ بەشێوەی "شتێکی کۆمەڵایەتی" لە دەزگایەکی زبرو دەورەدراو، قاڵبرێژی دەکەن.

---

[1] دیامات: پلەی کەمی دیالکتیك وماتریالیزم کە لەرووی زاراوەوە بنەمای بیروباوەڕیەکە دەبێت پەروەردەو فێرکردنی وەچەکان، لێکۆڵینەوە زانستیەکان، ئەدەبیات وهونەر، فەلسەفە وتیۆرە زانستیەکانیش لەسەر ئەم بنەمایە رێك وهاوڕابن، واتە جۆرێك حکومەتی مەزهەبی، بەبێ مەزهەب!

دیارترین نموونەی"لە خوبێگانەی سیاسی و فیکری" یەکە "مارکس" دەربارەی مرۆڤی بورجوازی قسەی لەبارەوە دەکرد.

جۆری دووەم لە"کارە ساتە نوێیەکان" کارەساتە ئایدۆلۆژییەکانە.

لێرەدا ئایدۆلۆژیا بەمانایەکی فراوانتر بەکاری دەهێنین: ئایدۆلۆژیا جۆراوجۆرە نوێیەکان –کە بانگەشەی ئەوەدەکەن لەسەر بنەمای زانستی نوێ بوونیاد نراون– هەموو مرۆڤەکانی بەناونیشانی"رەسەنایەتیەك" نەفی دەکەن، تەنانەت ئەوانەش کە بەتوندی باس لە مرۆڤگەرایی دەکەن.

مێژووگەرایی –رەسەنایەتی مێژوو– گوزەرێکی جەبری ماددی لەمێژوو دەردەبڕن کە لە رێڕەوی خۆیدا، توخمێك بەداخوازی رێسا و یاسای جەبری جووڵەی مێژوویی، بەناوی مرۆڤ دروست دەکات، لەبەرئەوە، مێژووگەرایی لە شیکاری کۆتاییدا بەسنووردار کردنێکی ماددی دەگۆڕێت کە تیایدا مرۆڤ هیچ کارێکی نیە.

بایۆلۆژیزم –رەسەنێتی یاساو رێساکانی ژیانی سروشتی– دروست بەوجۆرە سەیری مرۆڤ دەکات کەئاژەڵێکە و تەنها نمرەیەك کەپێی دەبەخشێت ئەوەیەکە بەکۆتا ئەڵقەی زنجیرەی تەواوکاری بوونەوەرەکان دەژمێرێت وەگەرنا هەموو جیلوە مەعنەوی تایبەتمەندی تایبەتی مرۆڤ هەروەك ئارەزوو غەریزە سروشتیەکان تیایدا داخوازی حاڵەتی دەروونیە.!

سۆسیۆلۆژیزم –رەسەنێتی کۆمەڵناسی– مرۆڤ وەکو گیایەك دادەنێت کە لەکێڵگەی ژینگەی کۆمەڵایەتیدا دەڕوێت، بەو جۆرەی کە ئاو و هەواو خاك داخوازی ئەوەن و تەنها بەگۆڕینی ئەو کێڵگەیە کە بەرهەمە مرۆییەکانیش دەگۆڕێنو ئەو گۆڕانەش

بەداخوازی یاسای زانستی دەرەکی ودوور لەدەستی مرۆڤە، یاساگەلێك کە بەسەر مرۆڤ و تەنانەت بەسەر پێکهاتەو بوونیادیدا فەرمانڕەوان.

ئەگەر شتێك بۆ ئەم قوتابخانانە ماددیگەری و سروشتگەرایی زیاد بکەین کە مرۆڤ بەشتێکی ماددی یان گیانەوەرێکی سروشتی و بوونەوەرێکی بایۆلۆژی دەژمێرن وێنایەك لەکارەساتە بیروباوەڕییەکانی سەدەی ئێستا بەدەست دەهێنرێت.

لەم نێوەندەدا، "مارکس"یزم دۆخێکی پەرێشانی هەیە. ("مارکس") لەلایەکەوە ماددیگەرایە و لەبەرئەوە ناتوانێت مرۆڤ بەناونیشانی"بوونێك" جگە و لەتوخمێك لە سنوری جیهانی ماددیدا بەشتێکی دیکەی بزانێت. لەلایەکی ترەوە، لەنامەیەکیدا بۆ "ئەنگلس" پاش خوێندنەوەی بەرهەمەکانی "داروین" دەنوسێت: "من ئەم تیۆریایە بەناونیشانی پایەیەکی بایۆلۆژی فەلسەفەی مێژووی خۆم پێی رازی دەبم".

لەلایەکەوە، کۆمەڵناسیێکی زۆر رۆچوو و پەرگیر، بەجۆرێك لە بەرامبەر سروشتگەرا و مرۆڤگەرا سەربەخۆیی بەکۆمەڵگە دەبەخشێتو بەدابەشکردنی یەك لایەنەو دوابڕیارش بەژێر بنەماو سەربنەمایە، بەم جۆرەکە و بنەڕەت شێوەی بەرهەمهێنانی ئابووریە و سەرەوەش فەرهەنگو ئەخلاقو فەلسەفەو ئەدەبیات و هونەرو ئایدۆلۆژیا..." لەراستیدا، مرۆڤ بەبنەماو بنەڕەت هەژمار دەکات چونکە مرۆڤ جگە لەم کۆمەڵە توخمە شتێکی دی نیە. لەئەنجامدا مرۆڤ بەشێوەی لە دایکبوونی شێوەی بەرهەمهێنانی ماددی دێتە دەرەوە و لەبەرئەوەی شێوەی بەرهەمهێنانیش "ئامرازو ئامێری بەرهەمهێنان" دیاری دەکات لەشیکردنەوەی کۆتاییدا "رەسەنێتی مرۆڤ" لە"مارکس"یزمدا، لە "رەسەنێتی ئامێر" سەردەردەهێنێت، واتە: لە جیاتی - usteintialisme, Humanisme ! واتە نەك بەگوتەی ئیسلام کە مرۆڤ منداڵی ئادەمە، بەڵکو مرۆڤ منداڵی ئامێرە.!

بەڵام بەپێکەوە نووسان بەدیالکتیك و ماددیگەری، نەك تەنها تاجی سەرکەوتن ناخاتە سەر سەری مرۆڤ، بەڵکو جەبرێکی ماددی"Determintion"یش بەسەر چارەنووسی مێژوویی مرۆڤ فەرمانڕەوایی دەکات کە زنجیرێکی دیکەیە بەدەستی وپێی پراکیسەوە (praxis) و لەراستیدا، زنجیرکردنی ئیرادەی مرۆڤ کە لە جیهاندا دەیبەخشێت و پاشان کەوتنی مرۆڤ لەهەمان، ئەو جەبرەدا کە لە رابردوودا مەزهەبە خورافییەکان یان فەیلەسوفانو ووتەبێژانی وابەستە بەدەسەڵات بۆ مرۆڤیان هەڵکەندبوو.

ئەمە هەمان ئەو زنجیرەیە، کەدواجار لە جیاتی ئەوەی سەرەکەی تری بەئاسمانەوە بەستراو، بەزەوییەوە بەستراوە. لەبەرئەوە تاوانبارکردن نیە ئەگەر لێرەدا ناوی جۆرێك لە"فاناتیزم– fanatisme "[1] بەرین.

[1] فاناتیزم – fanatisme:– بەمانای دەمارگیرییە، راسترئەوەیە کە لە دەقەکەدا لەجیاتی ئەو ووشەیە فاتالیزم – fatalisme کەمانای جەبرگەری و جەبرگەرایی دەدات، بودایە. دواجار لەبەرئەوەی لەگواستنەوەی ووشەکاندا ودەستنووسەکان ویستراوە ئەمانەن بپارێزرێت، هەربۆیە هەر ئەو ووشە دانراوە. (نوسینگەی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی د. شەریعەتی)

## مرۆڤ لەهەڕەشەی سێ کارەساتدا:

نزمی سەرمایەداری

چەق بەستویی "مارکس"یزم

پوچی بوونگەرایی

## لەرابردووەوە تاکو ئێستا

دەبینین کارەساتی مرۆڤی ئەمرۆ، پیش هەمووشتێك "کارەساتێکی مرۆییە". بە ناونیشانی "جۆرێك" خراپ دەبێت، نەفی دەبێت، دەسڕێتەوە و تەنانەت وەکو پەیوەندی قۆزاخەی پەپولە یان کرم، دەبێتە قوربانی سەرکەوتنی هونەرمەندو هەوڵو کۆششی خۆی! لەمەش سەرسوڕهێنەرتر، مرۆڤ لە درێژایی ژیانیدا، بەزۆری قوربانی ئەندیچشەی خۆی بووە! ئارەزووی رزگاری لە "حالەتێکی مێژوویدا" دە بووەتە زنجیرسازی رابردووی و لەرێگەی ئومێد بەخشی رزگاری کەوتۆتەوە داوەوە.

مەزهەب –کە هەم عیشقێکی بەهێزەو هەم بانگکردنێکە بەرەو تەواو (کل) و رزگاری– پاش ئەوەی لەسەرچاوە زووڵاڵە یەکەمینیەکانیەوە هاتە دەرەوەو لەرێڕەوی مێژوودا کەوتە جووڵە، تامو ڕەنگو کاریگەری نەدەماو هێڵی رۆیشتن و جووڵەی هەمان ئەو دەسەڵات و تواناپانە دیاریانکردووە کە جڵەوی مێژوویان لە دەستدابووەو لەسەر "کاتی کۆمەڵایەتیدا" تێپەڕ بووبوون.

ئەمەیەکە لەچیندا، قوتابخانەی لائوتسو – لەسەرەتادا بانگەوازی بۆ رزگاربوون لە ژیانی دەستکردو عەقڵی بەشی و مەزهەبیەتی زبربوو کە مرۆڤی راستەقینە کۆت و بەند دەکەن و فیترەتی سروشتی مرۆڤ کە هەماهەنگی ناموسی سروشت (تائو Tao)ە، لایدەدات و پیسی دەکا –پاش ماوەیەك لەبەندایەتی خودایانی بێشومار– دەبێت کە مرۆڤیش لەرووی ئابووری هەم لەرووی هێزی عەقڵی بەرهەم دەهێنن و ژیانی مرۆڤ مەحکومی کۆمەڵێك ترس و پەیوەست بوونی ناکۆتا دەکەن.

"کنفوشیوس" بۆ رزگارکردنی خەڵکی خۆی لە کۆت و بەند ئەم هێزە وەهمیانە لەگەڵ ئەم خورافانەدا خەباتی کردو لە باوەشی وەهمەکان و قوربانیە درێژخایەنەکان و

ئەزرو پێداویستی و نیازی لاوازکەری مرۆڤ، مرۆڤی بۆ مێژوو و کۆمەڵگەو ژیانو عەقڵ هێنایەوە. و بنەڕەتی لی (li) بەناونیشانی بنەمای عەقڵی و ڕێساو یاسای لۆژیکی ژیانی کۆمەڵایەتی دانا. بەلام هەر ئەم بنەڕەتی لایەنانە بەشێوەی سوننەتگەرایی تەقلیدی وچاولێکەری چەق بەستوو ونەگۆر دەرکەوت کە هەر جۆرە جوڵە و گۆڕاوێکی جەمسەریدا لەجووڵە کەوتنو کەوتنە سەر بێدەنگی پارێزگارانەی دەمارگیرانەو بەووتەی کۆمەڵناسێك: "ئەگەر دەبینین کۆمەڵگەو شارستانیەتی چینی، لەماوەی (٢٥٠٠) دووهەزارو پێنج سەد ساڵ نەك داروخاو لەناوچوو و نەهاتە پێشەوە، بەڵکو جووڵەو براوێنێك ڕوویدا کە بوویەهۆی فەرمانڕەوایی عەقڵی پارێزگارانەو سوننەتی "کنفۆشیوس"!

مەزهەبی هیند کە عیرفانی زولالی مرۆیی لەگەڵ یەکتایی قوڵی مرۆڤ –سروش– خودای لەخۆیدا هەڵگرتبوو وە هەڵگیرسێنەری ڕۆح بووله جەستەی جیهاندا و هەروەها هێزی بەرزبوونەوەی مەعنەوی مرۆڤ بەکۆمەڵێك شتانی ترسناك لەخورافە گۆڕا کەتیایدا ژمارەیەك زۆر خودا هێرش دەکەنە سەر مرۆڤ و تەنانەت پاروویەك لەدەمی بەندە بێچارەکانیان دەرفێنێت و پاشان ئەوانەی کەخاوەنی پەیامی رزگاری (Muksha)و عیرفانی بەرزی ڕۆژهەلات (vidya) بوون لە بەرامبەر ڕۆحانیە سەرەکیەکاندا لەمەڕ چلەکێشانی وەهمیو مەرگبارو زەلیلیو بەندایەتیدا مەحکوم دەبن.

بوزا بۆ ڕزگارکردنی ئەوان هات و پەیرەوانی هیندی بۆ ڕزگار بوون و ئازاد بوون لە کۆت و بەندی پەرستشی خوداکان ئاسمان بانگ کرد. پەیرەوانی بوونە بوزاپەرست، بەوجۆرەی کە ئەمرۆ لەزمانی فارسیدا ووشەی"بت" کە –هەمان ئەو بوزایەیە– ناوی هەمیشەیی ترسناکترین شێوەکانی هاوەڵ بڕیاردان، واتە بت پەرستی یا idolarie دەژمێردرێت!

مەسیح رزگارکەری چاوەڕوانکراو بۆ رزگارکردنی مرۆڤ لە کۆت و بەندی ماددیەت وپەرستنی مەلاکانی یەهود، ئازادی مەزهەب لەخزمەتی بازرگان و نەژاد پەرستان و بەرقەرارکردنی ئاشتی و خۆشەویستی و رزگاری رۆح هات تاکو مرۆڤەکان لە کۆتی خورافاتی حاخام مەحکومە بەندایەتی داگیرکاری خاوەن دەسەلاتی قەیسەر رزگاربکات. بینیمان کە چۆن مەسیحیەت خودی خۆی بوویە جێنشینی و کڵێسای ڕۆم بوویە درێژەپێدەری سیستەمی ئیمپراتۆرو سیکۆلاستیك بنەمای مەعنەوی بورجوازی سەدەکانی ناوەراست وکوژەری عەقاڵی ئازادو گەشەی ئازادی و زانستی ئازادو مەزهەبی ئاشتی، خوێنێکی ڕژاند کەهیچ دەسەلاتێکی خوێن ڕێژ لەمێژوودا بەو خوێن رشتنە نەگەیشتووەو لەرووی مەعنەوی و ئەخلاقیەوە: "مرۆڤێك کەدەبوو هاوشێوەی خودابێت بەپێچەوانەوە، خودا بوویە شێوە مرۆڤ".

دواجار ئیسلام، کۆتا ئەڵقەی تەواوکاری ئایینەکانی مێژووکە بەدروشمی "یەکتایی و سەرکەوتن و رزگاری" هات، تاکو بەگوتەی ئەو سەربازە موسڵمانە "مرۆڤ لە نزمی زەوی بەرەو بەرزی ئاسمان، لەبەندایەتی یەکترەوە بۆ بەندایەتی خودای جیهان ولە ستەم وتاوانی ئایینەکان بۆ دادپەروەری ئیسلام بانگهێشت بکات." بینیمان چۆن گۆڕا بۆ جێنشینی عەرەب و هۆکاری فراوانی درندانە و پاشان هۆکاری فەرهەنگی بەهێز کە بەناوی فیقە و کەلام و تەسەووف و سیستەمی بورجوازی تورکانی سەلجوقی و مەغۆلی رووگەی دژە ئایینی پێ دەدات و مرۆڤی موسڵمانی لەزنجیرەی "قەدەر" بەند کردو رێگەی رزگاری و نەك بەیەکتاپەرستی، خوداپەرستی، کرداری چاك و زانست، بەڵکو لە چاولێکەری و نەزرو نیازی بۆماوەیی وسوننەتی یاخود راکردن لە واقیعیەت و کۆمەڵگە و ژیان و رەشبینی بەرامبەر بەمێژوو و پێشکەوتن و رزگاری ئەم جیهانەی مرۆڤ و سەرکوتکردنی هەموو کۆششەکان و ویستە فیترییەکانی مرۆڤ راڤە و تەفسیر دەکرد!

له هەنگاوێكی لەم جۆرەدا كەمەزهەب بەشێوەی هۆكاری دواكەوتنی پێشكەوتنی زانستی و كۆمەڵایەتی و هۆكاری پەژموردەیی گەشەی فیكریو رۆحی و ئیرادەی مرۆڤیو لێ هاتبوو و تەنها كۆمەڵێك تەشریفات، تابۆكانو خورافەكان مابوونەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتێكی گەورەو فەرمانڕەوا بەسەر میللەتەكان و ئەندێشەكان لەلایەن شوێنكەوتوانی سەرەكی خۆیەوە و لەناوەندی هەموو كڵێساو پاپ وڕێنسانس، بەناونیشانی دەركەوتنی رۆحی جوڵێنەرو بزوێنەری كۆمەڵگە، لە بەرامبەر رۆشنبیران — بەبەراورد لەگەڵ سەردەمی درەوشاوەی یۆنان و رۆحی كۆن وسەردەمی چەقبەستوبی سەردەمەكانی ناوەراست كەسەردەمی حكومەتی شوێنكەوتووە ئایینەكان بوو— بۆ رزگاركردنی خەڵكی خۆی بەناسیۆنالیزمی — لە بەرامبەر داگیركاری لاتینی پاپ— و بۆ رزگاری مرۆڤ بەزانست— لە بەرامبەر كەلامی چەقبەستوو و خەیاڵی كاسۆلیك— بانگەوازییان دەكرد.

دروشم چی بوو؟ ئازاردی مرۆڤ لە كۆتو بەندی ئیرادەی جەبری ئاسمان، رزگاری عەقڵ لەفەرمانەكانی بیروباوەڕی ئایینی، رزگاری زانست لەدۆگمایی كەلام، گەڕانەوە لە ئاسمانەوە بۆ زەوی بۆ بیناكردنی بەهەشتێك لەسەر رووی خاك! كە ئایین لەدوارۆژدا بەڵێنی پێدەدا چ دروشم گەلێك سەرسوڕ هێنەرو بزرێنەر! ئازادی عەقڵ، رێبەرایەتی زانستو بەهەستی حازر!

بەهەشتی ئامادەو حازری سەر رووی زەوی دەبێت چ دەستانێك بوونیادی بنێن؟ داگیركاری میللەتەكان، بەرهەمهێنانی خەڵكی بەتواناو دەسەڵاتی سەیارە! واتە زانست و سەرمایە.

زانست لەخزمەتگوزارى ئاينى رزگارى بوو و دەستى بەخزمەتكردنى دەسەلات كردو چووە خزمەتى دەسەلاتدارى و گۆرا بەزانستگەراييەكى كورت بيرو چەقبەستوو و"مەسيح"ى كوشت، بەلام خۆى بوويە ياريدەدەرى قەيسەر.

ئۆتۆمبيل كە ئاميرو و ئامرازى دەستى مرۆڤ بوو تاكو بەسەر سروشتدا زاڵى بكات و لەبەندايەتى كار رزگارى بكات، گۆرا بە تەكنەلۆژياگەرايى و مرۆڤى كۆت و بەندكرد.

دواجار ئەم بەهەشتە، سەرمايەدارى، بەلام سەرمايەداريەك پرچەك بە زانست و پرچەك بەتەكنەلۆژياى جادوگەرى نوێو كۆت و بەندى نوێى مرۆڤ لەلاى ئاميرى نامیهرەبان و سەختى تەكنەلۆژيا وحكومەتى تەكنۆبورۆكراتيزم بێ هەست و سۆزو مرۆڤ؟ ئاژەڵێكى ئابوورى كە لەم بەهەشتەدا دەبێت تەنها بنەخشێنێت، فەلسەفەى مەسرەف و مەسرەف و مەسرەف! و دروشم؟ ليبراليزم!! واتە "بێ كۆتو بەندى مرۆڤێك كە لە كۆتو بەندداية"! هەروەها ديموكراسى، واتە هەڵبژاردنى كەسانێك كە پێشتر چيەتى تۆيان هەڵبژاردووە!

ژيان؟ ماددى؟ ئەخلاقى؟ گەڕان بەدواى سوودو خودپەرستى، ئامانج؟ بەكارهێنان، فەلسەفەى ژيان؟ تێركردنى غەريزەكان، ئامانج؟ خۆشگوزەرانى و بەدەستهێنان... ئيمان؟ ئايديالّ؟ عيشق؟ماناى بوون؟ چەمكى مرۆڤ؟...هيچ!

بەلام ئادەم، لەبەهەشتى سەرزەويشدا سەركەشى كرد:

١- "ماركس"يزم

٢- بوونگەرايى!

## "مارکس"یزم

"مـارکس"یـزم: نـەفیکردنی سـەرمایەداری، نـەفیکردنی بەرهـەمهێنان، نـەفیکردنی دەوڵەت، نەفیکردنی پسپۆڕی و تایبەتمەندی، نەفیکردنی ئەخلاقی سوودخوازی...و لـە هەموویـشیان گـرنگتر، نـەفیکردنی کـۆت وبەنـدی مـرۆڤ و سـڕینەوەی حەقیقـەتی لـە سیستەمی کاری کۆمەڵایەتی و بەرهەمهێنان...عجبا! تەنانەت بینـاکردنی کۆمەڵگەیـەك کە تیایدا نەك تەنها " هەر کەسێك بەئەندازەی ئەو کـارەی کـە دەیکـات" بـەڵکو "هـەر کەسێك بەو ئەندازەیەی کە پێویستیەتی"!

یانی چی؟

واتە: بەرامبەری و یەکسانی ڕەهای مرۆڤەکان! واتـە بـاڵاتر لەگەیـشتن هـەر کەسـێك بەمافی خۆی، بەڵکو پەیمانیدان بەکۆمەڵگەیەك کە تیایـدا هەمووکەسـێك زیـاتر لـەمافی خۆی بەردەکەوێت!

خەوێك!؟ یۆتۆپیایەك؟ نـەخێر! ئـەمجارە نەمەزهەبـە کەقسە لەبەهەشت دەکـاتو نەفەلسەفەیە کـە"شـاری خـەو یـاڵی" دروسـت دەکـات و تەنانـەت ئایـدۆلۆژیاکانو نـە سۆسیۆلۆژیا ئەخلاقی یاخود یۆتۆپیەکانن. بەڵکو ئەمجارە "فەلسەفەی زانستی"قسەی لەبارەوە دەکات.

دەبێت چ دەستانێك یان چ دەستێك کۆمەڵگەیەکی غوونەیی دروست بکات؟

"بیناکردن" نیـە، "دەبێـت بینـا"بکرێـت"، کەشـفکردنی ڕێـساو یاسـا جـەبری مێـژوو مۆژدەی هێنانەدی ئەم جەبرە دەدات! ئەو کرێکارانەی کە لە هەژاریو بەهرە کوشـتنی سیـستەمی سـەرمایەداریەوە هـاتوون و ڕۆشـنبیرانێك کـەدژی بەهەشـتی بورجـوازی سەرکەشیان کردو بیرمەندانێك کە بەدوای ئارەزووی ڕزگاری مرۆڤەوەن چیان دەوێت؟

ئەمجارە مرۆڤ لە جیاتی نەفیکردنو "نەهێشتنی دەوڵەت، دیکتاتۆری داگیرکار" لە جیاتی"کۆمەڵگەی ئازادو ئازادی کار" کۆمەڵگە سەراپا بەرنامە رێژکراوە لەسەرەوە کە تیایدا هەموو تاکەکان دادەنرێن، لە جیاتی نەفیکردنی"ماشینیزم" پشت بەستنێکی قورستر لەسەر "شۆڕشی خێرای پیشەسازی" لەسەر بنەمای ماشینزمی سەرمایەداری، لە جیاتی"ئازادی مرۆڤ بوروکراسی بورجوازی" کۆتو بەندی مرۆڤ لەبوروکراتیزم تاك لایەنەی دەوڵەت" لە جیاتی رزگاری لە"پارچەکردنی مرۆڤ لە تایبەتمەندی و پسپۆڕی" کە لە داخوازی زیاتری سەرمایەدارانەوە دێن، بەشبەشکردن لە پسپۆڕی زیاتر لە داخوازی زیاتری دەزگای فەرمانڕەوا. لە جیاتی رزگاری مرۆڤ لە "دامودەزگا ئیدارەی — ئابووری سەرمایەداری" بەندایەتیکردنی لە"کۆمەڵگەیەکی رێکخراو خاوەن دەزگادا"، لە جیاتی"گەشەی ئازادی مرۆڤ"، قاڵبرێژی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیو ئەخلاقی مرۆڤ و لە جیاتی"تەقلیدو بەندایەتی لە بەرامبەر کڵێسادا" چاولێکەری و بەندایەتی لە بەرامبەر "کۆیلەیەتی ئایدۆلۆژی" و لە جیاتی"نەفیکردنی کەسایەتی لەمێژوودا"، "پەرستنی رێبەران"...

لە دیدگای ئایدۆلۆژیەوە، کەوتنی مرۆڤگەرایی لەماددیگەری نزم و پەستی ئابووری، مرۆڤ رزگاری بووەولەئیرادەی خود ئاگاو هەستیارو پڕ لە جیلوەی باڵای فەرمانڕەوا بەسەر بووندا، ئێستا ئامرازی رەهای یاری کوێری جیدالێکی جەبری مێژوویی‌و دەستکردی بێئیرادەی دیالکتیکی مادی‌ی فەرمانڕەوا بەسەر بوونی مرۆڤدا!

دەبینین کە سەرمایەداری، مرۆڤێکی"بێ بەندوباو" لە"مارکس"یزم مرۆڤێك کە کۆتو بەند، لەوێ مرۆڤێکی"هەڵگەڕاوە"و لێرەدا مرۆڤ "لە قاڵب دراو"!

لەم دووانەش کامیان کارەساتبارتر!

**بوونگەرایی:**

بوونگەرایی دژی هەردووکیان سەرکەشی کرد، ئەندێشەی مرۆڤ دۆستیەکان کە هەمیشە لەگەڕان بەدوای رزگاری وسەربەخۆیی بوونی مرۆڤدا بوون، لەسەدەی هەژدەیەم و بەتایبەت سەدەی نۆزدەهەم لە بەرامبەر کارەساتی دژی مرۆڤی سەرمایەداری و تەکنەلۆیای ڕۆژئاوا هەستیان بەمەترسی کردووە چ بەشێوەی هەستیاری و ئەخلاقی و چ بەشێوەی شیکردنەوەی زانستی و لۆژیکی هێرشیان کردەسەر ولەم زەمینەیەدا ئەدەبیاتێکی دەوڵەمەند و زیندویان بەرهەمهێنا کە"مارکس"یزم توانی لەو ئەدەبیاتە خۆراکی خۆی بەتەواوی وەربگرێت بەو جۆرەی جەنابی "ریمون ئارون"، (R.Aron)باوەری وایە: ""مارکس"یزم جگەلە دانانێکی هۆشیارانە لەوەی کە جگە لە"مارکس"یەکان وتیان شتێکی دی نیە"!

جێگەی سەرنجە کە پاش سەرکەوتنە درەوشاوەکانی سیستەمی سەرمایەداریو سەرکەوتنی تەواوی ئەو شارستانیە گەشاوەی ئەوروپا کە روخساری شارستانیەتی مرۆییە لەسەردەمی ئێستادا، بەرگری وگفتوگۆی"رۆحی مرۆیی" لە بەرامبەریدا بەکۆتایی دەسەلات و فراوانی خۆی گەیشتو خەباتکردن لەگەڵیدا بنەڕەتیترین بەرپرسیاریەتی رۆشنبیری مرۆڤ دۆستی دیاری دەکرد.

"سەرمایە بەرهەمهێنەرە، سەرمایە پێوەری دۆزینەوەی بەهای کالایە، سەرمایە جیبەجیکاری مافە، کارکردن –ئەم بالاترین جیلوەی بوونی مرۆڤە– لەخزمەت سەرمایەدا"!

عجبا! سەرمایە بووەتە بتی گەورەی سەدەکەمان، مرۆڤ لە بەرامبەریدا هیچە، گوێڕایەڵو گۆشەگیرو بەندە لەخۆی بێگانەیە!!

ئـه‌زموونی شـــوومی مرۆڤایـه‌تیش – کـه لـه بەرامبــه‌ر ئـه‌م ئه‌زموونــه شــێوه‌ی لێکۆڵینـه‌وه‌ی زانـستی وه‌رگـرت– تـاڵ وکاره‌سـات ئـامێز بـوو. "مـارکس"یـزم پـاش نیوسه‌ده که ئایدۆلۆژیای خۆی به‌ته‌واوی خسته‌روو، له‌جێگایه‌کدا که‌هیچ چاوه‌ڕوانیه‌کی لێنه‌ده‌کرا و خودی خۆیـشی سـه‌باره‌ت بـه‌وه بـه‌دگومان بـوو (نووسـینه یه‌که‌مینـه‌کانی "مارکس" دژی ڕوسیا) به‌رگی کرداریان به‌به‌رداکرا و بوونه کردار.

ئێـستاش "بتـی نـوێ"! مـرۆڤ پـه‌روه‌رده‌ی کۆمه‌ڵگـه‌و کۆمه‌ڵگـه، له‌گـه‌ڵ ئه‌وه‌شـدا هه‌ســت‌و ویــژانی و بــه‌ها ئه‌خلاقیــه‌کان‌و فه‌رهــه‌نگ‌و ئایـدیاکان‌و هه‌ســته‌کانی مــرۆڤ هه‌موویان له‌دایکبووی"ئامێری به‌رهه‌مهێنان"!

ئه‌مڕۆش واته ماشێن!

داستانی شیعری ئه‌و شاعیره[1] که له گه‌ڵ یاریدا قسه‌ی نـه‌ده‌کردو په‌یوه‌نـدییان نـه‌ما تاکو له دوای چاوی جادوویی ڕزگـاری ببێـت‌و بۆنـه‌وه‌ی پـشت گـوێی بخـات، ده‌سـتی به‌گڵکاری (ئیشی قوڕ) کرد و ئه‌م کاره‌ی کرده جێنشینی کاره‌که‌ی دیکه‌ی که سـه‌رقاڵ بوون بوو به شێتی چاوه‌کانی یار، به‌ڵام!

کم کـــم ابر زمستـــانی گذشت

وقــت نـاز نرگس بیـــمــار شد

شاخه‌های نرگس پرگـــل شکفت

دیدم ای افسوس! چشم یارشد!

واته: ( ورده ورده هه‌وری زستان نه‌ما، کاتی نازی نێـرگس نـه‌خۆش کـه‌وت، لقـه‌کان نه‌رگس پڕ له‌گوڵ و شکۆفه‌یان کرد، بینیم به‌داخه‌وه! بوونه چاوی یار!)

---

[1] شاعیری چین که"حمید شیرازی" به‌جوانی بۆ فارسی وه‌رگێڕاوه. هه‌ڵبه‌ته به‌بێ ناوی سه‌رچاوه!

مرۆڤایەتی کەبۆڕاکردن لە کۆت و بەندی تەکنۆلۆژیا و ماشینزم بە "مارکس"یزمەوە سەرقاڵ بوو، کە بەهێزترین هێرشەکانی ئاراستەی پەیکەری کردبوون، پاش سەرکەوتنی "مارکس"یزم و بەرهەمداربوونی کێڵگەی کۆمۆنیزم، لەناکاو خۆی خێراتر و قورستر لەسیستەمی سەرمایەداری پیشەسازی، لەزنجیرو کۆت و بەندی ماشینسیم گرفتار بوو، بەو جۆرەی کەمەرجی بنەڕەتی هێنانەدی کۆمەڵگەی ئایدیاڵی ئیشتراکی نازو بەخشی ماددی راگەێنراو مەرجی بنەڕەتی ئەمەش، گۆڕینی کۆمەڵگەیە بەکۆمەڵگەیەکی قورسی سەراپا پیشەسازی، ئەویش لەسەربنەمای هەمان ئەورێسا و بنەمایانەی کە بەگوتەی لینین "دەبێت لەسەرمایەداری فێر ببێت"! واتە: تایبەتمەندی و پسپۆڕی "زنجیرەی قۆناغی رێکخراوی تەکنوبوروکراتیك" و "چاودێری لەسەر بنەمای ئەنگێزەی تاکەکەسی سوودگەری".

لە پشت هەموو ئەمەشەوە، دامەزراوەیەکی دەسەڵاتخوازو دەسەڵات فراوان کە بەخێرایی دەڕوات تاکو تەواوی لایەنەکانی کۆمەڵگە داگیربکاتو لەسەرووی ئەوەشەوە "چینێکی نوێ"ی فەرمانڕەوا، کە لە بوروکراتی زاڵو لەهەمانکاتدا سەرمایەدار دروست بکات! بۆیە "مارکس"یزمیش رویەکی دیکەی دراوی سەرمایەداری رۆژئاوایە؟

ویژدانی مرۆڤ کە بەدوای ئازادیداو رزگاریدا دەگەڕێت سەری دەرهێناو بەتایبەت پاش شەڕی جیهانی دووەم، خەڵکی ئاسیایی ئەفریقا بەرەو ناسیۆنالیزمی پێشکەوتوو دژی داگیرکار رۆیشتن و گەڕانەوە بۆرەسەنێتی فەرهەنگی و نوێکردنەوەی پەیوەندی مێژوویی و زیندووکردنەوەی کەسێتی نەتەوەیی خودی خۆی و بەڵام وەچەیەکی دابڕاو لە رابردوو، بێزار لە ئامێرو تەکنۆلۆژیای سەرمایەداری و ئێستا جووڵەی تێکەوت و لە "زەوی چاوەڕوانکردنی کۆمۆنیزم" دەروازەیەکی ئازادی هەناسەدایی بەرەو خۆی

کردەوە و ئەویش بوونگەرایی بوو و لەسەرووی هەموویان و لە پێش هەموویانەوە، "سارتەر" خۆی بەرجەستەی بەشێکی بەهێزی و بەئاگا لەڕەنجی ئەم کارەساتانە بوو.

لە بەرامبەر سەرمایەداریدا کە لە مرۆڤ "ئاژەڵێکی ئابووری" دروست دەکرد ولە بەرامبەر "مارکس"یزمدا کە لە مرۆڤ شتێکی ماددی رێکخراو!" وە لە بەرامبەر کاسۆلیك کە مرۆڤی بەیارییەکی بێ ئیرادەی هێزێکی فەرمانڕەوای نەزانراو غەیبی دەناساندولە بەرامبەر ماددیگەرای دیالکتیك کە مرۆڤی بەیارییەکی مندالانەی بێ ئیرادەی تەواوکاری جەبری ئامرازو ئامێری کار دەناساندو بوونگەرایش لە مرۆڤ خودایەکی دروستکرد! وە لە بەرامبەریدا شکۆمەندترین ستایشەکان!

"هەموو بوونەوەرانی ئەم جیهانە" "بوون" یان پاش دامەزراندن و دروستبوونی "حەقیقەت"یان دەسەلمێن، تەنها مرۆڤە کەحەقیقەتی پاش بوونی دروست دەبێت.

درەختی گوێز یان توو، پیش بوونیان زانراو و دیارن کەچین و دەیانەوێت چ شتێك بکەن، بەلام "مرۆڤ" سەرەتا دروست دەبێت نازانرێت کە چۆن دەبێت؟ چۆن بووە؟ چۆنیەتی مرۆڤ خودی خۆی دروستی دەکات، و چیەتیشی خۆی "هەڵی دەبژێرێت"!

بۆیە مرۆڤ خۆی، خۆی دروست دەکات و ماهیەت بەخۆی دەبەخشێت. نەك سروشتو لەدایك بووی ئامێرەکانی بەرهەمهێنانیش نیە. "مرۆڤ رەنگ خودایەکە کە خۆی دروست دەکات."

ئینجا پاش ئەو بێزرێزیەی کلێسا، سەرمایەداری و کۆمۆنیزم بەمرۆڤ، ئەم "هاوارە" تاکو چ شوێنێك دەتوانێت ئەو دڵانەی کەئیمانیان بە "کەرامەت و رێزی مرۆڤ" هەیە بێقەرار بکات!

قەدەریش بەم جۆرە بوو ئەم هاوارە لەسەردەمی ئێمەدا "سارتەر"ێك دەركەوت كە لە نێوان فەیلەسوفە نوێكاندا خاوەنی بەهێزترین كەسێتی كۆمەڵایەتی و بەتواناترین قەڵەمی ئەدەبی و هونەرییە.

بەڵام "سارتەر" دروست لەهەمان دژیەكیەدا ئازار و رەنج دەچێژێت كە "ماركس" دەیچەشت، "ماركس" لەلایەكەوە هەوڵدەدات تاكو رۆشنبیران وكرێكاران وا لێ بكات تاكو وێرانكردنی سیستەمی سەرمایەداری و بیناكردنی كۆمەڵگەی سۆشیالیستی هەنگاو بنێت، واتە دەستگرتن بە ئەندێشەو، ئایدیاو ئیرادەو هەڵبژاردنی مرۆڤ.

لەلایەكی دیكەوە لە ماددیگەرای دیالیكتیكدا، كەمترین جێگایەك بۆ ئەم مرۆڤە بوونی هەیەو ئەم "فەلسەفە زانستیە كە لەسەر بنەمای دژیەكی جەبری لە جووڵەو گۆڕان و گۆڕانكاری بیریەتی بەچۆنیەتیە و هەروەك رێساو یاسا جەبریەكان و سەروو مرۆییەكان كاردەكات، خودی خۆی وێرایی سیستەمی سەرمایەداری وهێنانەدی كۆمەڵگەی كۆمۆنیستی قبوڵكردووە!

لەجەبرێكی"رەها ماددی" لەم جۆرە، دەبێت لەكوێ توانای"هەڵبژاردنو ئیختیاری سەربەخۆی مرۆیی" بدۆزرێتەوە؟ توانایەكی هەڵبژاردن كەخودی خۆی لەدایكبووی سروشتو ناچاری جەبرێكی لەم جۆرەیە چ مانایەكی هەیە و لەبەرئەوە چ بەرپرسیاریەتیەك؟

"سارتەر" بەجیاكردنەوەی دروستبوونی سروشت و دروستبوونی مرۆڤ، ددان بە دووانیەك (Dualisme)دادەنێت. جیهان ناسی (cosmogine) لەسەر بنەمای دووانەیی (دووانەیی جەوهەر و بوون) لە دووانەییو دوالیزمەیی "مێژوویی" زەردەشت، دوالیزمەیی"خودی" مانوی ودوالیزمەیی مرۆیی ئیسلام شایەنی دەربڕینو سەرنجدانە.
بەڵام "سارتەر" پاش "نیچە"و "هیگڵ" و "ماركس" و تەنانەت دوو سەدە پاش

دۆستانی (دایره المعارف) لەنیوەی سەدەی بیستەمدا، لەئەوروپادا ناتوانێت یان نایەوێت بەناونیشانی ڕۆحێکی مەزهەبی خۆی بنوێنێت. بەرامبەر بە مادديگەرای وەفادار دەمێنێتەوەو تەنانەت بۆ ئەوەی بوونگەرایی خۆی لە قوتابخانەیەك لەرێڕەوی تەواوکاری "مارکس"یزمدا بناسێنێت، بوونگەرایی کە لە "هایدگەر"ەوە وەردەگرێت و دەیبەستێتەوە بەلقی "مارکس"یزمەوە تاکو بوونگەرایی خۆی بە قوتابخانەی"پاش "مارکس"یزم" پیشان بدات نە (پێش "مارکس"یزم).

کەوتنی توندی بوونگەرایی بالآبەرزی ئەو، لە تۆوێکی مرۆڤ "خودایی"بە بیابانی حیرەتی"پووچگەرایی" هەر لێرەدایە.

"ماددیگەرای دیالیکتیك" یان "دوالیزمەیی"؟ ماددیگەری یەکتاییەکی ماددی"یەو لەم یەکتاییەدا، ئەم هاوبەشی (شرك)ە دوانەییە! "دوانەیی مرۆڤ و جیهان"بە کوێوە هاتووە؟

"سارتەر"، بەپێچەوانەی "مارکس" —کەتەنانەت بالآترین تایبەتمەندی وسیفەتی مرۆیی و ئامانجە پیرۆزەکانی مرۆڤ بەدروستکروی سیستەمی بەرهەمهێنانی ئابووری، واتە، وەکو کالآیەك، دەزانێت و لەداخوازییەکانی ئامێری کاری ماددی دەزانێت— رادەگەیێنێت کە "ئەگەر تاکێك کە هەر لەدایکبوونەوە تەواو نیە و ناتوانێت بجولێت و نەبێتە قارەمان خۆی بەرپرسیارە"!

زۆر بالآ! بەلآم "مارکس"یەك چۆن دەتوانێت ئەم "ئاراستە بکات"؟ ماددیگەرایەك، لە بەرامبەر ئەم پرسیارەداکە:— ئیرادەیەکی لەم جۆرە کە لەسەرووی ماددیو بالآترو سەرووترە لەمادده —سروشتی وزاڵ بەسەر ژینگەی کۆمەلآیەتی و تەنانەت فەرمانڕەوا بەسەر پێکهاتەی سروشتی مرۆڤ لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت، دەتوانرێت چ وەلآمێك بداتەوە؟

ئایا خودی مادده، بوونێکی ناماددی دروستکردووه؟

وەڵامی ئەرێنی بۆ ئەم پرسیارە لەلایەن ماددیگەرایەکەوە، داننانەبە "موعجیزە"یەك کە بەهەمان ئەندازەی دانپیانانی دژە ماددیگەرایەکە کەباوەڕیوونە بە دروستبوونی جیهان بەدەستی خودایەکی نادیار.

بەڵام ڕەنج و ئازاری بوونگەرایی "سارتەر" لەم قۆناغەی"ژێرخانی فەلسەفی" کۆتایی نایەت. بەڵکو ڕەنجو ئازاری گەورەتری لێرەدایەکە ئەم قوتابخانەیە هەموو قورسایی خۆی بەسەر "کرداری مرۆییدا" کورت دەکاتەوە و لە هەمانکاتدا زیاتر لە هەمووان، لێرەدا دەشەڵێت!

مرۆڤ بە"کرداری خۆی" خۆی دروست دەکات.

"کرداری خۆی" مانای چیە؟

لەووشەیەکدا، واتە "هەڵبژاردن"

"هەڵبژاردان" مانای چیە؟

واتە ئەوەی کە"ئیرادەی ئازادی مرۆیی کەخۆی لەهیچ هۆکارێکی جەبری دەرەکی – ئیلاهی یاخود ماددی سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو هۆکارێك "سەربەخۆ"ی پێوە دەبەسترێت– ئەرێنی یاخود نەرێنی.

لێرەدا، جگە لەم کێشەیە کە"سارتەر" ناتوانێت وەڵام بداتەوە کە ئەم "ئیرادەی میتافیزیکیە" لەجیهاندا ماددیگەری لەکوێ سەری دەرهێناوەو دەرکەوتووە و هاتۆتە نێو زنجیرەیەك هۆکاری ماددی یاخود هاتۆتە نێو گفتوگۆی خۆبەخۆی دیالیکتیکی، کێشەیەکی گرنگتر کەزۆر بنەڕەتیە بەچارەسەر نەکراو دەیهێڵێتەوەو ئەویش ئەوەیە کە"هەڵبژاردن"هەرچەندە سەربەخۆو ئازادانەیە، دەبێت پێوەری هەبێت و لەسەر بنەمای"بەهاکان" دروست ببێت.

لەبەرئەوە دەبینین لێرەدا هەمان ئەو باسە دێرینەی"خێرو شەڕ" یان "ئەخلاق" دێتە پێشەوە. هەڵبەتە "سارتەر" لەسەر ئەم بابەتە بەتەواوی دەوەستێت و دەیخاتە روو.

"خێرو چاکە" چیە؟ "شەڕو خراپە" کامەیە؟

ماددیگەری دیالیکتیك ناچار نیە وەڵامی ئەم بابەتە بداتەوە، بەو جۆرەی کە هیچ "جەبرێك رێڕەوێکی" نیە، چ جەبری ئیلاهی، چ جەبری ماددی، چونکە تەنها کاتێك مرۆڤ بەئازادی هەڵدەبژێرێت، بابەتی بەرپرسیاریەتی دێتە پێشەوە و ئەوەی کە: چ شتێك هەڵبژێرێت و"بۆچی"؟

بەڵام "سارتەر" کە بابەتی هەڵبژاردنی تاکو ئاستی میتافیزیکی بەرزکردۆتەوە، دەبێت پێوەری دیاریکردن و لێکهەڵوەشانی"چاکە" و"خراپە" بەدەستەوەبدات، واتە بۆ هەڵبژاردنی تاکێکی مرۆیی لەکرداردا پێوە دیاری و دەستنیشان بکات.

بەگوتەی هایدگەر – دایکی فیکری و هزری "سارتەر"– "مرۆڤ، تەنیا نیە کە لەم بیابانی ئەم جیهانەدا پەرت و بڵاوبووە" ئەم بابەتە "سارتەر" بەناوی (Delaissement) واتە: خۆی لە ئەستۆی خۆی دەخاتەروو، هەرئەوەی کە لە فەلسەفەی ئێمەدا "تفویض" پێ دەوترێت.

ئەم مرۆڤە رەهایە خودا، لەسروشت، لەرێساو یاسای جەبری مێژوو ژینگە خاوەن ئیرادەی ئازادی خودایی، بەرپرسیارە، بەڵێ، ئیرادەی ئازاد لە کردار، بەڵام بەرامبەر بە کێ و چ کەسێك؟

ئەمەش دووەمین نیشانەی پرسیارێکە لە بەرامبەر "سارتەر"دا وەستاوە ! "سارتەر" هەوڵدەدات وەڵامی ئەم دووانە بداتەوە.

بەڵام بەداخەوە لەم دووجێگەیەدا، ئیدی لەتوانای بەڵگە هێنانەوەو بەهێزی لۆژیك و مەزنی قەڵەمی "سارتەر" هەواڵێك بوونی نیە.

بەناونیشانی پێوەری"چاکە" — کە دەبێت هەڵبژاردنی ئەرێنی بۆ ئەنجام بدات— و خراپە کەهەڵبژاردنی نەرێنی— دەوێت، "سارتەر" بنەڕەتی نیەت چاکی (Bonsems) دەخاتەروو.

ئەگەر لەکاتی هەڵبـژاردنی کردارێکدا، تـاك ئـەم هەسـتەی هـەبێت کـە دەبێـت ئـەم هەڵبژاردنەی ببێتە شێوەیەکی گشتو خەڵکانی تریش بتوانن شوێنی بکەون و ئەنجامی بدەن، واتە ئەوکردارە کردارێکی چاکە، ئەگەر ئەو هەستەش هەیە کە تەنها ئەو بەم جۆرەبکات و ئەوانی دی پەیڕەوی لێ نەکەن، کەواتە ئەوە کردارێکی خراپە.

کەواتە پێوەری خێرو شەڕ (چاکەو خراپە)چیە، یەکەم: هەستێکی تاکگەرایی و دووەم: بابەتێکی تەواو هزری.

جێگەی سەرنجە کە ماددیگەرایەك کە پەیوەستە بە"مارکس"یەوە، تاکو ئەم رادەیە کرداری مرۆیی بەشێوەی تاك "تاکگەرایی" و هزری"ئایدیالی" ئاراستەدەکات!

ئایا "سارتەر" لاوازییەکی لەم جۆرەو بێ بنەمایی لەئەخلاقی بوونگەراییداو سەرئەنجامە شومەکانی بەئاگا نیە؟ بێگومان بۆچی!

بەڵام "چارەیەکی دیکە نیە."

ئەم وەلامە، وەلامی خودی خۆیەتی. کاتێك جیهان بە مادديگەرا وەربگرین، هەر کەسێکی دی، جگە لە "سارتەر"، بیەوێت ئازادیو حورمەتی مرۆڤ لەچنگی سروشتیگەرایی یان مادديگەرایی کۆت و بەند یان مادديگەرایی نوێ رزگار بکات و بەرەو سەرەوەی بەرێت و مرۆڤ لەسەر دووپێی ئیرادەی سەربەخۆی خۆی بوەستێنێت، خۆبەخۆ جارێکی دی دووبارە دەکەوێتە چاڵی رەشی کوێرو ناخود ئاگای جەبری ماددی سروشتی – دیالیکتیکیەوە یاخود هەر لەسەرەوە وەك خۆی دەیهێڵێتەوە، بەلام پوچ، بێمانا، بێ ئامانجو لە کاتێکدا هەموو بەها مرۆییەکان لەبالای ئازادو فراوانەوە دەرژێن وە چ خێراو ترسناك! دەبینین.

ئاسمان شێتە، بوون خاڵیە، سروشت جووڵەی کوێر و جەبری هەیە، جیهان هەستی ونبووە، هەست، ئامانج و ئیرادەیە، بوون مانایەکی دیاریکراوی نیە و لەم فەزا ترسناکەدا، مرۆڤ تەنهاو غەریبو ئاوارەو بۆخۆی بەجێهێڵراوە لەهەرکوت و بەندێك ئازادە و ئیرادەیەك هەیە ئازاد، کەماناو بەهاو ئامانجو حەقیقەتیش دەبێت خۆی دروستیان بکات.

بەلام دەبینین، ئەم ئۆتۆمبیلە دەسەلاتدارەی "ئازادیو ئیرادە" کە بوونگەرایی بەتاکی مرۆیی دەبەخشێت کاتێك لەگوێدا دەزرەنگێتەوە کە: "بەلام، هیچ جێگایەك بۆ رۆیشتن بوونی نیە، تۆ بۆ هەرجێگایەك کە دەتەوێت، دەتوانی بڕۆیت، بەلام بزانە هەر ئاست و لایەنێکت هەڵبژارد، تەنها بەو بەڵگەیە ئاراستەیە کەتۆ هەڵت بژاردووە وەگەرنا لەگەڵ هەر لایەنو ئاراستەیەکی تردا کە هەر کەسێکی دی هەڵی بژاردووە، جیاوازییەکی نیە، چونکە ئاوەدانی لەهیچ جێگەیەکدا بوونی نیە." بێگومان بەهای شتێکی لەم جۆرە بەتەواوی هیچ وپووچ دەبێتو ترسناك!

ئەگەر مرۆڤ وەکو خودا ئیرادەی ئازاد بێت کە هەر جۆرێك کە بیەوێت بتوانێت کاربکات، لەوەلامی پرسیاری"چۆن کار بکات؟" وەلام ئەمەدەبێت کە "هەرجۆرێك بیەوێت" ئەوە کارێکی هیچ و کاولکارییە. بەلام "سارتەر" چارەیەکی نیە، چونکە لەلایەکەوە ماددیگەری دیالیکتیك بەناونیشانی جیهانبینی خۆی وەرگرتووە و لەلایەکی دیکەوە ئازادی هەلبژاردن بۆ مرۆڤ رادەگەیەنێت. بەلام چۆن دەتوانێت بۆ پێوەری هەلبژاردن و رێکخستنی بەهاو بنەمای چاکەو خراپە، لەجیهانێکی ماددیگەری لەم جۆرەو بێماناڤا بنەمایەك لەدەرەوە لە"چاکەی نیەتو نیازی تاکی" مرۆڤ پیشان بدات؟

ئەمەیە کە "سارتەر" بەروونی ئاگاداری ئەوەیە کە کورتەی بوونگەرایی ئەخلاقی و کۆمەلایەتی ئەو ئەمە دەبێت کە:

١- "تۆ توانای ئەوەت هەیە کە هەر کارێك ئەنجام بدەیت".

٢- "هەر کارێکیشت ئەنجامدا -ئەگەر ئازادانە بێت- رێگە پێدراوە، چونکە هیچ پێوەرێك بۆ رێگریکردنی لە دەرەوە لە هەلبژاردنی تۆدا نیە تۆ هەلتنەبژاردووە."

ئەنجام؟ "کەواتە هەر کارێك بۆ ئەم مرۆڤە بەتوانا و ئازادە، رێگە پێدراوە"!

ئەم ئەنجامگیریە خودی "سارتەر" دەیکات و چەندین جار گوتەی بەناوبانگی "دیستۆفیسکی" دووبارە دەکاتەوە و بەوەش بەناوبانگە کە بریتیە لە: "ئەگەر خودا لە جیهان نەمێنێ، هەموو کارێك بۆ مرۆڤ رێگە پێدراوە"!

کەواتە، بەلابردنی هەموو پێوەرە دیارەکان لە ئازادی، هەلبژاردن و ئەخلاق و هەموو ماناکان لە مرۆڤدا، ئایا ئەم مەترسیە بوونی نیە، کە بەراگەیاندنی ئیرادەی سەربەخۆ و

ئـازادی مـرۆڤ لـەجیهان و کۆمەڵگـە، بوونگـەرایی "سـارتەر" هەوڵـدەدات تـا لـە مـرۆڤ لەسروشتدا خودا دروست بکات، بەڵام "شەیتان" بار بهێنێت؟

## مرۆڤ لەدژیەکی "مارکس"یزم و مەزهەب

گومانی تێدا نیە کە ئەمڕۆ قسەکردن لەسەر مەزهەب دژوارە، رۆحـی نـوێ بەسـەختی دەتوانێت بەهۆکارێکی رزگاری بەخشو تەواوکارو پێشکەوتووی دابنێـت و بـاوەڕی پـێ بکات.

ئەم رۆحە نوێیە چیە و لـە کوێـدا شـێوەی گرتـووە و رۆحیـەتی لـەم جـۆرە دروسـت بووە؟

ئەم رۆحـە لـەخۆرئاواوە دێـت، وەکـو کاڵاکـانی دیکـەو دەرکەوتـەو شـتە دیارەکـانی شارستانیەت و ژیانی ئەمڕۆ، بۆ رۆشنبیری رۆژهەڵاتی، کاتێك قسە لـەخۆرئاوا دەکرێـت، لەم ووشەیە، تـەنها سـەرمایەداری، پیـشەسازی، مەسـیحیەت، داگیرکـاری و لیبرالیـزم، بورجوازی بەبیردەهێنێتەوە.

کـاتێکیش دەیـەوێت لـە بەرامبەریـدا بـەرگری بکـات و نـەفی بکـات، "مـارکس"یـزم بەناونیشانی برەوترین چەك دژی دەناسێت.

لـە کاتێکـدا کەکـەمتر ئەندێـشەیەك سـەرنجی ئـەم بنـەما گەورەیـەی داوە کـە "مارکس"یزمیش خۆی بەرهەمی تـەواوی مێـژوو و سیـستەمی کۆمەڵایـەتیو تێڕوانینـی فەرهەنگی هەر ئەم خۆرئاوایەیە.

تەنها نـەك بـەو بەڵگەیـەی کـە بوونیاتنـەرانی و رێبـەران هـەموو خۆرئـاواین، بـەڵکو تەنانـەت بەشـیکردنەوەی "مـارکس"ی، دەبێـت ئـەم ئایدۆلۆژیـە بەکاردانەوەیـەکی

دەرەكیو دیار لە ژێربینای كۆمەڵایەتی سیستەمی بەرهەمهێنانی بورجوازی پیشەسازی لە ڕۆژئاوای نوێدا بژمێرێت.

"ماركس"یزم بەدابەشكردنی دیاریكراو و دوگمای كۆمەڵگە دەكاتە دوو بەش، ئەوانیش ژێربیناو ڕووبینا، بە"سیستەمی بەرهەمهێنانی ماددی" بەژێربینا دەژمێردرێت كە خودی ئەویش بەپێی چۆنیەتی"ئامێری بەرهەمهێنانە" شێوە دەگرێت و شێوەو جۆری ڕووبیناكانیش بریتین لە مەزهەب بۆ ئەخلاقو ئەدەبیاتو هونەرو دەروونناسییو فەلسەفەو بیروباوەڕی سیاسی، كۆمەڵایەتی، ئابووری، مرۆیی، بوونی (وجود)ی... وەكو ئایدۆلۆژیاكان... هەموویان دروستكراو زادەی"ئامێری بەرهەمهێنانن".

ئەمە كێیە كە لەم بنەما بەڵگەنەویستە و واقیعیەتە هەستپێكراوە گومان بكات كە بۆ سەرمایەداری و"ماركس"یزم، ئامێری بەرهەمهێنان یەك شت بووەو ئێستایش هەریەك شتە؟

ئەم واقیعیەتەش جێگای خۆیەتی بۆ ئەم واقیعیەتەی زیاد بكەین كەبۆ پرۆتستانیزم و فاشیزمیش ئامێری بەرهەمهێنانی ئابووری هەر ئەمانە بوون هەروەك بۆ دوو سیستەمی سەرمایەدارییو "ماركس"یزم هەبوون!

پرۆتستانیزم، سەرمایەداری، "ماركس"یزم وفاشیزم؟!!!

ئەم چوار برادەرە، یەك نزیكی و بنەڕەتی سەرەكیان هەیەو ئەویش ماددیگەرییە و لە خێزانێكدا گەشەیان كردووەو ئەویش ڕۆژئاوایە، هەرچەندە چوار بزاوتو جووڵەی جیاوازن.

پرۆتستانیزم مەزهەبە، بەڵام مەزهەبێك كە لە "عیشق"ەوە رووی لە "دەسەڵات" كردووە و لە مەسیحیەت، ئایدۆلۆژیاو ئەخلاقێكی سازگاری لەگەڵ بورجوازیدا دروستكردووە.

سەرمایەداری كە ئایدۆلۆژیای خۆی بەشێوەی لیبرالیزم و دیموكراسی بینا لەسەر ماددیگەری سەدەی هەژدەیەم (دۆستانی دایرە المعارف) بڵاوكردەوە، لە ئازادیو رەسەنێتی مرۆڤ و فەلسەفە و زانست و فەرهەنگی سازگار لەگەڵ بورجوازی نوێ دروستكرد.

"ماركس"یزم، بەرووگەی ئابووری هەموو جیلوەكانی بوونی مرۆڤ و مێژووی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ، لە سۆشیالیزم، سیستەمێكی ئابووری تەواو پاكی لەسەر "دابینكردنی ئابووری لەسەر بنەمای پیشەسازی" ولە دیالیكتیكی هیگل كە بە هێنانەدی خودا لەمێژووی مرۆڤدا دەیكێشا، چەكێكی دروستكرد كە بەهێنانەدی"ژیانی بورجوازی بۆ چینی پرۆلیتار" گۆردرا و دەركەوت!

فاشیزمیش كە لە هەمان خێزانی "ماركس"یزمەوە سەری دەرهێنا، لە بنەرەتدا راپەرینی چینی تەكنۆكراتەكانو بوروكراتەكان بوو كە لە نێوان دووجەمسەری سەرمایەداری و پرۆلیتارین جێگەی نەبوو و بوو بوویە ئامێری دەست و فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی داوادەكردو خەڵكێكی فراوانی لەچینە ناوەندەكان –بورجوازی ناوەراستینە– ی بەرەولای خۆی كێشكردن.

◆ مرۆڤ

ئەم چوار راپەڕینە کە یەکێکیان مەزهەب و ئەویتریان سیستەمی ئابوورییە، یەکێکیتریان ئایدۆلۆژیای چینە شۆڕشگێڕەکانو ئەویتریان بزاوتن و جووڵەیەکی دەمارگیرانەی نەژادی، چ ڕوویەکی هاوبەشیان پێکەوە هەیە؟

١- لەکارخستن یان ئینکاری تەواوی دەرکەوتە "تەجەلیاتی" مەعنەویو نامادی مرۆڤ و دەرکردنی مرۆڤ بەناونیشانی بوونەوەرێك کە خاوەنی جەوهەرێکە سەرووتر لەسروشت و جووڵەی خودی بەرەو سەرەوەیە و لەفیترەتدا ئایدیالیست.

٢- سنووردارکردنی نیازو پێداویستیەکانو ئایدیاکانی مرۆڤ لەسنورە دیاریکراوەکانی دەسەلآت و مەسرەفی ماددی و زاڵکردنی پێداویستی ئابووری بەسەر هەموو نازو پێداویستیە مرۆییەکاندا.

٣- ماددیگەرایی فەلسەفی یان بەلایەنی کەمەوە ئەخلاقی و دەروونناسی.

٤- پشت بەستن بەئۆتۆمبیل بەناونیشانی هۆکاری سنورداری دابینکردنی دەسەلآتو بەکاربردنی ئابووریو پەرستنی بنەمای"بەرهەمهێنان" و سەرنجام شوێنگرتنەوەی ئۆتۆمبیل و ئامێر لەجێگای گەورەترین "بێ شارستانیەتی نوێ".

٥- لەڕووی جەبریەوە بەرامبەرکێ لەگەڵ ئیمانی مەزهەبی، یان لایەنی مەعنەوی مەزهەب بەناونیشانی بەهێزترین هێزی ڕێگرو بەرگریکار لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینەدا.

بەڵام پرۆتستانیزم وەکو ڕاپەڕینێکی چاکسازی لەچوارچێوەی مەسیحیەت لەسوودی چینی بورجوازی نوێدابوو، لەهەمان چوارچێوەشدا ماوەتەوەو ناتوانرێت ڕاپەڕینێکی فیکری جیهانی بێت.

دوای تێپەڕیوونی ئەویش، ئیدی فەلسەفەی بوونی بەناونیشانی جووڵەو بزاوتو بانگەشەیەکی نوێ لە کۆمەڵگەی دروستبوونی ڕۆژئاوادا لەدەست داوە.

فاشیزمیش بەهەمان ئەندازە کە بەخێرایی لەدایکبوو، بەخێرایش بەرەولەناوچوون ڕۆیشت. وئێستاش پاش ئەو لەناوچوونە لە بنەڕەتدا بە قوتابخانەیەکی فەلسەفی و ئایدۆلۆژی دیاریکراو ولەڕێڕەوی جووڵەو بزاوتنی کات لەجیهاندا ناژمێردرێت.

سەرمایەداری، سەرەتا ئەمڕۆ بەتوندی بەبەراورد لەگەڵ سەدەی نۆزدەهەم خۆی گۆڕیوە و ئێستاش قوتابخانەیەکی ئایدۆلۆژی و سیستماتیك نیە، بەڵکو پێش هەموو شتێك سیستەمێکی ئابووری و کۆمەڵایەتیە کەرووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ ئایینداناراستەوخۆیە، بەو مانایەی کە بیرمەندانی دژە مەزهەبی بەناوی"زانست" لەگەڵ ئاییندا خەباتیان دەکرد و دەیکەن، نەك بەناوی بورجوازی و سەرمایەداری، هەرچەندە ئەم بیرمەندانە پەیوەست و پەروەردەی ئەم سیستەمە کۆمەڵایەتیەن و زانستیش کەپشت بەوان دەبەستێت، زانستێکە بەڕۆحی بۆرجوازی نوێ.

بەڵام مارکیسزم، یەکەم: بەو بەڵگەیەی کە بانگەشەیەکی جیهانیەو سنورداری هزری، فەرهەنگیو میللی تایبەتی هیە، دووەم: ئایدۆلۆژیایەکی تەواوەو زۆر دیاریکراو و سنوردار، لەگەڵ بوونی دەمارگیری سەبارەت بەدۆگمایی سەختو جێگیر. سێیەم: تەنها سیستەمێکی ئابووری یان سیاسی تایبەتی تەرح ناکات و ناخاتەروو، بەڵکو لە

هەموو کاروبارێکی ماددی و مەعنەوی‌و فیکری و ئەخلاقی ژیانی تاکی و کۆمەڵایەتی مرۆڤ بەشداری دەکات‌و هەموو جیلوەو بوارولایەنەکانی بوونی مرۆڤ و کۆمەڵگە دەگرێتەوە، چوارەم: خاوەنی "بنەڕەتێکی فەلسەفی‌و بیروباوەڕییە" کە هەموو تەفسیرەکان‌و ئاراستەکان‌و رێگا چارەکان و بانگەشەکانی خۆی لە هەموو ئەو بابەتانەی پەیوەست بەمرۆڤ و مێژوو و کۆمەڵگەو ئایندە لەسەر ئەم "بنەڕەت‌و بنەمایە" بوونیاد دەنێت. پێنجەم: ئەم "بنەڕەتە" بەشێوەیەکی دیاریکراو خێراو تەواو کە لەگەڵ توندترین دەمارگیریە ئایینەکاندا لێکچوونی هەیە، بریتیەلە "ماددیگەری دیالیکتیک". شەشەم: مادیگەری دیالیکتیک، لە قوتابخانەی "مارکس"یزمدا "تیۆریایەکی فەلسەفی"نیە، کەوەکو تیۆریای فەلسەفی ماددیگەراکان یان سروشتگەرا نامەزهەبیەکان لە سەدەی هەژدەهەمدا یان لەیۆنانی کۆندا، تەنها لەجۆرێك تێگەیشتنی فەلسەفی سەبارەت بەجیهان‌و مرۆڤ حیکایەت بکات، بەڵکو هەم بەناونیشانی"تەنها واقیعیەتی لەسەداسەد زانستی" ناونیشان و هێما دەکرێت و هەم (بانگەشەیەکی دەمارگیرانەیە کەهیچ تیۆریایەکی فەلسەفی دیکە ناتوانێت لە بەرامبەر خۆیدا قبوڵ بکات و وەربگرێت و لەئەنجامدا، لەبەرئەوەی خۆی بە "راستی تەواو و سنوردار" دەژمێرێت و جگە لەویش هەرچی هەبێت "ناراستی رەهایە" بەناونیشانی پەیامێکی بنەڕەتی و پڕ جووڵە، وەزیفەی خۆی دەزانێت کە بە "ڕیشەکێشکردنی سیستماتیك"ی مەزهەب –لە هەر جۆرو شێوەیەکی– کار بکات و لەبەرئەوەی لە بنەڕەتدا مەزهەب نەك تەنها بەهیچ و ناراست، بەڵکو زیانهێنەر و بەدژی عەقڵ‌و دوژمنی خەڵکی دەژمێردرێت، بەناونیشانی بەربەستی رێگەی خۆی دەری دەبڕێت و هەرگیز نایشارێتەوە بەدەربڕینی بێ پێچ و پەنای "لینین": "دەبێت دژی مەزهەب هاوار بکرێت"!

بنه‌ڕه‌تی فه‌لسه‌فی تێروانینی دژی مه‌زهه‌بی "مارکس"یزم ده‌بێت "له‌به‌رهه‌می ئه‌و ڕۆشنبیرانه‌ی که‌"مارکس"یه‌کان به‌وابه‌سته‌ی بورجوازی نوێیان ده‌ژمێرن، پاش گه‌ڕان بدۆزرێته‌وه"!

له‌م ڕووه‌وه‌یه که‌"مارکس" و به‌شوێن ئه‌ویشدا "لینین" ئامۆژگاری ده‌كات كه هه‌موو به‌رهه‌می فه‌رهه‌نگ دانه‌ره‌كان "ئینسایكلۆپیدیاكان" ده‌بێت له‌لایه‌ن كۆمۆنیسته‌وه پاش چاوپێداخشانه‌وه و گۆڕین‌و نوێكردنه‌وه بڵاوبكرێته‌وه.

"فیورباخ" كه ئه‌ڵقه‌ی په‌یوه‌ندی نێوان ئایدیالیزمی "هیگڵ"و ماددیگه‌ری دیالێكتیك "مـاركس"یـه‌و دانـایی"قوچـه‌كی هـیگڵ" كـاری ئـه‌وه كـه "مـاركس" و "ئـه‌نگلس" به‌داهێنانی خۆیانی ده‌زانن و ته‌نانـه‌ت زۆرێك لـه قـسه‌كانی لـه به‌رهه‌مـه‌كانی خۆیانـدا دووباره ده‌كه‌نه‌وه، به‌بێ ئه‌وه‌ی ناوی بهێنن، ته‌فسیری بۆ ئایین هه‌یه كه "مـاركس" و په‌یڕه‌وانی جگه له‌په‌راوێز نوسین یان دووباره كردنه‌وه‌و درێژه‌پێدانی شتێكیان بۆ زیـاد نه‌كردووه و له بنه‌ڕه‌تـدا گـه‌وره‌ترین تاوانبـاركردنی بـه‌ناوبانگ دژی ئـایین كـه بـه‌ناوی "له‌خۆبێگانـه‌بوونی ئـایینی" خراوه‌تـه ڕوو، به‌دۆزینـه‌وه‌ی گـه‌وره‌ی "مـاركس"ی ڕاگه‌یێنراوه ده‌سته‌واژه‌یه‌كی تایبه‌تی "فویرباخ"ه. له‌كتێبی"كرۆكی مه‌سیحیه‌ت"ی ئـه‌و هـه‌مان ئـه‌و قوچـه‌كه به‌ناوبانگـه‌ی كـه‌بۆ قوتابخانـه‌ی "هیگـڵ" دا هه‌یـه، سـه‌باره‌ت به‌په‌یوه‌ندی كوڕ "عیـسی مه‌سـیح" و بـاوك"خـودا"ی ئه‌نجامـداوه. بـه‌و مانایـه‌ی كـه ده‌بێت باوكه‌كه لێره‌دا له‌كوڕ له‌دایك ده‌بێت. خـودا له‌مه‌سـیحدا ده‌رناكـه‌وێت، خـودا لـه مه‌سیح ده‌رده‌كه‌وێت و مه‌سیح كه ده‌بێته خودا خودی خۆی هێنانه‌دی ده‌ره‌كی ڕۆحـی مرۆڤه‌و مرۆڤێك كه‌زۆر به‌ته‌واوی و توندی ئاره‌زووی ڕزگاری ده‌كات. "روح القدس" هیچ نیه جگه له‌ڕۆحی مـرۆڤ كـه لـه به‌رئـه‌وه‌ی خودایـه‌ك لـه‌نێو خۆیـدا ناناسـێت، ئیـدی لـه

بوونێکی میتافیزیکیدا کەسێتی پێدەدات و ئەوەی کە لە خودی ئەودایە لە ئاسمانی وەهماویدا جێگە دەگرێت و ئەمەش واتە "لەخۆ بێگانەیی ئایینی"، بەڵام ئەگەر لەم "لەخۆبێگانەبوونە" رزگاری ببێت، بەخۆی دەگات هەست بەم خود ئاگاییە دەکات کە: (Homo homini Deo)."مرۆڤ خودای خۆیەتی".

"مارکس"یش کە لەم کاتەدا لاوێکە "هیگڵ"ی (کوڕی یەهودیەك کە بەهۆی دانانی ئەو یاساو رێسایانەی کە چالاکیەکانو پێشکەوتنەکانی ئیدارەی یەهودیەکانی لەئەڵمانیادا سنوردار کرد، مەزهەبی گۆڕی و بەتەواوی بوویە پرۆتستان.) لەپێشەکی نامەکەیدا نووسی:

فەلسەفە بەئیمانی "پرومتە"وە دەبەسترێتەوە، بەشێوەیەکی کورت، من نەفرەت لەخوداکانە دەکەم‌و خۆشم ناوێت... هەموو بەڵگەکانی بوونی خودا، بەڵگەن لەسەر نەبوونی بوونی خودا، شتە بینراوە واقیعیەکان دەبێت بەم جۆرە روون بکرێتەوە: "لەبەرئەوەی دونیایەکی نالۆژیکی وناعەقڵانی بوون بنەڕەتی بوونی، کەواتە خودا هەیە، بەدەستەواژەیەکی دی، ناعەقڵانی بوون بنەڕەتی بوونی خودایە".

"پرومتە" کێیە؟ "پرومتە" لەئەفسانەی یۆنانیدا یەکێك لەخوداکان بووکە لەبەرخاتری خزمەتکردن بەمرۆڤ، خیانەتی بەخوداکانی دیکەی ئاسمان کرد، کردیە خەڵاتی مرۆڤ و خوداکانیش کە لەم نهێنیەبە ئاگاهاتن بەزنجیر کۆتو بەندیان کرد، چونکە ترسیان هەبوو لەوەی کە مرۆڤ ببێتە خاوەنی ئاگری ئاسمانی و دەیانویست کەئەو هەمیشە لە زەویدا، لەتاریکی و سەرشۆڕی ولاوازی بەسەربباتو هەرگیز نەگاتە پلەی مەلەکوتی باڵاو بۆ ئەو پلە بەرزە نەڕوات.

"مـاركس" كـه ئیمـانی "پرومتـه"یـی و كۆمەڵگـەی "پرومتـه"یـی لـه فەیلەسـوفان‌و كۆمەڵناسانی مرۆڤگەرا وەرگرت و لەژێر كاریگـەری "سن سـیمون"و دواتـر "پـرودون" دایـە، لێـرەدا تێڕوانینـی مەزهـەبی وەك ئـەوان لەئەفـسانە ناسـی یۆنـان بـەمیرات وەرگرتووەو پەیوەندی مرۆڤ و خودای لە مەزهەبە یۆنانیەكاندا، بۆ هـەموو مەزهەبـەكان گـشتگیركردووە، لـە كاتێكـدا كـە نازانێـت، تێڕوانینـی مەزهـەبی مەزهەبـە گـەورەكان ڕۆژهەڵات كتومت پێچەوانەی ئەوانەیە و مرۆڤ و خودا بەپێچەوانەی یۆنان، نـەك لەگـەڵ یەكدا ململانێیـان نیـەو خـود لەگـەڵ مـرۆڤ و سـەبارەت بـەمرۆڤ سـوودو خـراپ‌و لێـی ناترسێت، بەڵكو بەتوندی خۆشـی دەوێـت‌و بنـەڕەتی بانگـەوازی خـودا لـە ڕۆژهەڵاتـدا، بەرزبوونەوەی مرۆڤ لەزەوییەوە بەرەو رووی ئاسمانە و لە ڕیزی ئـاژەڵانی خاكیـە بـەرەو مەلەكوتی خودایی دەڕوات. لە مەزهەبی زەردەشـتدا، مـرۆڤ لەگـەڵ ئەمـشاسپندان، بـۆ سەركەوتنی ئاهورا دەجەنگێت‌و ئاهوراو ئەمشاسپیندان لە هەموو جێگەیـەك پارێزگـاری ژیانی مرۆڤن. لە مەزهەبی دووانەیی مانیدا، مرۆڤ بەرپرسیاری هێنانەدی نووری ئیلاهیـە لـە بوونـدا. لـە عیرفـانی چـین‌و هینـد، لـە بنەڕەتـدا جیاییـەكی لـەم جـۆرەو سـنوری ناشاسیتەی تێپەڕینی نێوان مرۆڤ و خودا بوونی ینـە، بـەڵكو خـودا بـە شـێوەی ڕۆحـی بوون‌و كرۆكی حەقیعەت لە مـرۆڤ و تەنانـەت سروشتیـشدا دێـت و دەڕوات و دەژی‌و لـە هـەمووی گرنگتر، لـە مەزهـەبی یـەهود و مەسـیحیەت و ئیسلامدا كـە جیهانبینیـەكیان هەیە، ئەو ئـاگرە خوداییـەی یۆنـان لـە شـێوەی"درەخـت قەدەغـەكراو" و هاوشـێوەی ئەوەو "پرومتە" بووە بە"شەیتان"و خودایە كە "پرومتە"ی مرۆڤە!

ئەوەی كە"ماركس" دەیڵێت: "مـن نـەفرەتم لـەخوداكان دەكـەم ورقـم لێیانـە" ئـەو دەستەواژەیەی كە هەڵی بژاردووە شایەنی تێرامانە. لەپێشەكی نامەیـەكی فەلـسەفیدا، ئەویش لەسەر قسەكردن لەبارەی خوداكانەوە هەڵبژاردنی ووشەی"نەفرەت" سروشـتی

نیە، نەفرەت، زاراوەیەکی سۆزگەراییە نەك فەلسەفی یان زانستی، رەنگو ریشەی ئەم نەفرەتە رۆحیە دەبێت لە ژیانی تایبەتی ئەودا بۆ بگەرێین‌و عیشقی ناتەواوی کە هۆکاری کە هێماو نیشانەی مەسیحی بوون.

بەڵام لەقسەی کۆتایی قسەکانیدا کە دەڵێت: "بۆ سەلماندنی بوونی خودا دەبێت بەپێچەوانەوە بەڵگەبهێنرێتەوە، لەبەرئەوەی سروشت سیستەمێکی دروست و راستی نیە کە خودا هەیە" لەبەرئەوەی کاروباری نالۆژیکیە خودا هەیە و بنەرەتی بوونی خودا لەسەر ناعەقلانی بوون (Irrationnal)ە، جۆرێك هەڵەی لۆژیکی بوونی نیە و ئەویش ئەمەیە کەتێروانینی گشتی مەزهەبی کردۆتە پێوەری بەڵگەی مەزهەبی، چونکە تێروانینی گشتگیرانەی مەزهەبی هەمیشە لەدەرەوەی یاساو رێسا لۆژیکی‌و سروشت‌و جوولەی عەقڵی کاروبارەکان بۆ خودا دەگەرێت‌و پشت بەرووداوەی ئیستیپنایی‌و شتانی نازانستی و ناسروشتی دەبەستێت و بەڵگەدەهێنێتەوە، لە کاتێکدا کە کتێبی مەزهەبی‌و لەسەرووی هەموو شیانەوە قورئانی پیرۆز بنەماو پایەی بەڵگەی یەکتایی خۆیان لەسەر سروشت، سوننەت، یاساو رێسای جێگیری ژیان‌و بنەرەتی عەقڵ‌و شیاوبوون ورێکخراوی کاروباری جیهانیان داناوە ئەمانەش بەشاهیدو بەڵگەی دیار لەسەر سەلماندنی هەستێکی فەرمانرەوا بەسەر سروشتدا زانیوە، تەنانەت قورئانی پیرۆز بەئاوازێکی توندی رەخنەگرانە روو لە ماددیگەراکان دەکات و دەفەرموێت: وابیردەکەنەوە سیستەمی ئەم جیهانە هیچ وپوچە ! ؟ و بەناونیشانی وەڵامی خۆی دەداتەوە و دەڵێت: ئەم جیهانە لەسەر هیچو ناحەق (باطل)نیە.

"خودای گەورە دوورە لەوەی لەکاروبارەکانی جیهان جگە لە هۆو هۆکارەکان تێپەرێنێت."

هەموو شتێك لەسەر بنەمای سوننەتی خودای گەورە لەجیهاندا وەستاوەو "هەرگیز لەسوننەتی خودای گەورەدا گۆڕان و گۆڕانكاری نیە" هەرشتێك لەسروشتو مێژوو و مرۆڤ قەدەری زانراو "قدر معلوم" و كۆتاییەكی دیاریكراو "اجل معین"...

پشت بەستن بەبوونی ڕێكخستنی زانستی وەستی بوون لە سروشتدایە كە گەورەترین پایەی بەڵگەی قورئان بۆ سەلماندنی بوونی خودا.

لێرەدا دەبینین كە بەشێوازێكی زۆر نەرم وپەست بەوجۆرەی كە لە شێوازی بەڵگەهێنانەوەی دەمارگیرانە ڕەخنەگری وتەبێژانی نوێ كە لە سەدەكانی ناوەراست و سیاسیەكانیاندا هەیە، "ماركس"یش قوتابخانەی فیكری لادەری خۆی بەپشت بەستن بەدەربڕینی خەڵكی گشتیو هەڵەو لادانی هەندێك لەوانەی باوەڕیان پێیەتی، هێرشیان دەكاتە سەروو سوكایەتی و ئینكاری دەكات.

تەنها شیكردنەوەی ڕاستەوخۆو بەڵگەدار كە"ماركس" لەدیدی خۆیەوە سەبارەت بەمەزهەب هەیەتی و زۆریش پێی ناسراوە ئەمەیكە "مرۆڤ دروستكەری مەزهەبە، نەك مەزهەب دروستكەری مرۆڤ."

لێرەدا "ماركس" تەنها رستەی "فیورباخ"ی دووبارە كردۆتەوە و بۆئەوەی رستەكە بۆخۆی بگەڕێتەوەو خۆی خاوەنی بێت، لە جیاتی ووشەی خودا، ووشەی مەزهەب بەكاردەهێنێت و تەنها رستەكەی "فیورباخ"ی لێڵ یان شاردۆتەوە، چونكە "مەزهەب دروستكەری مرۆڤ نیە" واتای چیە؟ مەگەر كەسێك ووتویەتی"مەزهەب دروستكەری مرۆڤە"؟

"ماركس" درێژەی پێدەدات:

"مەزهەب ئاگایی بەخود بۆمرۆڤێکە کە هێشتا ئاگای لەخۆی نیەو یاخود دووبارە خۆی لەدەستداوە، بەڵام ئەم لێکۆڵینەوەیە کە عەقڵ حەیرانکەری چارەنووسی مرۆڤە، چونکە چارەنووسی مرۆڤ واقیعیەتێکی راستەقینەو حەقیقی نیە."

لە ئەنجامدا، شەڕ دژی ئایین وەکو شەڕ دژی جیهانێکە کە ئایین جەوهەری رۆحیانیەتی.

هیلاکی و کەوتنی ئایینی لەهەمانکاتدا، روونکەرەوەی هیلاکی و کەوتنی واقیعی و رەخنەگرتنە بۆ ئەم کەوتنە. ئایین وەکو ئاهی بوونەوەرێکی بێچارە، دڵی جیهانێکی دڵ بەردینو رۆحی بوونێکی بێ رۆحە. ئایین تلیاکی خەڵکە "رەخنەگرتنی ئایینی بەهێز بەرەخنەی دەریایەك لەفرمێسك گەلێك کە ئایین هالە و بازنەکانیانە، کۆتایی دێت..."

کام ئەندێشە و بیرکردنەوەی سەربەخۆ هەیە کە لەم دەستەواژانەدا "توانای ئەدەبی زیاتر لەقوڵێی فەلسەفی" هەست پێنەکات؟ ئەگەر کرۆك و ناوەڕۆکی تیۆریای "فیورباخ"ی لێ لابەرین، بۆ "ماركس" جگەلە "نمرەیەکی داڕشتن چی شتێکی دیکە دەمێنێتەوە؟

لە کۆتایی ئەم قسەیەدا، کەئاوازی "ماركس" جدیترو بەڵگەدارتر دەردەکەوێت، تەنها و تەنها دووبارەکردنەوەی"خەباتکردن لەگەڵ لەخود بێگانەیی ئایینی" "فیورباخ"ە کە روونکردنەوەیەکی ناروون ئەو دەژمێرێت:

رەخنەی ئایینی مرۆڤ لەهەڵە دەهێنێتە دەرەوە، تاکو بەناونیشانی مرۆڤێك کەپەی بەهەڵەی خۆی بردووە و فەرمانڕەوایە بەسەر عەقڵی خۆیدا، بیربکاتەوە، کاربکات،

واقیعیەتی خۆی دروست بکات، تاکو سورانی خۆری واقیعی خۆی، واتە خۆی بسورێتەوە.

ئایا ئەمە جگەلە هەمان "رەسەنێتی مرۆڤی بێخودا (humanis me athe) واتە بنەڕەتی تیۆریی "فیورباخ"ە؟

"ئایینی لێکۆڵەر کە عەقڵ سەرسام دەکات و وەهماوی سروشت مرۆڤ"ە واتای چیە؟

بێگومان "مارکس" ئاماژە بەتێکەیشتنی گشتی خەڵکی وەڵەی مەزهەبی دەکات کەدونیاکەی دیکەیان کردۆتە جێگرەوەی ناتەواوی و کێشە ئابووریو مرۆییەکانی ژیانی ئەم دونیایەی کە تێیدا دەژین.

لە کاتێکدا بۆ هەر کەسێك کە ئایینی لەسەر رووی دەقی بنەڕەتی ئایین فێربووە و لەکرداری رێبەرانی بەئاگا بێت، دونیایەکی دیکە جگەلە بەردەوامی لۆژیکیو زانستی و بەتەواوی عەقڵانی -نەك سەرسامبوونی عەقڵەکان- لە ژیانی مرۆڤ لەم دونیایەدا شتێکی دیکەنیە. بەهەشت و دۆزەخ، پلەی بەرزیان نزم لەدونیاکەی تردا، کاردانەوەی خزمەت یان خیانەتی هەر مرۆڤێکی بەرپرسیار لە بەرامبەر کۆمەڵگەو ئەنجامی مەبەستی ژیانی ماددی و ئەم دونیا تاك یان گشتیەیە کە لەم نەشئەیەدا رێگەی تەواوکاری مرۆڤی هەڵبژاردووە و بەبەدیهێنانی بەها ئەخلاقیەکان لەخودی خۆیداو لەژینگەی خۆیدا کاری کردووە و یان بەپێچەوانەوە، فیترەتی خۆی رەش و خراپ کردووە و پیساییەکە لە ژینگەدا بڵاوە.

دەبینین، نەبوونی کاردانەوەیەکی لەم جۆرە لەم جیهانەدا و پچڕانی ئەمەیەکە نالۆژیکی وسەرسامکەری عەقڵەو تەنانەت بەپێچەوانەی زانستی بوونی کاری جیهانەو نەفیکردنیەتی کە مرۆڤ بەدەستەواژەی خودی "مارکس": "لەدوونیای دڵ پڕینو رقدا و بوونێکی بێ رۆحدا" گرفتاری دەکاتو مرۆڤێکی لەم جۆرەکە لە جیهانێك لە"ماددەی

بێ هەست" یاریچی دژیەکی"دیالیکتیکی کوێرو بێ سەرئەنجام" بووە و لە "دەریایەك لەو فرمێسکانەی" کە"بێ خوایی" هالەی رەش و نائومێدەکەریەتی نوقم بووە!

لە نێو ئەو دەستەواژانەی کە "مارکس" لێرەدا بۆ لێدانی دەمارگیرانەو پچڕانی مەزهەب جێبەجێ کردووە، ئەم دەستەواژەیەکە: "مەزهەب هێنایەدی سەرسامکەری عەقڵی چارەنووسی مرۆڤە، لە کاتێکدا مرۆڤ چارەنووسێکی واقیعی نیە" زۆر جێگای سەرنجە.

هەڵبەتە سەدەیەك پێشتر کە"مارکس" ئەم قسانەی دەنووسی، هێشتا سەدەی بیستەم و بەتایبەت سەردەمی رەش بیرکردنەوەی پاش جەنگی دووەمی جیهانی نەهاتبوو تاکو سەرەنجامی سزای دەستەواژەکانی خۆی بەچاو ببینێت‌و هەست بەدامێنی ئەم کارەساتە بکات. "مرۆڤ چارەنووسی راستەقینەی نیە"! جیاوازی بنەڕەتی مەزهەبی و مادیگەرایی هەرلێرەدایە. ئەوەی کە ئەمڕۆ مرۆڤ بەخێرایی بەرەو "پوچگەرایی"دەڕوات و بەتایبەت وەچەی لاو "سەرکەشی پوچ" دەکات و فەلسەفەو هونەرو ئەدەبو ئەخلاق هەمووی لە"بێمانابوونی هەموو شتێك" و لە نێوانیشیاندا مرۆڤ قسەدەکەن، سەرەنجام سروشت‌و جەبری نەفی جیهانبینی خودابیە، چونکە نەفیکردنی بوون‌و ئامادەگی خودا لەبوون و لە مرۆڤدا، بوون شێت‌و مرۆڤ بێمانادەکات، بەجۆرێك کە نەبوونگەرایی "سارتەر" دەتوانێت هەست و مانای پێ ببەخشێت و نەك دیالێکتیکی هیگڵ بەهۆی "مارکس"ەوە دەتوانێت ئەو مانایە ببەخشێت!

رێککەوت نیە کە یاری دیالێکتیکی "مارکس"، پاش کەوتنی بورجوازی‌و سەرکەوتنی "مارکس"یزم، بۆ هەمیشە لەمێژوودا لەکاردەکەوێت و شەڕی نێوان تێزو دژە تێز بەهاو ژیانی شێوە ئاشتی لەدەرەوە و ناوەوە دەگۆڕێت! بۆچی ناتوانێت ئەوە پیشان کە کۆمۆنیزم بەولایەنە، چارەنووسی مرۆڤ چی لێدێت؟ نەك لەجیهانەکەی تر بەڵکو هەر لەم جیهانەدا! ئەمە پرسیارێکە کە نە مادیگەری کۆن‌و نە مادیگەری دیالێکتیك

توانای وەڵامدانەوەی نیە، چونکە بەگوتەی "رینەگنون" :"تاکو جیهان ئامانج و مەبەستێکی نەبێت، مرۆڤیش بێ ماناو بێ سەرەنجامە"، و بەگوتەی خودی "مارکس"، "ونبووی چارەنووسی راستەقینە"!

لە کاتێکدا ئیسلام نەك تەنها رێز لە سروشتدا بەمرۆڤ دەبەخشێت (لە جیاتی بەهیلاك بردنی ئایینی کە"مارکس" وادەزانێت.) بەڵکو "والقد کرمنا بنی ادم"

ئەوەش رادەگەیێنێت کەخودای گەورە نە بە "بوونەوەرێکی بێچارە کەخۆی لەبیرچۆتەوە و لەبوونی خوادا بەدوای بەهاکان و دەسەڵاتەکاندا دەگەرێت و بەئاهو گریان داوای لێدەکات" بەڵکو ئەوەی بەخاوەنی ئەمانەتی خۆی لە بووندا(١) و خاوەنی پلەی جێنشینی خودا لەسروشتدا دروستی کردووە.(٢)

هەروەها بەناونیشانی گەورەترین وەڵام بەرامبەر بەڵگەی"لەخۆبێگانەیی مرۆڤ لە بەرامبەر خودادا" کە "فیورباخ" و پاشان "مارکس" پشتی پێ دەبەستن ئیمامی علی(ع) بەناونیشانی بنەمایەکی براوە لە بنەرەت و رەسەنێتی مرۆڤەو بەرپرسیاریەتی لە بەرامبەری تەواوکاریو رزگاری خۆی رادەگەیێنێت کە:

"دوائك فيك و لاتشعر، ودائك فيك ولاتبصر"

واتە: ( دەردی تۆ لەخودی خۆتدایە و نازانی و دەواو چارەسەریشت لەخودی خۆتدایە و نابینیت!)

واپێدەچێت کە زانیاری "مارکس" لە مەزهەب، سنورداربووە بەهەمان ئەوەی کە لە باوکی یەهودی نەژاد پرۆتستانی بووی وەریگرتووە.

---

[١] انا عرضنا لامانة على السموات والارض... فابين ان يحملنها ... وحملها الانسان.... (الاحزاب / ٧٢)

[٢] انی جاعل فی الارض خلیفة (البقرة / ٢٩)

ئەو تەنانەت یەکێك لە بنەڕەتیترین بنەماکانی مەزهەب کەهەم لە یەهود و هەم پرۆتستانیزمی مەسیحیدا و هەم لە ئیسلامدا خراوەتەروو، نەیبستووەو ئەویش بریتیەلە بنەمای"تفویض"ە کەخودای گەورە وازی لە مرۆڤ هێنا تاکولەزەویدا بەهەوڵ و کارو کۆشش بژی‌و بۆ رزگاربوونی خۆی هەوڵ بدات.

بەڵام "مارکس"، بۆ لێدانی قوتابخانەیەك، رادەگەێنێت کە لە جیاتی پشت بەستن بەبنەما بیروباوەڕییەکان‌و دەقە بنەڕەتیەکانی مەزهەب، بەلگە بەخورافات و ئەولادانانە بهێنێتەوە کەپەیرەوانی گشتی و داروخاوی وەریانگرتوون، چونکە بەمجۆرە نەپێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە و نەسوکایەتی و کردنەدەرەوە و نەفیکردنی کارێکی دژوار نابێت.

"مارکس" ئاسانترین رێگەی بۆ جەنگ لەگەڵ مەزهەب دەگەرێت، هەرچەندە ئەم گەران بەدوای ئەم ئاسانیەدا ئاوازی قسەی لە "فەیلەسوفێکی زاناوە" بە"وتاربێژێك" یان سیاسەتمەدارێکی "هەڵەکار" دەگۆڕێت، و ئەمەش گرنگ نیە، چونکە لێدانی هێزی ئیمانی مەزهەبی بۆ ئەو فراوانکردنی رێگای سەرکەوتنی "مارکس"یزمەو بەهەرحاڵ لەتێڕوانینی ئەم قوتابخانەیەدا: "ئامانج هۆکار ئاراستە دەکات" هەرچەندە رێگەی گەیشتن بەئامانج، بەدەستەواژەی لینین: بێداری بێت دژی مەزهەب!

لەبەرئەوە جێگای سەرسوڕمان نیە، ئەگەر "مارکس" کە فەیلەسوفێکی زانستی و دیالێکتیکە" لە خەباتی زانستی دژی مەزهەب، "رۆڵی مێژوویی و کۆمەڵگەیی مەزهەبیەکان" لە جیاتی"حەقیقەتی فیکری و زانستی مەزهەبی" دابنێت‌و بەلێدانی کە زۆر ئاسانە، بەتالکردنەوەی کەکارێکی ئاسان نیە، بگاتە مەبەست!

ئەمەیکە دەیەوێت بەلگە بهێنێتەوە کە"ئایین" هۆکاری ئاراستەکردنی نادادپەروەی کۆمەلایەتی بووە، لێرەدا نە وەکو مادیگەراکانی سەدەی هەژدەهەم و نەتەنانەت

وەکو سروشتگەرا کۆنەکان، خەریکی باسی فەلسەفی دوو بەلگەی زاسنتی دەبێت ونەتەنانەت لە بنەڕەتدا باس لە ئایین یاخود راپەڕینە راستەقینەکان و سەرەتاییەکانی ئایین دەکات:

"بنەما کۆمەلایەتیەکان مەسیحیەت"! پێوستی بوونی چینی فەرمانڕەواو چینی تاوانبار رادەگەێنێت و بلاودەکاتەوە، بنەما کۆمەلایەتیەکان مەسیحیەت پڕکردنەوەی هەموو سوکایەتیەکان بەو دونیایە دەبەستێتەوە و بەم شێوە درێژە پێدانی ئەمانە لەم دونیایەدا بەناونیشانی پاداشتی گوناهی سەرەتاو یەکەمین بەناونیشانی ئەوەی کەخودا داینـاوە لەسەر مرۆڤ بۆ تاقیکردنەوەی بەندەکانی خۆی ئاراستە دەکات. بنەما کۆمەلایەتیەکانی مەسیحیەت، بێ غیرەتی سوکایەتی، لارو چەوتی، فەرمانبەرداری، خۆبەخشی و بەکورتی بەهەموو سیفەتە نزمەکان ئامۆژگاری دەکات. چینی پرۆلیتار کە ئەم نزمیە قبولّ ناکات، ئازایەتی، رێزگرتنم لەخود، غرورو حەزو ئارەزوو بۆسەربەخۆیی زۆر زیاتر لەنان پێویستی بەمانە هەیە"! " بنەما کۆمەلایەتیەکانی مەسیحیەت ریاکارانەیە، بەلام چینی پرۆلیتاری شۆڕشگێڕە"(١).

ئایا ئەمە کارل "مارکس" خاوەنی تیۆریای"ئەخلاقی دیارولەدایکبوونی بەرهەمهێنانی ئابورییە" کە قسە دەکات؟!

ئایا بەراستی ئەمە "مارکس"ە کە جیاوازی لە نێوان "ئایدۆلۆژیا"و "سیستەم" جیاناکاتەوە؟! هیچکامیان جێگای باوەڕنین.

بەلام بەداخەوە ئەمە "مارکس"ە کە "مەسیح" ناودەنێت "پاپ" تاکو لەلێدان و کۆتانی نەك تەنها هەموو رۆشنبیرانی "مارکس"ی و تەنانەت بیر ئازادانی مەسیحی لەگەلّ ئاوازیدا بنو هاودەست و بەلکو هەست بەلاوازی بەلگە هێنانەوەی نەکەن.

---

[1] خێزانی پیرۆز

بەڵام ئەمە بەشێوەی گفتوگوو بەرهەمی تایبەتی نەزانەکانو نەخوێندەوارەکان نیــە، هەرچــەندە ڕاگەیانــدنو ڕاگــەیێنراوەکان لەسیاســەتدا یــان مەزهەبــدا بــۆ جوڵانــدنی نەخوێندەوارو نەزانەکان سوودی لێ وەردەگرن.

خــەڵکی نــەزان و نەخوێنــدەوارە کــە هێــرش دەکاتــە ســەر گەنــدەڵی ولاوازی زانــاو دەرەنجامی ئەوەدەگرێت کە"زانست" بێهودەیە. ڕۆڵــی کۆمەڵایــەتی کڵێسایی ڕۆحانیــە کامەسیحیەکانی لەســەدەکانی ناوەڕاســت لەگــەل ڕۆڵــی کۆمەڵایــەتی عیسای مەســیح لەفەستینی دوو هەزار ساڵ لەمەوپێشیان بەهاوتا ژمارد، ئەگەر زۆر توندنەبێت، لەڕووی نەزانینی ڕەهاو تەواوەیە. ســەدەها هــەزار شــەهید کــە لــە نێــوان خــەڵکی فەلەســتینو، خەڵکی حەبەشە، خەڵکی ئەورووپای باکوری و ڕۆژئاوایی دژی داگیرکــاری جیهــان خــۆری ڕۆحــی ڕاپــەڕین، لەگــەڵ ئــەو دەزگــا شــاردراوەی کــە لــە ســەدەها هــەزار مەســیحی ونامەســیحی لەخــەڵکی جیهانیــان کوشــت ولــەنێوابرد بەیەکــسانی دەزانــن، ئەمــەش گوتەیەکە کەزیاتر لە"خراپی بێمانایی" بەهایەکی دی نیە.

ئایا لەڕاستیدا "مارکس" نازانێت کەمەسیحیە هــزر ئازادەکــان زیــاتر لەماددیگــەراکان و"مــارکس"ییــەکان لەســەدەکانی ناوەڕاســتەوە تــاکو ئێــستا لەخــەبات لەگــەڵ کڵێــساو ڕوحانیەتی کڵێسایی (و بەگوتەی "مارکس" بنەما کۆمەڵایەتیــەکانی مەســیحیەت) هــەم فیداکاری وخۆبەخشیان ئەنجامداو هەم کاریگەریان هەبوو؟

ســێ ســەد هــەزار کــەس تــەنها لەشــاری "بەرشــلۆنەی" ئیــسپانیا بــەهۆی کڵێــساوە کوژران، هەموویان مەسیحی بوون! لەشەڕەکانی سەد ساڵەدا مەگەر مەسیحیەت نــەبوو کە بەدەستی مەسیحیەت دەکوژرا؟

بۆچی "مارکس" وەکو کەششانی وابەستە بەکڵێساوە، بەناونیشانی ریسواکردنی ئیسلام، ریسواییەکانی خەلافەت ئاشکرا دەکەن؟ مەگەر یەکەمین و دیارترین قوربانیانی خەلافەت، یەکەمین‌و دیارترین پەروەردەبوانی مەزهەبی ئیسلام نەبوون؟

ئەمەی کە"مارکس" بۆ لێدانی مەزهەب، ئاوازی راگەێنەرانی دەمارگیری مەزهەبی لەکوتان و لێدانی مەزهەب رەخنەدەگرێت زۆر جێگای سەرسورمان نیە، سەرسوڕمانتر ئەوەیە کە لەم دەقەدا (ئەگەر راست وردبوونەوەی تێدا بکرێت) بۆ لێدانی مەزهەب لە بنەڕەتدا ئاوازێك‌و دەنگێكی مەزهەبی وەرگرتووە!

"... بێ غیرەتی، سوکی، ناراستی، گوێڕایەڵی، سەرشۆڕی‌و بەکورتی هەموو سیفەتە نزمەکان..." چینی پرۆلیتار کە ئەم نزمی و پەستیە قبوڵ ناکات وپێی رازی نابێت، زیاتر لەنان پێویستی بەئازایەتی، رێزگرتن لەخود، سەرکەش‌و داواکردنی سەربەخۆییە!

جێگای سەرسوڕمانە! ئەم بەها ئەخلاقیانەو تایبەتمەندە مەعنەوییانە کە هەمیشە مەزهەب بەرگری لێکردوون، بەم جۆرە لەزمانی "مارکس"ەوە دەیان بیستین، "مارکس"ێك کە بەها ئەخلاقیەکان بەرێوو رەسمی کۆمەڵایەتی لەدایکبووی سیستەمی تایبەتی ئابووری و ژێرخانی بەرهەمهێنان دەژمێرێت و هەموویان بە گۆڕاو ناپیرۆز دەزانێت و ناویان دەبات، چونکە کەلێرەدا ئەم مەعنەوییانە لە"نان" بەگرنگترو بەرزتر دەزانێت، ئەویش نەك بۆ کەسانی خاوەن پایە یان بورجوازی و یان ئایدیالیزمی ئەخلاقی، بەڵکو بۆ چینی پرۆلیتار؟!

بەبێ ئەوەی بمانەوێت ئینکاری بەڵگەی ئەم ڕەوشتە نزمانە بۆ ئەخلاقی کڵێسایی سەدەکانی ناوەراست بکەین، بەلام بۆ کەسێك کە ئەخلاق پەیوەست بەمەزهەبەوە دەزانێت و بەئاگایە کەچۆن مەزهەب هەمیشە پشت وپەنای بنەڕەتی لەسەر ئەم بەها ئەخلاقیانە داناوە ستایشکەری بەها ئەخلاقیەکان بووە و لەدوو توێی تەفسیرە خراپ‌و

پیسەکانی دەبارەی"کۆمۆنیزم و ئەخلاق" خوێندونیەتیەوە، لەبیستنی ئەم جۆرە ڕوونکردنە واتە لە زمانی "مارکس"ەوە توشی حیرەت وسەرسوڕمانی دەبێت، مەعنەویەت گەورەتر لە نان!

ئایا ئەمە هەڵگرتنی خراپی چەکەکانی مەزهەب نیە بۆ هێرشی نادادپەروەرانە دژی مەزهەب؟

* * *

"مارکس"یزم زیاتر لە هەموو مەکتەبە ماددیەکانی تر دژی مەزهەب کاری کردووە، گەرچی بەهەمان ئەندازە کە لە هەموویان سەبارەت بەمەزهەب زبرترو دەمارگیرترە، بەڵام بەڵگەی لۆژیکی دژی مەزهەبی بێ بنەماو بێ‌پایەترو سسترو تاریك‌و لێڵترە، چونکە جارێك وەکو زانستگەراکان و ئایدیاگەراکانی سەدەی نوێکان، بەتایبەت سەدەی هەژدەیەم بەبەشێکی هەڵقوڵێ‌و لە نەزانی مرۆڤ سەبارەت بەهۆکاری زانستی کاروبارە سروشتیەکان دەیژمێرێت، جارێکیش هەروەك دەروونناسی ماددی، لەلاوازی ڕۆح‌و زاڵنەبوون و ئاگایی مرۆڤ سەبارەت بەخودی خۆی دەزانێت‌و جارێکیش هەروەك کۆمەڵناسانی ماددی سەدەکانی نۆزدە لەجۆری کاری بەرهەمهێنان لەسیستەمی پێش پیشەسازی و تەکنۆلۆژی زانستی نوێ دەژمێرێت و تەنانەت جارێکیش زۆر سادەو ڕووکەشانە، لە هۆشیاری‌و فێڵبازانەی چینی تاوانبار واتە خەڵکی دەزانێت!

دەبینین کە"مارکس"یزم هەموو تاوانە دژە مەزهەبیەکانی کۆن‌و هاوچەرخی خۆی دژی مەزهەب بەکاردەهێنێتەوە و لەهەمان کاتدا خودی خۆیشی بەناوی ماددیگەری دیالێکتیکیەوە، قسەیەکی داهێنەرانەی نوێی بۆ زیاد نەکردووە.

بنـەڕەتێکی زۆرگـرنگ کـە دەبێـت لەپەیوەنـدی نێـوان مەزهـەبو "مـارکس"یزمـدا بەیادبهێنینەوە بریتیەلەوەی کە زۆرجار وادەردەخەن کە"مارکس"یزم لەبەرئـەوەی کـە لەسەر بوونیادی"ماددیگەری دیالێکتیکی" بوونیادنراوە، لەگـەڵ مەزهـەب کەجەوهـەری بنەڕەتی لەسەر "پەرستنی غەیب و جیهانبینی خودایی"یە، لەشەڕو دژایەتیدان.

هەرگیز! ئەگەر بەم جۆرەبوایە، جیاوازی نێوان "مارکس"یـزم و مەزهـەب لەسـنوری دوو "جیاوازی ڕوانینی فەلـسەفی و زانـستی"دەمایـەوە، هەربـەوجۆرەی کـە لـە نێـوان مەزهـەب و ئایدلیزمـدا بـێخودایی "هیگـڵ" یـان بوونگـەرایی مـاددی "سـارتەر" ویـان بۆنموونە مرۆڤگەرایی بێ باوەڕانەی "دیدەر"و "ئێرنست رینان" بوونی هەیە.

لە کاتێکدا کە"مارکس"یزم دژی مەزهەب، حاڵەتێکی تـوڕەو دژگـەراو ڕەق لەدڵانـەی هەیـە و تەنانـەت لەسـاڵی (١٩٦١)یـشدا کـەزیاد لەسـەد سـاڵ لـەکاری "مـارکس" تێدەپـەڕێت، "جـەنگی بـەردەوام وبـێ ئامـان دژی ئیمـانی مەزهـەبی بـۆ جێگیرکردنـی کۆمۆنیزم لە نێوان خەڵکی ڕوسیادا" لەدەقی بەرنامەی سەرەکی دەوڵـەتو ڕاگەیانـدنی ڕەسمی حیزبی کۆمۆنیست دووبارە دەبێتەوە.

ئەم لایەنگیرییە سەختە، دەمارگیرانەولێدان دژی مەزهـەب، تـەنها بـەهۆی جیاوازییـە فەلـسەفیەکانی نێـوان ماددیگـەری و مەزهـەب نیـە، بـەڵکو جیـاوازی بنـەڕەتی لەسـەر دووجۆر وەرگرتن و تێگەیشتنی دژە لە مرۆڤ و لە ئەنجامی، دووجۆر تێگەیشتنی دژە لە "ئـەخلاق، ژیـان، ئـابووری، فەرهـەنگ، پـەروەردەو فێرکـردنو بەشـێوەیەکی گـشتی، چارەنووسی کۆتایی و مێژوویی مرۆڤ لە کۆمەڵگە و جیهان".

بنـەڕەتی دووەم کـەزۆر گرنگـە ئەوەیکـە هەنـدێك وادەزانـن لەنێـوان مەزهەبـە جۆراوجۆرەکان، ئیسلام جگە لەبابەتی خودا کە لەگەڵ بنەڕەتی فەلسەفی "مارکس"یزم

دژیـەك و پێـچەوانەن، ئـەوا لەبابەتـە مرۆیـی و كۆمەڵایەتیەكانـدا خـاوەنی ڕوویـەكی لێكچوون.

ئەم ڕووە لێكچووە كەسانێكی وەكو (میشێل عەفلەق، عومەر تۆزخان، بـشیر محمـد، بشیر علی و لەڕۆژئاواداشدا ماكسیم ڕودنسون)، كەم تا زۆر دەستنیشانیان كردووە.

جێگەی سەرنجە كە لە جەمـسەری پێـچەوانەدا، هەنـدێك سیاسـەتمەداری داگیركـەرو تەنانەت بەڕێوەبـەرانی كوشـتنی بەكۆمـەڵ لـەو شـوێنە موسڵمانـشینە داگیركراوەكـانی ئـەفریقیا وەك (ژەنـەڕاڵ سـالان، ئـەسمیت و شـاربوون لـە جـەزائیر)، بەناونیـشانی تاوانباركردن و قسەوتن بەئیسلام لەوبارەوە قسەیان كردووە. ! !

یەكەم: لـە نێـوان هـەموو قوتابخانـە هـزری و فیكرییـە پێچەوانەكانیـشدا دەتوانرێـت توخمی لێكچوو بدۆزرێنەوە.

لە نێوان فاشـیزمی ئـەڵمان و سـەهیۆنیزمی یـەهود! لـە نێـوان مرۆڤگـەرایی مـاددی و عیرفـانی ئیلاهـی و بەتایبـەت، لـە نێـوان خـودی "مـاركس"یـزم، واتـە كۆمـۆنیزم و سەرمایەداریدا!

دووەم: زۆرجـار هەڵـە لەلێكـچوون لـە"ئامـانج" لەگـەڵ لێكـچوون لـە"ئایـدۆلۆژیا"دا دەكەن. ئایدۆلۆژیە دژیەك و پیچەوانەكان خاوەنی ئامانج گەلی هاوبەشن.

شارستانیەت و پێـشكەوتنی زانـستی و دەسـتكەوتنی مـاددی كۆمـەڵێك ئامـانجن كـە میللەتێكی داگیركراو خەبات دەكات تاكو بیانهێنێتە دی.

بـەڵام نابێـت ئـەوە فـەرامۆش بكرێـت كـە ئایـدۆلۆژیای بنـەڕەتی داگیركـاریش هـەر ئەمانـەن واتـە بـاوەڕی وایـە كەمیللـەتێكی دواكـەوتوو، بـەهۆی داگیركـاری میللـی

شارستانیەت دەتوانێت بەشارستانیەت و پێشکەوتنی تەکنیکی و خۆشگوزەرانی ئابووری بکات.

دەبینین کەئامانجە هاوبەشەکانیش دەتوانرێت لە نێوان دووجەمسەری سەربەخۆی داگیرکاریش بدۆزرێتەوە، ئامانجە مرۆییەکان ئامانجی هەم سەروو ئایدۆلۆژی و هەم سەروو سیستەمی کۆمەڵایەتی و کاتی مێژوویین.

ئەم ئامانجانە لە جۆریەتی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرن و بەها نەمرە ئەخلاقیەکان لە مرۆڤدا پێك دەهێنن.

ئازادی لە جەبرو زۆرلێکردن، تەواوکاری، عەدالەت، ماف، خود ئاگایی مرۆیی، لەپێشتری کۆمەڵگە بەسەرتاکدا، رەسەنێتی کار، گونجاوی نێوان بەشداربوون و شاریستەی، نەفیکردنی زۆرکردنە، شەڕ، بەندایەتی، نەزانی و لاوازی، گونجان و بوونی توانا لە بەرامبەر مافی ژیان و گەشە، رەدکردنەوەی دژیەکی چینەکان وتوێژەکان، سنوردارکردنی داخوازیە نەژادی و خێزانی و کۆمەڵەیی و ئیمتیازی ناحەقی کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئەخلاقی... هەموو ئامانجی مرۆیین کە بەدرێژایی مێژووی ژیانی مرۆڤی کۆمەڵایەتی و شارستانیەت، دروشمی مرۆڤە روون و ئازادو مرۆڤ دۆست بوون و دەتوانرێ بوترێت بنەما سەرەکی و بنەڕەتیەکانی "مرۆڤگەرایی" بەمانا گشتیەکەی، پێك دەهێنێت و جیاوازی نێوان سیستەمە فیکرییەکان لێرەدا بەدواوە دەست پێدەکەن کە هەرکامیان، لەراڤەو تەفسیرکردنی ئەم ئامانجەو بەتایبەت لەرێگەی گەیشتن پێیان قوتابخانەی جیاواز دەخەنە روو: مەزهەبەکان لەرێگەی پەیوەست بوونی مرۆڤ بەسەرەتا (مبدأ)ی جیهان، فەیلەسوفەکان لەرێگەی کەشفکردنی رێساو یاسا عەقڵیەکان بۆ ژیان، بورجوازی رۆژئاوایی، لەرێگەی هەوڵدانی ئازادانەو چاودێری تاکە مرۆییەکان لەبەرهەمهێنانی ئابووری، لەئەنجامدا بەدەستهێنانی دەسەڵات، پێشکەوتن و

تەواوکاری زانستی، "مارکس"یزم هەر لەم رێگەیەوە، دواجار بەشێوەی فەرمانڕەوایی و موڵکایەتی دەوڵەت لەم هەوڵدانەدا، تەسەوف لە رێگەی خەریکبوون بەخود بۆ تەواوکاری رۆحانیو دەوڵەمەندی مەعنەوی و رزگاری رۆح لە کۆتو بەندی ئارەزووە سروشتیەکان و سروشتگەرایی بەپێچەوانەوە لەرێگەی شوێنکەوتنی تایبەتمەندیە سروشتیو...

دەبێت بابەتەکە بەم جۆرە بخرێتەروو کەبۆ هێنانەدی ئەم ئامانجانە ئەمرانەی مرۆڤن ئیسلام، مەسیحیەت، مەزهەبی هیندی، ئایدیالیزمی "هیگڵ" و ماددیگەری دیالێکتیکی "مارکس"، سۆشیالیزم یان سەرمایەداری... چ رێگەگەلێكو سیستەمێك تەرح دەکەن؟

ئەگەر بابەتەکە بەم جۆرە ناونیشانی بۆ دابنرێت وبخرێتەروو، دەبێت بەروونیو بێ هیچ پێچو پەنایەك بوترێت کە بەپێچەوانەی ئەوکەسانەی لە نێوان ئیسلامو کۆمۆنیزمی "مارکس" بۆ رووی لێکچوو دەگەرێن، ئیسلام و"مارکس"یزم بەناونیشانی دوو ئایدۆلۆژیا تەواو بەتەواوی لە بەرامبەر یەکتردانو دەبێت بۆ سەلماندنی ئەمەش بەهەمان ئەو بابەتو لایەنانە پشت ببەسترێت کە هەندێکیان دەکرێ بەلێکچوو لێیان تێبگەین! چونکە، تەنها ئەولایەنو رووی بەراوردو لێکچوونی کە لە نێوان هەردوو قوتابخانەدا بوونی هەیە، ئەوەیە کە هەردووکیان "ئایدۆلۆژیای گشتگیر و گشتین".

ئایدۆلۆژیەکانی دیکە، زۆرجار بەش (جزء)ین، واتە زیاتر پشت بەلایەنێکی بنەرەتی دەبەستن، بۆنموونە، ماددیگەری و سروشتگەرایی، پشت وپەنای بنەرەتی پشت و پەنایەکی فەلسەفیە، بەڵام لەرووی سیاسی، ئابووری، ئەخلاقی، کۆمەڵناسی، فەلسەفەی مێژوو و مرۆڤناسی ئازادی بەپەیرەوانی خۆی دەدات کە چەپ یان راست بن، باوەڕیان بەزانستی بوون یان رێسابوونی مێژوو هەبێت یان باوەڕیان نەبێت، مرۆڤ بەبوونەوەرێکی خاوەن چێژ و خاوەنی"سروشتی دیاریکراو" بژمێرن یاخود

بەلەدایکبووی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان وشێوە دروست بووی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان، یان سروشت و یان فەرهەنگی بزانن...

بوونگەرایش بەم جۆرەیە، تەنانەت کەسێکی بوونگەرا دەتوانێت مەزهەبی ئیماندار بێت یان ماددیەکی بێباوەڕ، شیالیست بێت یان سەرمایەدار. ناسیونالیزم پشت و پەنای بنەڕەتی بوون و رەسەنێتی وسەربەخۆیی هەبوونی سیاسیو کەسێتی فەرهەنگی میللەتی خۆیەتیو ناسیۆنالیستێك راستگۆ دەتوانێت ئایدیالی یان ماددیگەرا بێت، تەنانەت فاشیست بێت یان دیموکرات بێت، خودا پەرست بێت یان بێخودا. مەزهەبەکانیش بەم جۆرەن. پشت و پەنای بنەڕەتیان لەسەر پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ "غەیب" یا "پیرۆز"ییە. ئەو حوکمو رێساو یاسایانەی کەهەیانە لەسەربنەمای رێکخستنی ئەم پەیوەندیەیە یان لەسەر بنەمای ئەخلاقو فێرکاریەکە کەسایەتی یان ژیانی تایبەتی مەزهەبی شوێنکەوتووانی خۆیان دابین دەکات.

بەلام ئیسلام و"مارکس"یزم هەردووکیان دوو ئایدۆلۆژیای سەراپای هەمولایەنەکانی ژیانو ئەندێشەو بوونی مرۆڤن، واتە هەرکامیان خاوەنی سیستەمێکی ئەخلاقی تایبەتی خۆیانن و هەرکامیان سیستەمێکی کۆمەلایەتی تایبەت دەخەنەروو. هەکامیان فەلسەفەی مێژوو و ئایندەگەری تایبەتی خۆیانیان هەیەو هەرکامیان مانایەکی تایبەتیان بۆ مرۆڤ هەیە و جۆرێك لێی تێدەگەن ورادەگەێنینو دواجار هەرکامیان مەبەستی دیاریکراو بۆ کۆمەڵگەو جۆرو تاکی مرۆڤ لەم جیهانەو لە کۆمەڵگەولە ژیانی تاکەکەسیدا رادەگەێنن ولە هەموو ئەم زەمینانەدا ئەم دوو ئایدۆلۆژیە لە بەرامبەر یەکتردا وەستاون.

١- ئیسلام و"مارکس"یزم لە بنەڕەتی هزرو فیکردا، واتە لەجیهان ناسی (Cosmologie) و بوونیاسی (ontologie) بەتەواوی دژی یەکترن.

"مـاركس"يـزم لەووشـەيەكدا، لەسـەر ماددیگـەرایی وەسـتاوە و كۆمەڵناسـی، مرۆڤناسی، ئەخلاق و فەلسەفەی ژیـانی خـۆی لەماددیگەریـەوە وەردەگرێـت. جیهـان "مـاركس"یتـی كەهـەمان جیهـان ماددیگەرییـە، بەگوتـەی "مـاركس" "جیهـانێكی دڵ بـەردین وبـێ رۆح"ە و تیایـدا مـرۆڤ "وونبـووی چارەنووسـی راستەقینەیە".

دروست بەپێچەوانەوە، جیهانناسـی ئیسلامی لەسـەر "ئیمـان بەغـەیب" وەسـتاوە مەبەست لە"غەیب" ئەو واقیعیەتە نەناسراوەیە كە لەوودیو ئـەو دیـاردە سروشـتیانەوە كە لە بەردەم هەستو دەرككردنی عەقڵیو زانسـتیو ئـەزموونی ئێمـەن بـوونی هەیـە و وەكو حەقیقـەتێكی سـەرووترو بـاڵاترو بەبنـەڕەت و جێگـای سـەرەكی هـەموو جووڵـەو رێساو یاساو دیاردەكانی ئەم جیهانە دەژمێردرێت.

قورئـانی پـیرۆز "ئیمـانی بەغـەیب"ی لەسـەرەتای یەكـەمین سـورەتی (البقـرە)ی بەناونیشانو هێمای مەرجی هیدایەت بنەمای پاریزگاری (تقوی) راگەیاندووە:

" الم(١)ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ(٢)الَّذِينَ يُؤْمِن ونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ(٣)". (البقره ٣،٢،١).

ئـەم "غـەیب"ە لەحەقیقەتـدا رۆح و ئـیرادەی رەهـای بوونـە و بەپێـچەوانەی ئایـدیالیزم كـە دیاردەكـانی جیهـانی مـاددی بەلـەدایكبوونی"ئایـدیا" دەزانێـتو بەپێچەوانەی ماددیگەری كە "ئایدیا" بەلەدایكبوونی جیهانی ماددی دەزانێت، ئیسلام هـەم "مـاددە" و هـەم "ئایـدیا"بەناویـشانە (ایـات) جیـاوازی ئـەو "بوونـە غەریبـە رەهایە"دەزانێت و دەژمێرێت و بەم جۆرە ماددیگەری و ئایدیالیزم لەگـەڵ یەكـدا نـەفی دەكـات ولـە هەمانكاتـدا دان بـەبوونی جیهـانی سروشـت، لـەدەرەوەی ئایـدیای ئێمـە دادەنێـتو هـەم دان بەمرۆڤیـشدا دەنێـت كـە بـوونێكی خـاوەن ئایدیایـە، لـە بەرامبـەر

سروشتی ماددی و ژینگەی کۆمەڵایەتی مادی و بەرهەمهێنانی ماددی، بەسەربەخۆیی و ڕەسەنێتی قایلە.

"مارکس" بەشوێنکەوتنی "فیورباخ" و ماددیگەرایەکانی دیکەی سەدەی نوێ، هەوڵدەدات تاکو مرۆڤ لەبەندایەتی ئابووری، لەخۆبێگانەیی هزری و سیاسی ڕزگار بکات و بە "نەفیکردنی تایبەتمەندی و پسپۆڕی" کە مرۆڤ بەش بەش دەکات بۆ یەکێتی خۆی بگەڕێتەوە و بەگوتەی خودی خۆی مرۆڤ بۆ "بەها مرۆیی و توانای بەرهەمهێنان و فەرمانڕەوایی خۆی"بگەڕێتەوە و بە "خۆئاگایی" بگاتو لە هەموو جەبرەکانی ڕزگاری ببێت، چونکە جگە لە "مادده" و گفتۆگۆی کوێرو بێ ئاگا لەخود هۆکارێکی دیکە لەجیهانناسی خۆیدا نادۆزێتەوە، مرۆڤێك کە بەم جۆرە لە ئایدۆلۆژیایدا خۆی بەرزدەکاتەوە، ناچار "لەماددیگەری کوێردا" دەکەوێت و مرۆڤ لەڕیزی"شتە سروشتیەکان" لە کۆتا شیکردنەوەدا دایدەنێت.

لە ڕاستیدا، "مارکس" لەهەمان دژیەکیەدا ئازار دەچەژێت کە هەموو بیرمەندانی ماددیگەرا هەوڵدەدەن تاکو بەرگری لە "مرۆڤگەراییەك" دابکەن چونکە لە کاتێکدا کە بەناونیشانی ماددیگەر، تەنها "بنەڕەتێك" واتە بە"مادده"لە بووندا ڕازین، نائومێد و بەسەرنەکەوتووانە هەوڵدەدەن تاکو بەناونیشانی مرۆڤگەرا، دان بەبنەمایەکی دیکەدا بنێت بەناوی مرۆڤ و لەئەنجامدا لەلایەکەوە کاتێك لەبارەی بوون قسە دەکەن بە "یەکتایی" و ئەگەرو ئەگەر لەبارەی"ڕەسەنێتی مرۆڤ" قسەدەکەن بەدووچاری "دوالیزمەییەك" دەبن!

چونکە ناتوانرێ مرۆڤ هەم ماددیگەرا بێتو هەم بەجیاکردنەوەی جیهانی شتە ماددیەکان، ڕەسەنێتی و سەربەخۆیی پێ بدرێت.

ئەم ئایدیالیستەکان کە بە ڕەسەنێتی مرۆڤ "مرۆڤگەرایی" قایلن، جۆرێکی دی گرفتارن، ئەمانە یان واقیعیەتی جیهانی دەرەکی نەفی دەکەن وەیان بەوجۆرەی کە

دەناسرێت ئینکاری ئەوە دەکەن و بەئایدیا (مرڤی خاوەن دەرك) رەسەنێتی دەدەن، گومان نیە کەپایەی"رەسەنێتی مرۆڤ" بەهێزو پتەودەکەن، بەلام نەفیکردنی واقیعیەتی جیهانی ماددی و نەفی زانست (پەیوەندی ئایدیا و واقیعیەت)، ئەم مرۆڤە رەسەنە و بنەرەتیە بەشێوەی"مێشکێکی رووت لەجیهانی واقیعیەت" لەجیهاندا رەهای دەکەن ووازی لێدەهێنن جیهانێکی مالیخولیایی کە لە بنەرەتدا پێوەرێك بۆ جیاکردنەوەی حەقیقەت و ناراستی، زانست و نەزانین، خێرو شەڕ، واقیعی و وەهماوی نیە و ناچار هەروەك سوفستاییەکانی یۆنانی کۆن بەداوێنی (Ego centrisme)یێك واتە: "سوڕانەوە بەدەوری خوددا" دەکەون.

ئایا مرۆڤگەرایی، هەمان ئەو سوڕانەوەیە بەدەوری خوددا (Egocentrisme)؟ دەبینین کە لە مرۆڤگەرایی "مارکس"یدا، دواجار مرۆڤ دەبێتە "شت"و لە مرۆڤگەرایی ئایدیالیستدا، مرۆڤ دەبێتە "جنۆکە"!

بەلام ئیسلام نەك تەنها لەگەڵ بنەرەتی"یەکتایی"، دژیەکی نێوان سروشت، مرۆڤ و خودای چارەسەرە کردووە، بەڵکو بەراگەیاندنی ئەم حەقیقەتە کە مرۆڤی هزریو سروشت ماددی هەردووکیان دوو بەڵگە و نیشانە یان جیلوەی جۆراو جۆری کەسێکی بالان (ذات متعالی)، دژیەکی نێوان "ئایدیا"و "ماددە" یان مرۆڤ و "سروشت"ی خستۆتە سەرپشت و لە هەمانکاتدا کەحەقیقەتی مرۆیی وواقیعیەتی ماددی بەدوو بنەمای جیالەیەك دەژمێرێت، نێوانی ئەم دووانە پەیوەستی مرۆڤی و پەیوەندی بوونی دروست دەکات، چونکە هەردووکیان بەوەدەزانێت کە لە یەك بنەمای بوون (وجود)یەوە دەرکەوتوون.

بەلام بابەتی"لەخۆبێگانەیی ئایینی" کە"مارکس" بەگواستنەوە لە"فیورباخ"ەوە پشتی پێ دەبەستێت، لە ئیسلامدا نەك تەنها راستیەتی نیە، بەڵکو بەپێچەوانەوە

خودی ئەم "لەخۆبێگانەییەی مرۆڤ بەرامبەر خودا" لەگەڵ "خود ئاگایی مرۆڤ سەبارەت بەخودا" هاوواتایە!

بۆ گەیشتن بەم "گەڕانەوەیە" بەناونیشانی گریمانە، بەڵگە هێنانەوەی فیورباخ و پاشان "مارکس"یش ئەگەر دووبارە بکەینەوە، نەفی بەرهەم و دەرئەنجامیان روون دەبێتەوە.

"خودا دەرکەوتەی شاراوەی مرۆڤە، مرۆڤی تەواو ئەو بەهاو تواناییانەی کە لە ناخیدا بوونیان هەیە، لەخودی خۆیەوە بەرەو ئاسمان دەڕوات، و دەبێتە بوونەوەرێکی سەروو ئەودیو سروشت، لەراستیدا ئەوەی کە هەیەتی و لەخودی خۆیدا بوونی هەیە دەیداتە پاڵ ئەم پەرستراوەی..."

ئەگەر بەم تیۆرە رازی بین، لەخۆبێگانەبوونمان نەفیکردووە، چونکە لەم کاتەدا، "خودا" دەبێتە هاوواتای مرۆڤ و پەرستنی خودا بەمرۆڤ پەرستنی دەگۆڕێت ولە "خودبێگانەیی مرۆڤ بەهۆی خودا" وە دەگۆڕێت بە"لەخۆ بێگانەیی مرۆڤ بەهۆی مرۆڤە"وە!

ئایا ئەمە "ئاگایی مرۆڤ سەبارەت بەخودی خۆی" یان "خودئاگایی مرۆیی" و بەدەستەواژەیەکی دیکە "مرۆڤگەرایی" نیە؟

لەبەرئەوە "خودا پەرستی" بریتی دەبێت لە مەزهەبێك کە تیایدا، مرۆڤ لەجیهانی مادديدا کەهەمیشە بەرەو ماددیەت و نزمبوونەوەی ئاژەڵیانە و کەوتنی ئەخلاقیو لەرزینی بەها باڵاکانی هەڕەشەی لێدەکات، پەرستراوی عاشیقانەی بەها بەرزو ئەودیو ماددی و بیردۆز و باڵاکانی خودی خۆیەتی!

دەبینین کە چۆن لە بەهێزترین هێرشێك کە"مارکس" دەیکاتە سەر مەزهەب، چۆن لۆژیکی "مارکس"، ئەنجامگیری "مارکس" تێك دەدات!

له راستیدا ئەم ئەنجامگیریه کە "خوداپەرستی"لە شێوەی ئاگایانەو تەواوکاری خۆیدا، نەك تەنها نەفی کەرەوەی رەسەنێتی و بنەڕەتی مرۆڤ و لەخۆ بێگانەکەری نیە، بەڵکو مرۆڤ لەپەرستن وستایشی خودا، پیرۆزی رەسەنێتیو بەبەهاو رەسەنێتیه مرۆییەکانی جەبری خۆی دەبەخشێت ودان بە"مرۆڤگەراییەکی باڵاو مانادارو خاوەن پشتو پەنا" دادەنێت و ئەمەش ئەنجامگیرییەکی لەسەداسەد ئیسلامیە.

بەپێچەوانەی تێروانینی کاسۆلیك یان سۆفیانەوە کە مرۆڤ لە بەرامبەر خودا دادەنێت، واتە لە مرۆڤ لەناوچوونو توانەوە "فنا" لە جیاتی و لە بەرامبەری مانەوە "بقا"یەکدا دادەنێت و بە مەحکومی ئیلاهی دەیناسێنێت، ئیسلام لەگەڵ بنەڕەتی "تفویض" واتە وەرگرتنی ئازادی و هەڵبژاردنی کردارو چارەنووسی خۆی لەخودا، هەم لەجەبری ماددی رزگاری دەبێت و هەم لە جەبری ئیلاهی بەوجۆرەی کەدەبینین تەنانەت مرۆڤ لەبەهەشتی خودا لە بەرامبەر فەرمانیدا سەرپێچی دەکات.

ئەم ئیرادە "ئازادو سەربەستو خاوەن هەڵبژاردنە" لەجیهان –مرۆڤ– لەلایەن خوداوە بەناونیشانی"جێنشینی لەسروشتدا" دەناسرێت.

بۆیە پاش وەرگرتنی ئەم "پلەی خودایی لەسروشتدا" کەزۆرجار هەوڵو کۆششی ماددیگەراکانە بۆ "خوداکردنی مرۆڤ" (بەدەستەواژەی "مارکس") بەهۆی تەسکی و کێشەی نزمی جیهانبینی ماددیگەری پلەیەکی لەم جۆرە کە وێنا ناکرێت –خودای گەورە هەموو فریشتەکانی دەخاتە کڕنوشەوە بۆی و هەموو هێزی سروشتی دەخاتە بەردەست.

دەبینین کە مرۆڤ لەجیهانبینی ئیسلامیدا، لەپەیوەندیدا لەگەڵ سروشت، ئیرادە فەرمانڕەوایە و بەدەربڕینێك خودای سروشتە و لەپەیوەندی لەگەڵ خوداشدا جێنشینیەتی.

دەبینین ئەوەی کە"مارکس" بە"لەناوچوونو هیلاکی لە ئایینـدا" ناوی دەبات، لەگەڵ ئەم تێگەیشتنەی کەدەقی قورئان پێکدەهێنێت تاچ جێگایەك بێگانەیە!

ئەو هۆکارە سەرەکیەی کەوایکردووە "مارکس" بڵێت: "لەخودا بێزارم" بنەڕەتی پەرستنش و گوێڕایەڵیەکە لە پەیوەندی خوداو مرۆڤدا بوونی هەیە.

بەڵام بەپێچەوانەی "مارکس" کە بەپێوانەی جۆری گشتی وداروخاوی لە نێوان خورافە پەرستانی دواکەوتوو، ڕووی نارێکی و لە ناوچوون و لەخۆ بێگانەیی دەژمێردرێت، ئیسلام ئەوە لەزمانی خودا، هۆکاری گەشەو تەواوکاری خودایی مرۆڤ ڕاڤەی دەکات:

عبدي اطعني حتى اجعلك مثلي

واتە:( بەندەکەم، گوێڕایەڵیم بکە، تاکو وەك خۆمت لێ بکەم! !)

دەبینین کەپەیوەندی مرۆڤ و خودا لەفەلسەفەی ئیسلامیدا پەیوەندیەکی بەرامبەرییە کە تیایدا" خودناسی" لەگەڵ "خوداناسیدا" دەبنە هاوواتا و تەنانەت یەکەمیان دەبێتە پێشەکی بۆ دووەمیان ولێرەدایە کەدەتوانرێ ئەم گوتە گەورەو قوڵەی ئەو عاریفە ئێرانیە دەرك بکرێت کەدەڵێت:

"چەندین ساڵ بەدوای خودا دەگەڕام، خۆم دەدۆزیەوە، ئێستا بەدوای خۆمدا دەگەڕێم خودا دەدۆزمەوە" دروست بەپێچەوانەی ڕوانینی "فیورباخ" و"مارکس"، ئەوە مرۆڤ نیە کە خودای دروستکردووە و بەها تایبەتیەکانی خۆی تێدا داناوەو

دەیانپەرستێت، بەڵکو ئەوە خودایە کە مرۆڤی دروستکردووە و بەها تایبەتیەکانی خۆی تێدا داناوە!

لەبەرئەوە "مارکس"، ئەگەر لە جیاتی تۆمەتی"لە خۆبێگانەیی مرۆڤ بەرامبەر بەخودا" تۆمەتی لەخۆبێگانەیی خودای لە بەرامبەر مرۆڤێکدا تەرح بکردایە بەلایەنی کەمەوە قسەکەی بەناونیشانی"تەنزێکی فەلسەفی" جێگای سەرنج بوو.

*  *  *

دەبینین کە ئێستای ئیدی قسە لەدژایەتی و دژیەکی مەزهەب و ماددیگەری، یان ئیسلام‌و ماددیگەری دیالێکتیك ناکەین، بەڵکو بابەتی مرۆڤ جێگای قسەکردنەو ئەم بابەتەش دەخرێتەروو.

هەر ئایدۆلۆژیایەك، چ مەزهەبی و چ دژەمەزهەبی، ناچار بەدەوری مرۆڤدا دەسورێتەوە وکتومت لەهەمان جێگادایە کە"مارکس"یزم زۆرترین ماوەو نێوان لەگەڵ ئیسلامدا دروست دەکات و ئەم ماوەو نێوانەش کە هەمیشە لەحاڵەتی زۆربووندایە، هۆکاری جیهانبینی دوو جیهانبینی دژیەکە کە ئەم دوو ئایدلۆژیایە لەو جیهانبینیانەوە سەرچاوە دەگرێت و لەسەر بنەمای ئەوانیش راڤەو رێنمونی دەکات و لێرەشدایە کە ئیسلام و"مارکس"یزم لە هەموو زەمینە سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، ئەخلاقیەکان لەگەڵ یەکدا حاڵەتی ناسازگاری پەیدا دەکەن. ئیسلام مرۆڤ لەسەر بنەمای"یەکتایی" راڤە دەکات و مانای پێ دەبەخشێت و"مارکس"یزمیش لەسەر بنەمای"بەرهەمهێنان".

بێگومان "مارکس" ئاگادارە کە هەموو بەها ئەخلاقیی و رەسەنێتیەکانی"مرۆڤگەرایی مرۆڤ" کە تەنانەت خودی خۆشی، لە هەندێك لە

نووسینەکاندا بەشەوق و تاسەوە ستایشیان دەکات و بەم جۆرە خراپی و تێکچوون دروست دەکات، چونکە هەموو ئەو بەهایانەی کە مرۆڤ دروستیان دەکات یان خاوەنیانە، راستەوخۆ بە "ئامێری بەرهەمهێنانە" دەیان گوازێتەوەو "رەسەنێتی مرۆڤ"ە "مارکس"یی دەگوڕێت بە "رەسەنێتی ئامرازو ئامێری ئابووری"، بەلام لەسنوری جیهانبینی تەسک و هەژارانەی ماددیگەری، بەرێزتر لە هۆکاری بەرهەمهێنانی ئابووری، هۆکارێکی دیکە پەیدا دەکات.

ئەمەیەکە دەبینین هەم لە ئایدۆلۆژیاو هەم لەکرداردا، کۆمۆنیزمی "مارکس" کە هەوڵیدەدا تاکو لەسەر ئەو بنەڕەتە بالاترین بەهاکان و ئایدیا ئەخلاقیەکان و مرۆییەکان ئاراستە بکات و بەبەدیهێنەری "مرۆڤگەرایی" بیان بزانێت، بەخێرایی بە "ئابووری" یان رەسەنێتی ئابووری گۆڕدرێت.

لەبەرئەوە "ستالیزم" کە بە ئابووری پەرستی و دەمارگیری سەبارەت بەزیادبوونی بەرهەمهێنان پشت بەستنێکی سنورداری هەبوو، بەجۆرێك لە "لادان لەهێڵی رۆیشتنی مارکیسزم" یان تاوانبارکردووە، "لینین" تۆمەتبارییەکی لەم جۆرەی نیە وتارادەیەك هەموان بەدرێژاەپێدەر و بەدیهێنەری راستەقینەی رێگەی "مارکس"یزمی دادەنێن و رێککەوت نیە ئەگەر لەیەکەمین ساڵەکانی شۆڕش "مارکس"یزمدا، پشت و پەنای بنەڕەتی هەموو هێزو تواناکانی شۆڕش دەخاتە سەر "پیشەسازی قورس" و "فراوانی ئابووری" لەو رێگەیەوە، مەرجی بەدوا ئامانجەکانی کۆمۆنیزم ئەوە رادەگەێنێت و بۆگەیشتن بەم ئامانجە، پشت بە سێ بنەما دەبەستێت:

١- پیشەسازی بوونی خێرا بەپشت بەستنی سەرەکی لەسەر دروستکردنی پیشەسازی قورس.

٢- بەرنامەرێـژی سـەراپای هەرچـی زیـاتری تاکـەکانی کۆمەڵگـە لەسـەر بنـەمای ڕێکخراوی بورورتەکنۆکراتی ورد کە بەدەستەواژەی خودی "لیـنین"، "دەبێـت تەقلیدی سەرمایەداری بکرێتەوە."

٣- دروسـتکردنی چـاودێری جولآنـدنی هەولـە تـاکو گـشتیەکان بەمەبەسـتی زیادکردنی پێـشبڕکێی بەرهـەمهێنان، لەرێگـەی"هەڵکەنـدنی هەسـتی سـوودی داخوازیە تاکە کەسیەکان بەشێوەی نایەکسانی کرێکارن و بەخشینی پاداشـتی ماددیو کارکردنی خاوەن کەسە لێهاتووە هونەری و تواناى بەڕێوەبردن."

دەبینین ئەوەی بەناوی"ئابووری ستالینی" هێرش دەکەنە سەر (تەنانەت زۆرێـك لـە کۆمۆنیستەکانیش) سیستەمێکە کەهێڵی بنـەڕەتی رۆشـنبیری خـودی "لیـنین" وێنـەی کێشابوو و دەبێـت ئـەم خاڵـەش زیـاد بکرێـت کـە ئـەوەش "لیـنین" وێنـەی کێـشابوو، هێنانەدی دروشمێکە کە بەناونیشانی مەرجی بینـای کۆمەڵگـەی ئایـدیاڵ، "مـارکس" و "ئەنگلس" رایانگەیاند بوو!

چۆنە کە "عەدالەت و یەکسانی" کـە بنەمایـەکی مرۆییـە لەپەیوەنـدی کۆمەڵایەتیـدا لە"مارکس"یزمدا بەهۆی کۆمەڵێك مەرج دەبێـت کـە هـەمووی لەسیـستەم و فەرهـەنگو ئـەخلاقی سـەرمایەداری رۆژئـاواوە وەرگـیراوە، واتـە:- ١- ماشـینیزم، ٢- بـورور تەکنۆکراتی، ٣- داخوازی زیاتری ماددی، ٤- چاودێری ئابووری، ٥- بزواندنی سوودی تاکەکەسی!

دواجـاریش، ئامـانجی کۆتـایی: "بەشـداربوونی هەرچـی زیـاتر لـە ژیـانی مـاددی." لەبەرئەوە خۆبەخۆ ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە کە:-

کەواتە جیاوازی بنەڕەتی نێوان فەلسەفەی ژیانی نێـوان "مـارکس"یـزم و بورجـوازی چیە؟ چـونکە جیـاوازی نێـوان ئـەم دووتـەرزە کـە "سـەرمایە لەبەردەسـت چـینێك و

تویژژێکدا بێت" یان "لەبەردەستی دەوڵەتدا" جیاوازی نێوان دوو "سیستەم"ە نەك جیاوازی نێوان دوو "فەلسەفە" یاخود دووجۆر تەرزی فیکری و تێگەیشتن سەبارەت بەژیان، مرۆڤ، بەها ئەخلاقیەکانو جیهان.

لەبەرئەوە ئەگەر بەم جۆرە بڕیاربدەین کە لەدیدو تێڕوانینیەوە، "مارکس"یزمیش خاوەنی جیهانبینیەك و مرۆڤناسیەكو ئەخلاقی بورجوازیە و لەگەڵ ئەوەشدا شوێنی گەشەی پەیدابوونی ئەو فەرهەنگی بورجوازی رۆژئاوا بووەو داخوازی"ژێرخانی بەرهەمهێنانی سەردەمی خۆیەتی" لەرووی پێکهاتەی مەعنەوی رۆح و ئامانجی ژیان لەگەڵ دوژمنی خۆیدا واتە بورجوازی رۆژئاوایی هاوبەشە، ئایا بڕیارێکی دوژمنانەمان داوە؟

نەخێر هەرگیز! چونکە بورجوازی رۆژئاوایی، لەگەڵ ئەوەی کەخودی "مارکس"یش بەوە رازیە، تەنها جۆرێك سیستەمی ئابووری نیە، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی رۆح و وانین و مرۆڤناسی و فەلسەفەی ژیان و ئەخلاقی تایبەتە کە بەنەفیو وەستانی هەموو بزوێنەرە مەعنەوی و فەرمانڕەوای رۆحی نزمی ماددی بەسەر هەموو تایبەتمەندیە بەرزە مرۆییەکان، مرۆڤ بەبوونەوەرێك دادەنێت کە"هەرچی زیاتر کاردەکات و هەرچی زیاتر فێڵ دەکات و هەرچی زیاتر شەڕ دەکات، تاکو هەرچی زیاتر بخوات."

بۆیە بەگوتەی "پرۆفیسۆر گرابرت": "جگە لەمەیە کە"مارکس"یزم لە کۆتاییدا هەوڵدەدات تاکو کۆمەڵگەیەکی سەراپا بورجوازی بوونیاد بنێت؟ واتە جیاوازی نێوان "مارکس"یزم و بورجوازی رۆژئاوایی لەوەدایەکە ئەم "چینێکی بورجواز" و ئەو "کۆمەڵگەیەکی بورجواز" رادەگەیێنێت و بڵاودەکاتەوە.

سنت سیمۆن (Saint Simon) بوونیاتنەری مەزهەبی"پیشەسازی پەرستی" کۆمەڵگەی بە دوو چین دابەش دەکرد. "چینی پیشەسازی کە لە بەرهەمهێنانی

ئابووریدا ڕۆڵیان هەیەو بریتین لە: کرێکاران و ئەندازیاران و سەرمایەداران و بەڕێوەبەرانی کارگەکان و"چینی مشەخۆرەکان" کەبریتین لە هەموو ئەو کەسانەی کەمەسرەف دەکەنو بەکارهێنن، بەڵام لەبەرهەمهێنانـدا بەشـدارییان نیـە، وەك:– ڕۆشـنبیران، نووسـەران، هونەرمەنـدان، ڕۆحانیـەکان، فەیلەسـوفان، قارەمانـان، سیاسـەتمەداران، وەرزشکاران و سەربازان....

تێڕوانینێکـی لـەم جـۆرە کـە ترۆپکـی ڕۆح و فیکـری"بەرهـەم پەرسـتی مـاددی" پیشاندەدات و تەنانەت ڕیچکار و سەرمایەدار لەچینێکدا دادەنێت و ئەویش دژی هەموو هێزە مەعنەوی و فەرهەنگیەکانی کۆمەڵگەی مرۆیی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دژیەکیـەی کـە بەرووکەش لەڕوانینی"کۆمەڵناسی" لەگەڵ "مارکس"یزمدا هەیەتی، لەکرۆك و ناوەڕۆکی فەلسەفی و مرۆیی لەگەڵ "مارکس"یزم هاوشێوە و لێکچووە.(١)

لـە روسـیادا، نووسـەرێکی گـەورە، کتێبێکـی بـەناوی culte de ciment واتـە "ئایینی چیمەنتۆ پەرستی" نووسی کە لە ژێر کاریگەری ئەو ڕۆحیەتـەی کەدروسـتیان کردبوو، ئەوەی دەسەلماند کە شارسـتانیەتو فەرهـەنگو خۆشـبەختی مـرۆڤ لەمـەودوا لەئەستۆی خودا، ئەخلاق، فەلسەفە و زانستی تیۆری، کەوتۆتە ئەستۆی"چیمەنتۆ"!

لێرەدا ئەوەندە بەسـەر بڕیاری یـەکێك لـەدیارترین و دەرکـەوتوترین و بـاوەڕدارترین بیرمەندانی "مارکس"یزم هاوچەرخی "لینین" و تەنانەت "ئەنگلس" بگوازینەوە کـە لـە کتێبی"ڕوخساری نـوێی سۆشـیالیزم" بـە فـەرمی لەدەسـتەواژەیەکی دیـاردا دەڵێـت: ""مارکس"یزم، فەلسەفەی بەرهەمهێنەرانە."

---

١ جگە لەمە کە لە بنەڕەتدا مارکس، تێڕوانینـی "چینە کۆمەلایەتیـەکانی" خـۆی کـە شـتێکی پـچڕاو بەشبەش لە کۆمەڵناسیو فەلسەفەی مێژووی خۆی تەرح دەکات، لە گسن سیمون" وەریگرتووە.

دەبینین کەچۆن هەرچەندە لە"ئایدیای هاویەش وگشتی مرۆیی" لەدەق و رۆحی فەلسەفەی "مارکس"ی نزیک دەبینەوە، رۆحی فەلسەفەی ئیسلامی دورتر دەکەوینەوە.

ئیسلام، لە ووشەیەکدا، "فەلسەفەیەکی رزگاری مرۆیی" (فلاح)ە و هەر بەو جۆرەی کە لە یەکەمین پەیام و دروشمی بانگەوازی خۆیدا ئەوە رادەگەیێنێت (قولوا لا الـه الا الله تفلحوا)، یەکتایی و یەکتاپەرستی بە قوتابخانەی بنەڕەتی و رێگەی سەرەکی گەیشتن بەم ئامانجە (فلاح – سەرکەوتن) دەناسێنێت.

دەبینین کە چۆن لەهەمان سەرەتای، مرۆڤگەرایی ئیسلامیەوە بەرەو رووی جۆرێك ئاگایی بەرزدەبینەوە و مرۆڤگەرایی "مارکس"یش بەرەو جۆرێك "بەرهەمهێنان".

ئایا ئیسلام، بەم جۆرە روو بە ئایدیالیزمێکی عیرفانی دەکات کە لەگەڵ واقیعیەتدا بێگانەیە؟ وە ئایا ئیسلام بنەمای"عەدالەت"ی هەروەك ئایینە سۆفیانەو فەلسەفە رۆحانیەکانی دیکە لەبیری خۆی بردۆتەوە؟ هەرگیز، ئیسلام هەم خۆشگوزەرانی ئابووریو هەم دادپەروەری کۆمەڵایەتی بەناونیشانی بنەمای سیستەمی ژیان خۆی تەرحی کردووە و پشتی پێبەستووە، دواجار ئابووری و عەدالەت لە ئیسلامدا بەناونیشانی دوو "هۆکاری پێشەکیو پێویست" باس دەکرێت و دەخرێتەروو کە بتوانن مرۆڤ لەهەژاریو دووری و پچڕان رزگاری بکەن، تاکو بتوانێت بەرەو گەشەی ئەخلاقی و تەواوکاری جۆری وگەورەیی و سەربەرزی ئازادی"فیترەتی خودایی" خۆی _کە فەلسەفەی بنەڕەتی ژیانی مرۆڤە لە ئیسلامدا_ بڕوات.

جگە لەمەش، پێوەری بنەڕەتی دەربڕینو دەستەواژەی "بەهائەخلاقیەکانی مرۆڤ" یان "مرۆڤگەرایی" نێوان ئیسلام و "مارکس"یزم جیاوازە.

کاتێك "مارکس" قسە لەسەر مرۆڤ دەکات و بەتایبەت کاتێك کە بەوردبینیەکی قوڵ و زۆررتوند، سەرمایەداری فەرهەنگو سیستەمی کۆمەڵایەتی بورجوازی و پیشەسازی رۆژئاوا ڕیسوا دەکات و لەو زیانو لەناوچوونەی کەفیترەتی مرۆڤ لەم سیستەمەدا تووشی دەبێت و بەرگری لە مرۆڤ و ئازادی بوونی مرۆڤ دەکات "ئاوازێکی عاریفانە" دەگرێتەبەرو و بەجۆرێك قسە لەسەر مرۆڤ دەکات کە دەڵێی "عارف"ێك و "فەیلەسوفێکی ئەفلاتونی"، "نووسەرێکی ئەخلاقی" و"رۆحانیەکی مەزهەبی"یە: "مارکس" لەتاوانبارکردنی ڕژێمی سەرمایەداری کە بەسەر سەرمایەداری تایبەتی، وەرگرتنی کرێ لەکرێکار، بەهای پارەو بنەڕەتی چاودێری...وەستاوە، زۆرترین پشت بەستنی لەسەر ئەوەیەکە لەم سیستەمەدا "حەقیقەتی مرۆڤ" کە "کرۆك و ناوەڕۆکێکی بەرزو باڵایە"، ناتەواو، کەموکورت، پیس دەبێتو "ئەخلاقی نزم، جێنشینی ئەخلاقی مرۆیی" دەبێت.

تەنانەت "مارکس" کاتێك لەبارەی ماددیگەرییەوە قسەدەکات، لەپەیوەندیدا لەگەڵ مرۆڤ، یەکێك لە "ئەخلاقیەکان" بەیاد دەهێنێتەوە لەوێدا کە دەیەوێت ئەوەبسەلمێنێت دەبێت بەچ بەڵگە گەلێك "ماددیگەری پایەی کۆمۆنیزم بێت"، کۆمەڵێك سیفەتو تایبەتمەندی دەخاتەپاڵ ماددیگەری کە لە بنەڕەتدا لەسنورو چوارچێوەی مەزهەبو یان بەلایەنی کەمەوە "فەلسەفەی ئەخلاق"ەو لەدیدی کۆمەڵناسی "مارکس"ی بەتەواوی لایەنی "ئایدیالی" هەیە.

تەنانەت لەو جێگەیەی بەرگری لە مرۆڤ وستایش چینی پرۆلیتار دەكاتو هێرش دەكاتە سەر مەسیحیەت، كەچی ئاوازێكی "مەسیحی"هەیە و ووشە گەلێك بەكاردەهێنێت كە لە "ئەخلاقی رۆحانی" یان "ئایدیالیزمی ئەخلاقی"یە:

بنەما كۆمەڵایەتیەكانی مەسیحیەت، "بێ غیرەتی، سوكی و هیچی، خواریو ناپێكی، فەرمانبەرداری، خۆشبەختی" و بەكورتی هەموو "سیفەتە نەرم"ەكان باس دەكات، چینی پرۆلیتار كە بەم نەرمیە رازی نابێت پێویستی بە"ئازایەتی، رێزگرتن لەخود، غرور، حەزكردن لەسەربەخۆیی"یە زیاتری تاكو "پێویستی بەنان"!

ئایا ئەمە "ماركس"ە كە قسە لەسەر مرۆڤ و چینی پرۆلیتار دەكات یان "رۆسۆ" یان بەلایەنی كەمەوە "ئێرنست رینان" و "ئیستوارت میل"؟

"ماركس" فەیلەسوف كە قسە لەمرۆڤ دەكات، مرۆڤگەرایی خۆی لەو توخمانە بیناكردووە كە راستەوخۆ لە مەزهەب، عیرفان، فەلسەفەی ئەخلاقو بەتایبەت مرۆڤگەرایی سەدەی هەژدەو سۆشیالیزمی ئەخلاقی ئەڵمان لەسەرەتاكانی سەدەی نۆزدەهەمەوە وەریگرتووە، بەجۆرێك كە تەنانەت كەسانێكی وەكو "پیتر" بەرەسمی بەناونیشانی مرۆڤی"عیرفانی" یان "مەعنەوی" لەفەلسەفەی مرۆڤگەرایی "ماركس"یزم باسیان كردووە. ئەم دەربڕینو باسكردنەیش نەك تەنها زیادەڕۆیی تێدانیە، بەڵكو تەنانەت بەسەراحەت دەتوانرێ بوترێت كە مرۆڤێك كە لەم قۆناغەدا جێگەی پرسیارو ستایشی "ماركس"ە، "خودایە كە لەسەر رووی زەوی، لەسەر دووپێ دەجولێت".

بەڵام هەركە "ماركس"ی فەیلەسوف" لەقسەكردن دەوەستێت، "ماركس"ی كۆمەڵناس" هەرچی چنراوە، هەمووی بەجارێك دەكاتەوە بەخوریو ئەو مرۆڤەی كە لەسەر عەرشی سەربەخۆیی گەورەییو خودایی جیهان دانیشتبوو، كاتێك دێتە سەرزەوی و ئەم "بەدیهێنەرە گەورەیە" كە لە جێگەی خودادایە و هەم خۆی دروست

دەکات و هەم مێژوو و سروشت بەئیرادەی خود ئاگاو فەرمانڕەوای خۆی دەیگۆڕێت، لەناکاو دەبێتە دروستکراوێکی ئامێری کاری ئابووری خودی خۆی، ئامێری کارێك کەخودی خۆی دروستکراوی جەبری یاسای دیالێکتیکی ماددی مێژووە و ئەم ئامێرەی کارە کە دوو "شت" دروست دەکات:

یەکێکیان "کاڵا"و ئەویتریان "مرۆڤ"!

"مارکس"ی"کۆمەڵناس"، بووەتە "شێوە خودا" لەناکاو "مارکس" فەیلەسوف بەمرۆڤێکی بە"کاڵا" کراو دەگۆڕێت و بەئاوازێك قسە لەپێکهاتەی مرۆڤ دەکات کە جێگەی ئەوەیە ئەگەر "مارکس" نەکاتە فەیلەسوف، بەلایەنی کەمەوە دەیترسێنێت.

"مارکس" و بەدوای ئەویشدا "ئەنگلس" بەناونیشانی رزگاری لەتەنگیو نارەحەتی دژە مرۆیی"سروشتگەرایی نزم و ماددیگەرای گشتی" ئەوە رادەگەیێنن هەموو سەرئەنجامە تاڵ و شومەکانی رزگارمان دەبێت، چونکە دیالێکتیك مرۆڤ نەك بە شێوەی"شتێکی ماددی" یان "بوونەوەرێکی سروشتی" جێگیرو ووشك، بەڵکو بەشێوەی حەقیقەتێك لەحاڵەتی"کردن"دا لەسەر بنەمای کۆکردنەوەی دژیەکی و خودسازی لەحاڵەتی گفتوگۆ دەخاتە بەرباس و توێژینەوەوە.

ئەگەر "هیگڵ" فەزیلەتێکی لەم جۆرەی بۆ دیالێکتیکی خۆی رازی بوو، قسەکەی جێگای تێرامان بوو، چونکە ئەو مرۆڤ بەدواشتی کۆتایی"ئایدیای رەهای بوون" وەردەگرێت، ئایدیایەك جیهانی ماددی بەناونیشانی"دژە تێز.."ی ئەو دەردەبڕێت. لەبەرئەوە لەپەیوەندیدا لەگەڵ سروشت و ماددە، مرۆڤ لە دیالێکتیکی "هیگڵ"دا، هۆکاری ئازاد و ویل و توخمی بەڕێز و ڕێزلێگیراوە، بەڵام "مارکس" ئەوەی بەگوتەی خۆی هەڵیگەڕاندۆتەوە و پێشخستنی ماددە بەسەر ئایدیاداو راگەیاندنی ئەوەی کە"ئایدیا" لەخودی ماددە بەشێوەی جەبری لە مرۆڤدا جێگەی دۆزیوەتەوە، مرۆڤ

بەناونیشانی بوون و خودێکی بیرکەرەوەو ئاگاو خاوەن ئیرادە بەدرێ دەخاتەوەو بەمجۆرەی کە "مارکس" لەبارەی کارێك کەدەربارەی دیالێکتیکی "هیگڵ" و مرۆڤی "هیگڵ"ی کردوویەتی، بەوەپیشانی دەدات بەوجۆرەی کە مرۆڤ لەلای "هیگڵ" لەسەر رووی سەری وەستاوە، بەم هەڵگەڕانەوەیە، ئێستا لەسەر رووی دووپێی وەستاوە و لە جووڵەدایە.

بەڵام بەگوتەی نووسەرێکی ئیسلامی کە تانە لەم قسەیەی "مارکس" دەدات و دەڵێت: ئایا لەراستیدا، مرۆڤ بوونەوەرێك نیە کە لەسەرسەری بەرێگادا دەڕوات"؟ "مارکس" لەسەلماندنی "دیالێکتیکی ماددی" خۆی پشت بە "هراکلیت" فەیلەسوفی یۆنانی کۆن دەبەستێت کە دەڵێت: هەموو شتێك لەحاڵەتی گۆڕاندایە: "لە رووبارێکدا زیاد لەجارێك مرۆڤ ناتوانێت بچێتەوە ناویەوە." بەڵام لەراستیدا، "مارکس" ئەگەر دیالێکتیکی "هیگڵ"ی هەڵگەڕاندوەتەوە، ئەوا دیالێکتیکی "هیراکلیتی" بەتەواوی وێران کردووە!

"هراکلیت"، لەهەمانکاتدا کە هەموو شتێك بەوە دەزانێت لەحاڵەتی گۆڕاندایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەئاشکرا دان بەدوو "بنەمای جێگیر"دا دەنێت، یەکێکیان "جەوهەری بەرزی پیرۆز" کە بە "ئاگر" دەریدەبڕێت و ئەوی دیکەیان ناوی "رێکخستنێکی لۆژیکی جێگیر" کەناوی "لۆگۆس _ logos"ی لێدەنێت.

ئەم دیالێکتیکە، لەگەڵ دیالێکتیکی بەتەواوی ماددی "مارکس" کە بەگوتەی "لینین" "تەنها بنەمایەك کە لە بووندا بەجێگیری دەزانێت، بنەمای گۆڕانە" کەمترین لێکچوونی نیە.

بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەم دیالێکتیکە لەگەڵ تێڕوانینی دژ عیرفانی لە مەزهەبە رۆژهەڵاتیەکان بەتایبەت زەردەشت، مانی و ئایینیەکانی یەهودو مەسیحیەت و ئیسلامو

تەسەوفی رۆژهەلاّتی زۆر لێکچوو و هەماهەنگە. چونکە لەم تێڕوانینەدا لەگەڵ ئەوەی کە جیهان و مرۆڤ لەسەر خەباتی دژەکان (چاکە و خراپە، ئەهوراو ئەهریمەن، رووناکی و تاریکی، مرۆڤ و شەیتان...) وەستاوە، لەهەمانکاتدا دوو بنەمای جێگیر بوونیان هەیە، سیستەمێکی تەواوی جیهان‌و ئەویتریان زاتی قودسی یان رۆحی نەمرو فەرمانڕەوا بەسەر جیهان.

بەلاّم دیالێکتیکی "مارکس" کە ئەم دوو بنەما جێگیرەی نەفی کردووەو تەنها بە"گۆڕانی رەها لەسەر بنەمای دژ" رازییە، سروشتیە کە ناتوانێت لەسەر "رەسەنێتی مرۆڤ" یان "بەهاهەمیشەییەکانی ئەخلاقی مرۆیی" پشت ببەستێت، چونکە لەم "رووبارەی کە دەجولێت‌و لەرۆیشتندایە" هیچ شتێك بوونی نیە شایەنی ئەوەبێت پشتی پێ ببەسترێت و لەبەرئەوە سروشتیە کە "جەوهەری مرۆڤایەتی"و "بەها ئەخلاقیەکان" کە لە بەرگری "مرۆڤگەراییدا" جێگەی پشت بەستنی "مارکس" بوون، لە کۆمەلگەی "مارکس"یدا بەشێوەی سیفەتی نەگۆڕو ئەو شتانەی کەنرخیان بۆ دانانرێت بەرهەم بهێنرێن کە بەپێی داخوازی دۆخی بەرهەمهێنانی ئابووری هەر سیستەمێك شێوەیان دروست دەبێت‌و شێوەیان گۆڕانی بەسەردا دێت‌و هیچ بنەمایەك نامێنێتەوە و بەگوتەی "لینین" هەموو "بنەمایەکی ئەخلاقی درۆ"دەبێت!

بەلاّم لە ئیسلامدا، کە ئیبلیس لەدژی توخمی خودایی مرۆڤدایە، لەبەرئەوەی بۆدروست‌و سەرەتای گەشەی ئەم بنەمایە، جیا لەسروشت ماددی، ماددەو ژێرخانی بەرهەمهێنانی کۆمەلگە... بەسەرچاوەیەکی بالاّتر قایلەو ئەویش هەمان ئەو خودە نەمرو بنەما جێگیرو نەگۆڕەیە کە لەم رۆیشتنی دژو گۆڕانی جیهان و کۆمەلگەدایە، دەتوانێت لە "بەها ئەخلاقیە جێگیرو رەسەنەکان"، لە"فیترەتی چاك و پیرۆز" و لە"پایە بالاّکان کە جۆری مرۆڤ دروستی کردوون" قسە بکات.

"مارکس" دەڵێت: "بنەماو پایەی مرۆڤ لەسەر چاکەیە" بەڵام یەکەم لەجیهانی مادیدا، "چاکە"چیە؟ دووەمیش لەم ڕێگە ڕۆیشتنە لۆژیکیەدا کە هەموو شتێك لەگۆڕانی و توانەوەدایە، قسەکردن لە"پایەیەکی جێگیر" بەتەواوی دەستەواژەیەکی دژە دیالێکتیکیە !

ئیسلام لەهەمانکاتدا کە هاوڕایە لەگەڵ ئەزموونی زانستی سروشت، هەموو شتێك بەجێگەی"دروستبوون و خراپ بوونە" وەردەگرێت، و باوەڕی بە"لایەنێکی تەواوکاری جێگیر" هەیە کە هەر شتێك لەم ڕێڕەوە دابێت، لەجیهاندا نەمر دەمێنێتەوە:
﴿کل شی هالك الا وجهه﴾، هەموو شتێك لەناو دەچێت جگە لەوەی کە لە لای ئەوەوەیە !

ئیسلام دەربارەی مرۆڤ بڕیارێکی نازانستی و ناواقیعی نیە، ئەو بەدروستبوو لە "خاك (مادده)" دەژمێرێت، بەڵام لەبوونیادیدا "ئامادەگیەکی ناخاکی" کە ناوی"فیترەت"ەو قابلیەوەی کە دانەوەی"ئیرادەی ڕەهای جیهانی" واتە، خودایەو بەم جۆرەیە، مرۆڤ لە نێوان سروشت و خودا، بوونەوەرێکی دوولایەنە کە جووڵەی تەواوکاری خۆی بە"ئیختیاری خۆی" لەخاکەوە بەرەولای خودا درێژە پێدەدات ولێرەدایە کە دەربارەی ووشەی"بەرپرسیاریەتی" و هەم پایەی"چاکە" مانایەکیان هەیە.

"فطرة الله التی فطر الناس علیها"

بەم جۆرەشە کە دەتوانرێت لە مرۆڤگەراییەکی لۆژیکی و ڕاستەقینە قسە بکات، مرۆڤگەراییەك کە نە لەچاڵی مادیگەریدا دەکەوێت و نەیاری مندالانەی ناخود ئاگاو بێ ئیرادەی و ئایدیایەکی رووتی میتافیزیکیەکە لە واقیعیەت و سروت و نیشتمان پچڕا بێت.

بەم جۆرەیە کە ئیسلام، بەپێچەوانەی "مارکس"یزم دەتوانێت لە کۆمەڵێك بنەما بەناوی"عەدالەت، شەرافەت، هیدایەت، ئاگایی، بەرپرسیاریەتی و بەها ئەخلاقیەکان و

تایبەتمەندیـە مرۆییـەکان لـە هـەموو سیـستەمەکان"و لـە درێـژایی هـەموو قۆنـاغ سـەردەمەکانی مێـژوو بـەرگری بکـات و تـەرحکردن یـان هێنانـەدی ئـەو شـتانەش بەدروستبوونەو دەرکەوتنی "ئۆتۆمبیلی هەڵمی" نەبەستێتەوە.

## ئەنجامگیری کۆتـایی:

ئێستا ئەنجام روونە. کۆتا رستە جارێکی دی لەسەرتاوە بڵێینەوە: "مرۆڤگەرایی کـە پاش رێنسانس، هـەموو رۆشـنبیرانی مـرۆڤ دۆسـت، هـەموو ئومێـدێکی خۆیـانی پێـوە بەستبووەوە تاکو لە جیاتی مەزهەب، رزگاری مرۆڤ بخاتە ئەستۆی خۆیەوە، بەهـەموو قوتابخانە بۆ خوداکانی سەدەکانی نوێدا، بەشێوەی ووشەیەکی پـیرۆز دەرکـەوتووە و ناسراوە کـە لـە یەکـەمین شـیکردنەوەی لۆژیکیـدا پـیرۆزی لەدەسـت دەداتو دەبێتـە ووشەیەکی وەهمـاوی کـە هـەروەك زاراوەیـەکی ئـەدەبی، بـاس لەبـەها یۆتۆپیـەکان و نموونەی (مثال) ئەفلاتۆنی دەکات، کە بەهـەمان ئەنـدازە کـەجوانو بـەرزە لـەجیهانی واقیعیدا جێگای سەرنجو ناموکینە."

لەراستیدا، مرۆڤگەرایی کۆمەڵێك لەبەها خوداییەکانە کە دیاری مەزهـەب بـووە لـە فەرهـەنگی و ئـەخلاقی مرۆییـدا و ئایـدۆلۆژیا نوێیـەکانیش، بەنـەفیکردنی مەزهـەب لـە ئاراستەکردنیدا بۆ توانا ماونەتەوە و لە ئەنجامدا ئەم قوتابخانانە کە خۆیان بەجۆرێکی دەمارگیرانـەی واقیعیەتگـەرا دەژمێـرن، لەبـەریگردن لـە مرۆڤگـەرایی لـە ئـەفلاتۆنیش ئایدیالی (مثـال)ی تـر دەبـن، هـەروەها بەهـەمان ئەندازە کەخۆیان بـە بانگەشـەکەری مرۆڤگەرایی ناودەبەن، لە کـۆتو بەنـدێکی "خـەیاڵی مـاددی"دا زیـاتر بەنـدی دەکـەنو بێچارە مرۆڤ کە هەمیشە لەبری سەرکەوتن بە "کارەسات" گەیشتووە.

لەراکردنی لە ستەمی دەسەلاتداران و بەندەیی رووی لە مەزهەبە گەورەکان کردووە و بەدوای پێغەمبەرانەوە رێگەی بریوە، پاش جیهادو شایەتیدانو گرفتاری موریدان و جێنشینانو لە هەمووی بەسوێتر، خنکێنەری ترسناك و رەشی کڵێسای سەدەکانی ناوەڕاست بوویەوە کە تیایدا پاپ _بەنوێنەرایەتی خودای ئاسمان_ هەروەك یەهودی ترسێنەر و هێز لەزەویدا، حکومەت دەکاتو هەرسێ دەسەلاتی سیاسەتو موڵکایەتیو ئیمانی گرتبووە دەستی خۆی و عەقڵ و زانستیش سواری دەسەلاتی بووە.

جارێکی تر پاش چەند وەچەیەك خەبات و فیداکاری لەگەڕان بەدوای رزگاریدا، رێنسانسی کرد تاکو مرۆڤ دڵی بە"زانست"ەوە بەستو "ئازادی"یش تاکو ئەوەی بەناوی ئایینەوە خستوویانەتە سەر، رزگاری بکات.

گەیشتە "لیبرالیزم"و لە جیاتی حکومەت "ثیوکراسی، دیموکراسی" کردە چەتری رزگاری خۆی.

گرفتاری سەرمایەداری زبربوو کە تیایدا دیموکراسی بەهەمان ئەندازە درۆزن بوو کە ثیوکراسی و لیبرالیزم مەیدانو گۆرەپانی یاری بوو و تیایدا تەنها "سوارەکان" سەربەرزو لەسەرەوە بوون و لە چاودێری وپێشبڕکێدا ئازادبوونو مرۆڤ جارێکی دی بوویە قوربانی بێ بەرگری دەسەلاتی پچراو کەزانست و تەکنیكو ژیان هەمووی بەدەوری خولی شێت ئامێزی سوودە ماددی و بەرزەکانی خۆیدا دەسوڕاندنەوە.

ئارەزووی یەکسانی و رزگاری لەم قۆناغە سەرسام هێنەری داخوازی زیاتری کەسی کە تەکنۆلۆژیاش خێراییەکی ترسناکی پێ بەخشیبوو، بەرەو سەرپێچی، راپێچی کردو کاری ئەم سەر پێچیە بەرەو کۆمۆنیزم رۆیشت کە لە وشەیەکدا، هەمان دەسەلات و توانای دەمارگیرانەو خنکێنەری کڵێسای سەدەکانی ناوەراستە کە تیایدا،

تـەنها خـودا بـوونی نیـە، پایـەکان ئـەمجارە نـەك بەنوێنـەری وەهمـاوی خـودا، بـەڵکو بەنوێنـەری دانـراوی پرۆلیتـار فـەرمانڕەوایی بەسـەر مرۆڤـدا دەکـەن و لـە هەمانکاتـدا کـەخودی خۆیـان هـەم "فـەرمانڕەوای رەهـای"و "هـەم خـاوەنی سـنورداری" پلـەی مەعنەوی پێغەمبەرایەتی و ئیمامەتو رۆحانیەت و زانست و بیروباوەڕو ئەخلاق و هونەر و ئەدەبیش دیاری دەکەن.

ئێـستا جیهـانی بەسـتووی کۆمـۆنیزم لەنموونـەدا، هـەروەك بەندێکـە کـە بـۆ "هاوسەرگیری" وتویانە:—

(قەلایەکە هـەر کـەس لـەدەرەوەی دایـە، وەسوەسـەو دوودڵـی ئـەوەی هەیـە بـچێتە ناویەوە هەر کەسیش لەناویدایە، ئارەزووی ئەوەیە لەو قەلایە بچێتە دەرەوە.)!

بەڵام رۆح هەرگیز نامرێت و مەبەستیشم لـەرۆح هـەمان ئـەو رۆحەیـە کـە قورئـانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووە و ئەویش نەك گیان ودەروونی تاك، بەڵکو ئەو هێزە خوداییـە ژیانبەخشەو جووڵە دروستکەرەیە کە هـەروەك فـووی ئیـسرافیل لەجەسـتەی مـردووداو ئێـسکی سـەردەمێك بـەجۆرێکی سەرسـوڕهێنەر زینـدووی دەکاتـەوەو ئـەو گۆڕسـتانە مەرگبارو بێدەنگەی کەبۆ ناشتنی مرۆڤایەتی و مەرگی رۆحێك کـە بـەدوای سـەرکەوتندا دەگەڕێت پڕیـان کـردووە و پاشـان گـوڕوتینێکی نـوێو هەسـتانەوەیەکی نـوێ دەست پێدەکات و مرۆڤایەتی ژیانێکی دیکەو قۆناغێکی دیکە بەسەر دەبات.

ئێـستاش ئـەو رۆحـە لەجەسـتەی ئـەم سـەدەیەی کـە مرۆڤایـەتی"بـەبن بەسـتی بوونی" خۆی گەیشتووە، زیندوبوەتەوە مرۆڤایەتی کە بەدوای سەرکەوتندا دەگـەڕێت و رەنج دەکێشێت کە هەم لەئەزموونی سەرمایەداری رۆژئاوایی یاداوەری تاڵی هەیەو هـەم سەری داوە لەدیواری کوچەی بن بەستی کۆمۆنیزم و بەدوای رێگەی سێیەمی نێوان ئەو

"مەیخانە"و ئەم"پەرستگایە" دادەگەڕێت و ئەم ڕێگەی سێیەمەیش، پەیامێکە کە دونیای سێیەم بەدەستپێکردنی نێردراوە.

ئەوەی کەئاسۆی ئەم ئایندەیە روونتر ومـوژدە بەخشتری دەکات ئەوەیکە لەهەردوو دونیای سەرمایەداری و"مارکس"یزم، ئەو رۆحە بەهێزانەی کە بە "خود ئاگایی مرۆیی" گەیشتوون سەریان هەڵگرتووە لە نێوان هات و هاواری تەکنەلۆژیای سەرمایەداری، هاواری کارەساتی مرۆڤێکی سڕاوە دەکەن کە لە لیبرالیزمێکی بێ ئامانج و لەدوو توێی پەردەیەکی درۆزن و خەڵەتێنەری دیموکراسی، "تاك لایەن" دەبێت و"دەسڕێتەوە" "کەم" دەبێتەوە ولە"خۆی بێگانە" دەبێت و دواجار دەیەوێت "چیەتی مرۆیی" خۆی لەدەست بدات....

لەم جەمسەرەشدا لەگەڵ ئەوەی دەسەلات و توانای سامناکی کە هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگە لەخۆیدا دەگوشێت، ئەو رۆحە هاواری لێ بەرزبوەتەوە و دەنگو هاواری لەپشت حەسارێکی بەرزو پەردەیەك کە بەدەوریدا کێشراوە، دەگەێنێتە گوێی سەردەم و هەموو رۆژێك بەرزترو دامێنی فراوانتر دەبێت.

هێشتا زووە ئەو ئایندەیەی کە هەیەتی زەمینە ساز بێت هەر لەم ساتەوە "وێنای"بکرێت. بەلاَم دەتوانرێت پێشبینی رووگەی بکرێت.

لایەنی هاوبەشی هەموو ئەم "بانگەشەکەرە نوێیانە" باوەڕبوونە بەم واقیعیەتە کە هەردوو ڕێگە کە سەرمایەداری خۆرئاوایی و کۆمۆنیزم، مرۆڤی والێکردووە کە بەرەو "کارەساتی مرۆیی" بڕوات و لەبەرئەوە ڕێگەی"سەرکەوتنی مروڤ" گەڕانەوەیە لەم دوو ڕێگایە.

بەلام جگە لەم لایەنە هاوبەشە نەرێنیە (منفی)، لایەنێکی دیکەی هاوبەشی ئەرێنیش دەتوانرێ لە هەموو ئەم هاوارو پەیام وبانگەشەو هەوڵ و کۆششانە بدۆزرێنەوە و ئەویش "نیازو پێویستی گەڕانی ڕۆح"ە.

ڕەنگە زۆر گەشبینانە بێت ئەگەر ئەمە بە" ڕووکردنە مەزهەب" دەربڕێت، بەلام بەدڵنیاییەوە دەتوانرێ بوترێت بەجۆرێك "مەعنەویەتگەرایی بالآ"یە، چونکە لە ئاوازو تەنانەت ئەندێشەو بیروکەلامی زۆربەی ئەو ڕۆشنبیرانەی کەدژی کارەساتی مرۆیی لە هەردوو دونیای دژبەیەك (باشترە بڵێیت بەرووکەش دژبەیەك) هاواریان لێ بەرزبوەتەوە، نەفرەت لە"ماددیگەری فەلسەفی و ئەخلاقی مرۆڤی ئەمڕۆ، دڵەراوکێی سڕینەوەی جەوهەری ڕاستەقینەو بالآی مرۆیی، فڕێدانی هەموو بەها مەعنەوییەکانی مرۆڤ" دواجار مردنی ئەو "خۆری ئاهورایی کە لە قوڵایی فیترەتی مرۆیی دەدرەوشایەوە وبوونی ئەوی تواندۆتەوەو و ژیانی ڕووناكو هەموو جیهانی سروشت بەجەستەیەکی خاوەن ڕۆح دروست دەکردو عیشقو بەهای بەدی دەهێنا" بەڕوونی ئاشکرایە.

ئەمڕۆ ئیدی هایدگەری فەیلەسوف هەروەك "هیگڵ" یان "فیورباخ"ی سەدەی نۆزدەهەم قسە ناکات، لەزانستدا، "ماکس پلانك" _ڕوخساری دەرکەوتووی فیزیای نوێ_ بەپێچەوانەی "کلۆر برنار" قسە دەکات. یەکەمیان بەدوای سڕینەوە دادەگەڕێت لە مرۆڤدا ودووەمیان خودا لەجیهانی فیزیایدا.

ئەدەبیاتو هونەری نوێ، بەترس وحەسرەت لەپوچی مرۆڤ، سڕینەوەی مرۆڤ و تەنیایی و تاریکی مەرگبار کەناخ و دەروونی داگیرکردووە قسەدەکات.

ئۆلیت، ستریزنگ، گنون، نووسەری دکتۆر ژیواگو، تاین بی، ئەریك فرۆم، سنگور، اوزغان، عمرمولود هەموویان بەجۆرێك بەدوای نووردا دەگەڕێن.

ته‌نانه‌ت فیسیۆلۆژییه‌کی ناوداری هاوچه‌رخ _ئه‌لیکس کارل_ خه‌لاتی نۆبلی له‌باره‌ی ده‌ماره‌کان خوێن و پارێزگاری چنینی زیندوو له‌ده‌ره‌وه‌ی له‌شدا به‌ده‌ستیهێناوه، به‌ئاسانی قسه له"پاڕانه‌وه" ده‌کات به‌ناونیشانی هۆکاری به‌هێز له‌سه‌رسوڕهێنه‌ری‌و ته‌واوکاری ئه‌خلاقی و ده‌روونی و ته‌نانه‌ت دابینکردنی هه‌ماهه‌نگی گه‌شه‌ی بوونی مرۆڤ.

ئه‌مڕۆ ئیدی به‌پێچه‌وانه‌ی "مارکس" که نه‌مان‌و نه‌لابردنی خودا به‌مه‌رجی رزگاری مرۆڤی ده‌ژماردو به‌پێچه‌وانه‌ی "نیچه" که به‌لوتبه‌رزی"مه‌رگی خودای" ئه‌فسوسی زۆره وه باس له‌نه‌بوونی خودا ده‌کات و به‌هۆکاری پوچی مرۆڤ و پوچی وهیچی بوونی ده‌ژماردو نه‌فیکردنی به‌هاکانی باس ده‌کرد، "عه‌للامه ئیقبال" چه‌ندین ساڵ له‌مه‌وبه‌ر ڕاگه‌یاندکه: "مرۆڤی ئه‌مڕۆ یاد له‌هه‌ر شتێکی تر، نیازمه‌ندو پێویستی به‌ته‌فسیرێکی مه‌عنه‌وییه له‌جیهان"

له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا که له‌ووته‌که‌یدا ئه‌م مانایه‌ش هه‌یه به‌ڵام ده‌بێت ئه‌مه‌ی بۆ زیاتر بکرێت که"نیازمه‌ندی ته‌فسیرێکی مه‌عنه‌ویش بۆ مرۆڤ پێویسته."

به‌ڕوونی ئاشکرایه که له سنوری کۆتایی قۆناغێك وسه‌ره‌تای سه‌ده‌یه‌کی نوێداین. قۆناغێك که تیایدا شارستانیه‌تی رۆژئاوایی‌و ئایدۆلۆژیای کۆمۆنیست هه‌ردووکیان له‌رزگاری مرۆڤ بێتوانا ماونه‌ته‌وه وچاره‌نووسی مرۆڤیان به‌ره‌و کاره‌ساتێك بردووه وڕۆحی"ن ویێ" له‌هه‌ردوولاوه نه‌ماوه وسه‌ره‌تای سه‌رده‌مێك که‌ده‌ڕوات بۆ ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڕان به‌دوای سه‌رکه‌وتنی مرۆڤ رێگه‌یه‌کی دیکه ئه‌زموون بکه‌ن‌و رووگه‌یه‌کی دیکه بگرێته‌به‌ر، رووگه‌ولایه‌نێك که‌ئێستا رۆح ونووری خۆی له‌ده‌ستداوه، چرای پیرۆزی خۆرێك هه‌ڵبکات‌و که له دووتوییدا، مرۆڤ بێگایه له‌خۆی، چاو له‌فیتره‌تی خۆی بکات‌و خۆی جارێکی دی بدۆزێته‌وه‌و جارێکی دی رێگه‌ی سه‌رکه‌وتن بدۆزێته‌وه.

لەم ژیان و جووڵە نوێیەدا، ئیسلام پلەیەکی بەرزی هەیە، چونکە ئیسلام هەم لەگەڵ "یەکتایی دەگمەن و تاکی" خۆیدا، ئەو "تەفسیە مەعنەویە" لە جیهان دەخاتەروو کە بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کە ئیشراقیی و ئامانجدارە، لۆژیکی و عەقڵیشە و هەم لەگەڵ فەلسەفەی "دروستبوونی ئادەم" جەوهەری سەربەخۆو ئازادو باڵا لە مرۆڤگەرایی پیشاندەدات کە بەهەمان ئەندازە کەخودایی ونموونەییە، لەدەقی واقیعیەتی زەمینی ودیاری ئەم جیهانە بوونی هەیە.

بەتایبەت لەم رووەوە کەئیسلام، تەنها بەوەڵامدانەوەی پێویستیەکی فەلسەفی ورۆحیی و دەربڕینی قوتابخانەیەکی ئەخلاقی ناوەستێت، بەڵکو هەوڵدەدات تاکو کاردانەوەی جیهانبینی بەکتایی و رەسەنێتی مرۆیی خۆی لەدەقی ژیانی واقیعی بهێنێتەدی مرۆڤ هەروەك فەلسەفە هزریی و مەزهەبە عیرفانیەکان، لە نێوان ئایین ودونیا، بیروباوەڕو کرداروو "ئایدیاو واقیعیەت" بەش بەش نەکات و بەم مانایەیە کە بەدەستەواژەی جەنابی "لوی گاردە"، "ئیسلام هەم ئایین و هەم میللەتە".

ئایندەیەکی لەم جۆرە کە بە پشتگوێ خستنی سەرمایەداری و "مارکس"یزم دەستی پێکردووە نەدانراوە و نەپێشتر دروستکرد بێت، بەڵکو دەبێت دروست بکرێت وبێگومانیش کاتێك ئیسلام دەتوانێت لەپێکهاتەیدا رۆڵی و_لەئەنجامدا_ بەشی شایستە خۆی هەبێت کەخۆی لەچەندین سەدە چەق بەستوویی، خورافەو تێکەڵبوون رزگار بکات و بەشێوەی "کۆمەڵە فەرهەنگێکی کۆن" بەشێوەی "ئایدۆلۆژییەکی زیندوو"* بخرێتە روو و ئەمەش بەرپرسیاریەتیەکە کە لە ئەستۆی رۆشنبیرە راستەقینە ئیسلامیەکانەو تەنها لەم کاتەدایە کەئیسلام _پاش رێنسانسێکی بیروباوەڕی_ کە لە

* د. عەلی شەریعەتی ئیسلامی وەکو ئایدۆلۆژیا وەردەگرێت و دادەنێت بەڵام جیاواز لەئایدۆلۆژیاکانی دیکە کەلەلایەن مرۆڤەوە دادەنرێن و گەورەترین رەخنەش لە هزری شەریعەتی دەگیرێت لەم رووەوەیە. (و.کوردی)

گۆشەی کەنارخراوەیی گۆشەگیری و دواکەوتن دێتەدەرەوە، هەروەها دەتوانێت کە لەمەیدانی شەڕە بیروباوەڕییەکان و بەتایبەت لەم مەیدانەدا کەرۆحی نوێی مرۆڤی سەردەمی ئیمە لە گەڕان و دەستپێکردنی جیهانێکی دیکەو مرۆڤێکی دیکەیە، بێتە ناوەوەو دروستکەری نموونەو لە "ناوەراستی مەیدانی سەردەم ومەیدانی ئەندێشەی مرۆڤ" ئامادەیی هەبێت.

ئەمە بەرز فڕینێکی پێشنیاری نیە، بەڵکو بەرپرسیاریەتیەکەو خودی بانگەوازی ئیسلام، نەك تەنها پێویستی دەکات، بەڵکو دەقی روونی پەیامی قورئان پەیڕەوانی راستەقینەی خۆی بەوەبانگ دەکات:

"وَلِلَّهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ(١٤٢)وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا " (البقرە/ ١٤٢–١٤٣)

دەبینین بەهەمان ئەندازە کە"قوڵێیی وپانتایی" بانگەوازی ئیسلام و بەتایبەت باس وبۆچوونی ئیسلام لەبارەی مرۆڤەوە سەراپاگیرترو زیاتر دەبێت، دژیەکی و پێکدادانی لەگەڵ ئایدۆلۆژیەکان _بەتایبەت ئەو ئایدۆلۆژیانەی کە قسە لەبارەی مرۆڤەوە دەکەن جیدی ترو گرنگتر و فراوانتر دەبێت.

* * *

ئەو ئایدۆلۆژیانەی کە ئەمڕۆ _کۆن یان نوێ_ داوا لە مرۆڤ دەکەن بەروخۆیو خودی خۆی بڕوات، بەشێوەیەکی گشتی، بریتین لە: مەزهەبە عیرفانیەکانی (مەسیحیەتو ئایینە رۆژهەلاتی و بەتایبەت بودیزمو هیندوئیزم)، ماددیگەری (لە شێوەی جۆراوجۆر)، لیبرالیزمی رۆژئاوایی، پووچگەرایی، بوونگەراییو "مارکس"یزم.

جگە لە"مارکس"یزم، هەموو ئایدۆلۆژیە مەزهەبیو نا مەزهەبیەکانی دیکە، ئایدۆلۆژیای بەشی یان یەك لایەنن و لەبەرئەوەی سەرنج لەتەنها لایەنو بوارێکی مرۆڤ دەدەن، ئیسلامیش لەهەمان ئەو لایەن وبوارەوە لەگەڵیاندا روو بەروو دەبێتەوە.

لەگەڵ مەسیحیەت و ئایینە عیرفانیە رۆژهەلاتیەکان، ئیسلام رووبەڕووبوونەوەیەکی تەواوی ئایینی هەیە، لەگەڵ ماددیگەری دژیەکیەکی فەلسەفی، لەگەڵ بوونگەرایی جیاوازی مرۆیی و بەدوایشیدا ئەخلاقی، لەگەڵ لیبرالیزم پێکدادانێکی ئابووری کۆمەلایەتی، لەگەڵ پووچگەراییدا کە لە بنەرەتدا بەراوردێکی بێ مانایە، چونکە پووچگەرایی رەهاکردنی هەموو شتێکە. تەنها بەبەڵگەی ئەوەی "مارکس"یزم لەم نێوەندەدا ئایدۆلۆژییەکی چەند لایەن و تەواوی دروستکردووە، ئیسلام _بەناونیشانی ئایینو میللەت_ لە هەموو ئەم لایەنانەدا، لەگەڵیدا لەبەرکەوتندایە.

چونکە "مارکس"یزم لە نێوان هەموو ئایدۆلۆژیا نوێیەکاندا، ئەم تایبەتمەندیەی هەیەکە هەوڵدەدات تاکو هەموو رووبەکی ماددی و مەعنەوی، فەلسەفیو زانستی، تاكو کۆمەڵگە، ئابووریو ئەخلاقی مرۆڤ لەسەر بنەمای جیهانبینی دیاریکراوی ماددی خۆی بگرێتەخۆو لەبەر ئەمەشە کەکارەساتی ماددیگەریی لەم سیستەمەدا لە هەموو لایەنەکانەوە باس لە مرۆڤ دەکاتو بەسەر مرۆڤدا دادەبارێت.

ئیسلامیش لەنێو هەموو مەزهەبەکانی مێژوودا، ئەم تایبەتمەندیەی هەیە کەتەنها بەرێکخستنی پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خوادا بەپاککردنەوەی دەروون (وەکو مەسیحیەت و بودیزم) کورت ناکاتەوە و لەجیهانبینی فەلسەفیەوە بیگرە تاکو شێوەی ژیانی تاك، خۆی بەشێوەی قوتابخانەیەکی گشتگیرو خاوەن لایەنی جۆراو جۆری مرۆیی رادەگەیێنێت. ئەمەیە کە لە دووپێگەی هزریو فیکری دژبەیەك و بەدوو جیهانبینی دژیەك لە بەرامبەر مرۆڤدا وەستاون و بانگهێشتی دەکەن.

هیچ یەك لەم دووانە جیاناکرێتەوە، چونکە یەکەم هەریەکێکیان، هەموو بوارو توخمەکانی خۆی لەسەر بنەمای جیهانبینی تایبەتی خۆی کە لەگەڵ یەکدا بەتەواوی دژیەکن، بیناکردووەو وەرگرتن و زیادکردنی هەر لایەن و بوارێك یان هەر توخمێك لەسەر هەریەکێکیان، تەنها ئەنجامی رژاندنی هەموو پێکهاتەکەیە.

پاشان ئایدۆلۆیایەك، کۆمەڵێکی پێکەوە بەستراوە لەگەڵ تەنها رۆحێك کە جەوهەری تاك ولایەنی تایبەتی خۆی، بەش بەشکردنی ئایدۆلۆژیایەك مەرگیەتی و شیتەڵکردنی بەشێوەی"جەستەیەکی بێ رۆح"! ئەمەیە کە تایبەتمەندی ئەم دووانە، هەردووکیان سیستەمێکی تەواوکار و تەواوییان دروستکردووە، لە هەمووڵایەنەکانەوە لە بەرامبەر یەکتردا دەوەستن و ئەمەیە کە لەسەر بینای لێکۆڵینەوەی"هانری مارتین"ە، "مارکس"یزم لەگەڵ بوونی سەدساڵەدا دەستی کەوتبوو، نەیتوانیوە لە هیچکام بەکۆمەڵگە ئیسلامیەکاندا _بەپێچەوانەی رۆژهەلاتی دوورو ئەمریکایی لاتین_ سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، دەبێت هۆکارەکەی تەنها لە ئیسلامدا بۆی بگەرێین) بۆچی؟ چونکە ئیسلام بەپێچەوانەی بودیزم ومەسیحیەت، نەك تەنها لەبواری فەلسەفی، بەڵکو لە هەموو بوارولایەنو رووەکانەوە، لە بەرامبەریدا بەرگری دەکاتو چونکە خودی خۆی بانگەوازێکی سەربەخۆی هەیە.

مرۆڤگەرایی "مارکس" لەورووەوە کە لەسەر بنەمای ماددیگەری وەستاوە، هەرچەندە لەقۆناغی "شیکاری کرداری"دا لەورووەوە کەشوێن وسەرهەڵدانی خودی مرۆڤ لەخاکەوە دەزانێت و دەژمێرێت، دواجار و لە کۆتاییدا بەرەو ژێرو، بەرەو خوارەوەی دەهێنێت و نزمی دەکاتەوە.

ئیسلامیش لەورووەوە کە مرۆڤگەرایی خودایی خۆی لەسەر پایەی یەکتایی بوونیادناوە، مرۆڤ لەقۆناغی"شیکاری زانستی" لەخاك پێناسەی دەکات و لەقۆناغی ستایشی بووندا، لەخاکەوە بەرەولای خودا رەهای بەهاکان و بەهارەها ئەودیو سروشتیەکان رو بەرەو سەرەوە دەبات.

"مارکس"یزم لەورووەوە کە بەهاکان بەدیاردەی رێژەیی ودەرەکی دەژمێرێت کە لەسەر بنەمای شێوەی بەرهەمهێنانی ئابووری شایەنی سەرنجدانن هەموو بەها مرۆییەکان لە ئاستی سوودی ماددیدا نزم دەکاتەوە ودادەنێت.

ئیسلام لەورووەوە کە بەهاکان بەدەرکەوتەی سیفاتەکانی خودا لە مرۆڤدا دەژمێرێت بەوەی کەبۆ ئابووری ڕەسەنێتی رازییەن دەتوانێت لەپشت ئەو "سیستەمی بەهایانەدا" دەرببڕێت و "بنەما و بنەڕەت" لە "ئامانج" جیابکاتەوە و لەبەرئەوەی دووانەیی بوونی"سوودو بەها"یان "ئابووری و ئەخلاق" ئاراستە بکات و هەروەك مەزهەبی سۆفیانەو "مارکس"یزم، هیچکامیان لە بەرامبەر ئەویتریان نەفی نەکات.

"مارکس"یزم، بەپەیوەندی و پەیوەستی دیالیکتیکی دژە هیگڵی بەماددیگەری و لە هەمانکاتدا پێکەوە بەستنی ئامێری ماددی بەدیالیکتیکەوە، بە"جەبرێکی ماددی پەیوەست بەئامێر"ەوە دەکات کە مرۆڤ بەناونیشانی"ئیرادە"یەك بەتەواوی خراپ دەکات و لە ئەنجامدا بنەڕەتی بەرپرسیاریەتی مرۆڤ بەبێ ئاراستە و رێنمونی دەهێڵێتەوە.

ئیسلام لەگەڵ ئەوەی کەدان بەیاسای کۆمەڵگەو جووڵەی تەواوکاری و بەردەوامی مێژووی مرۆڤ لەسەر بنەمای یاساو ڕێسای زانستیدا دەبێت، لەبەرئەوەی ئیرادەی مرۆڤ بەجیلوەی ئیرادەی هەموو جیهانی بوون دەژمێرێتو کە لە جەوهەری بوونی خۆیەوە سەری دەرهێناوە، نەك دروستکراوی بێ ئیرادەی داخوازی بەرهەمهێنان یان کۆمەڵایەتی و هەرگیز بەتەکانی ترسناکی "جەبری ماددی" ناشکێت، بەوجۆرەی کە بەراگەیاندنی بنەماو بنەڕەتی "تفویض" و نیشتنەوە، مرۆڤ لە کۆتو بەندی "جەبری ئاسیار" کە مەزهەبەکانی ڕۆژهەڵات پێوەی گرفتارن، ڕزگاری کردووە.

"مارکس"یزم کاتێك دەیەوێت مەزهەب نەفی بکات، خودابە دەرکەوتەی دەرەکی "حەقیقەتی بوونی مرۆڤ (Essence humaine)" ناودەبات و مرۆڤ لە جیاتی خودا لەجیهاندا دادەنێت، بەڵام کاتێك دەیەوێت ماددیگەری مێژوویی خۆی بیسەلمێنێت، هەر ئەم مرۆڤە کە "خودا دروست دەکات، دەبێتە دروستکراوی ئامێرو هۆکاری ئابووری"!

ئیسلام، مرۆڤ لە "جیهانێکی یەکتایدا" دادەنێت کە تیایدا، خودا، مرۆڤ، سروشت لە هاوئاهەنگیەکی ماناداری و ئاراستەو خاوەن ڕووگە جیلوە دەکەن.

ئادەم بەناونیشانی ئەو "جەوهەرە بنەڕەتیە بوونی جۆری مرۆڤ" خاکی دەناسێنێت کەرۆحی خودای بەبەرداکراوە (بوونەوەرێك لەماوەی نێوان ماددیەت و پیرۆز) و پاشان ئەمانەتی خودایە تەنها لەژێر دەستی ئەودایەو بەم جۆرە بۆ بنەڕەتی "بەرپرسیاریەتی مرۆیی" پێوەری ئەودیو سروشتو وناماددی دەخاتەروو، هەروەها بەداستانی شەیتان وحەواو بابەتی گەو هەری بوونی پڕ لەسەر کەشی وعەقڵو عیشق دەکات وسەربەخۆیی ئیرادەی مرۆڤ لەجەبری ئیلاهی بەرەسمی دەناسێنێتو بنەمای "نیشتنەوە" (لەبەهەشتەوە بۆزەوی). و بۆ ژیانی ئەم جیهانە ئامادەی دەکات

تاکو هێنانەدی بەهەشت بە "ڕەنج و دژیەکی" بەدەستی ئیرادە، عیشق و ئاگایی و بەرپرسیاریەتی خۆی بەدەستی بهێنێت و "چارەنووسی کۆتایی خۆی بەدوو دەستی خۆی دیاری بکات" (قیامتت یوم ینظر المرء ماقدمت یداە).

وەبە "پەرستش" _واتە پەرستنی ئاگایانەو عاشقیانەی خوداکە وێنەی هەموو "بەها باڵا ڕەها"کانە، ئەم بەهایانە بەجۆرێکی ڕێژەیی لە خۆیدا پەروەردە بکات و بەم جۆرە، بەجەوهەری بوونی خۆی لەسروشت تەواو بکات و بەرزی وباڵایی بەردەوامی پێ ببەخشێت و "نەرمکردنەوەی سۆزداری" بەرەورووی "گەڕانە بەدوای تەواوی ڕەها"ی خودی و جۆری خۆی بڕوات ولەخاك (شتێکی سروشتی) دووربکەوێتەوەو بەپشت بەستنی بوونی خۆی لەسەر "یەکتایی" بەناونیشانی جیهانبینیەك و فەلسەفەیەکی ئەخلاق و جۆرێك وشێوەیەك و هەروەها چەمکۆ ئامانج ومەبەستی ژیان_ بە "سەرکەوتن و سەربەرزی" بکات.([1])

[1] لەم ڕووەوە کەپێغەمبەری ئیسلام (د.خ) بانگەوازی *بەتەنها "دروشمی یەکتایی"* دەست پێدەکات و تاکو سێ ساڵ جگە لەدوو بارەکردنەوەی ئەم دروشمە شتێکی دی ئەنجام نادات و لەم دروشمەدا ئامانجی یەکتا پەرستی کە *"سەرکەوتنی مرۆڤ"* دەخاتەڕوو *"قولوا: لا الە الا اللە، تفلحوا"*.

له کۆتاییدا ئەگەر بمانەوێت لەئەنجامگیریەکی گوشراو پێرستێکدا مرۆڤ لەدژیەکی نێوان "مارکس"یزم و ئیسلام وێنا بکەین، لێرەدا ئەم دوو "وێنە"یە لەم دوو روانگە دژیەکەوە کورت دەکەینەوە:

١– "مارکس"یزم لەو رووەوە کە لەسەر جیهانبینیەکی رەهای ماددیگەری بوونیاد نراوە، ناتوانێت مرۆڤ لە رووی"کەسێتی" و هەم لەرووی"سیفات"و هەم لەرووی"سنوری تەواوکاری" لەسنورو چوارچێوەی تەسکی مادده زیاتر بڕوات‌و ناچار مرۆڤ لەریزێکی دیکەی بوونەوەراندا ریزبەندی دەکات و لەدوو توێی سروشتی بێ هەست‌و نەست وبێ ئامانجدا زیندانی دەکات.

ئیسلام لەورووەوەی کەخاوەنی جیهانبینیەکی یەکتاییە، دەتوانێت مرۆڤ بەناونیشانی"کەسێتیەکی خودایی" ئاراستە بکات و بە"سیفاتی ئەودیو سروشت"و بالای پێ ببەخشێت‌و سنوری تەواوکاری بەرەو ناکۆتا بەرێت و مرۆڤێکی لەم جۆرە لەجیهانێکی زیندوو و مانادارو بێسنوردا دادەنێت کەسنورەکانی تەنانەت ئەوەی کە زانستەکان دەتوانن وێنای بکەن زۆر زیاتر دەڕوات.

٢– "مارکس"یزم لەبەرئەوەی باوەڕی تەنها بەو ماددەیە هەیە کەفیزیای کلاسیك قسەی لە بارەوە دەکات، ناچار هەموو ئەو ستایشانەی کە باس وقسە بەرزو شکۆداری جەوهەری و رەسەنێتی بالای مرۆڤ دەکەن، دەیخاتە "شیکردنەوەی ماددی"و راڤەی ماددیگەریان بۆدەکات و ئەمەیە کە مرۆڤ لە بۆچوونی""مارکس" فەیلەسوف ومرۆڤگەرا" گەورەییەکی وای هەبوو کەخودا تەجەلیاتی دەرەکی فیترەتی ئەو بوو، بەدەستەواژەی ئەو مرۆڤ دروستکەری خودابوو، لە ئایدۆلۆژیای "مارکس"ی"ماددیگەراو کۆمەڵناس" لە ناکاو بەشێوەی کالایەك بەرهەم دێت کە بەرهەمی ئامێری کاری دەستی، کاری کشتوکاڵی یان کاری پیشەسازییە.

ئیسلام لەورووەوە کە سروشتی مادی وفیترەتی مرۆیی بەدوو "نیشانە" لەبوونێکی باڵاو هەستێکی رەها راڤە دەکات، دەتونێت بە کاریگەری و کاریگەربوونی دوولایەنەی نێوان مرۆڤ و ژینگە قایل بێت و لە هەمانکاتدا بەهەمان ئەندازە کە مرۆڤ خۆی بەشێوەی هۆکارێك لەزنجیرەی هۆکارەکان کاردەکات، پلەی مرۆڤبوونی خۆی لە سروشتو لە کۆمەڵگە سەربەخۆ لەهەر دووجەبری بپارێزێتو لەشیکردنەوەی کۆتاییدا لەکەوتن لە چاڵی خەیاڵی مادی یان مێژوویی یان کۆمەلایەتی پارێزراو بوو و"رەسەنێتی مرۆڤبوونی" لە"رەسەنێتی ماددە" یان "رەسەنێتی ئامێردا" نەتوێتەوە.

٣- "مارکس"یزم لەورووەوە کە بەتوندی سەبارەت بە"واقیعیەتگەرای ماددی" وەفادار دەمێنێتەوە، شایستەیشی لە"بەهاکان"ەوە بلێت و لەسەر ئەم بنەمایە بڕیاربدات، تەواو واقیعیەت لەدەستدەدات.

ئیسلام لەودیو واقیعیەتگەرایی، باوەڕی بەسەرچاوەی بەهاکان هەیە، و لەبەرئەوەیە دەتوانێت رووگەو رێنمونی لۆژیکی هەبێت.

٤- "مارکس"یزم لەورووەوە کە مرۆڤ بەدروستکراوی ژینگەی کۆمەلایەتی دەژمێرێت و ژینگەی کۆمەلایەتی کۆمەڵێك مەرج وپایەو بنەمای گۆڕاو ناجێگیرن، بۆیە ناتوانێت پشت بەبنەمایەکی جێگیر بەناوی کرۆکو جەوهەرو حەقیقەتی مرۆڤ ببەستێت و لە ئەنجامدا، لەبەرئەوەی ئینکاری بوونی خوداشی کردووە و هەم "فیترەتی مرۆیی" کە پێگەی بنەڕەتی بەها مرۆییەکان کەدروستکەری"ئەخلاق"ە لەدەستی داوەو ناچار بەدەستەواژەی لینین لەتێروانینی ئەودا قسەکردن لەهەربنەماو پایەیەکی ئەخلاقی درۆیە.

ئیسلام هەر بەوجۆرە کە بۆ سروشت، بنەمای جێگیرو نەگۆڕ قایلە کە زانست لەسەر بوونیاد نراوە، ئەوا بۆ "فیترەت"یش بەبنەما و پایە گەلێك قایلە کە ئەخلاقیان لەسەر

وه‌ستاوه‌وله‌ تێڕوانینی ئه‌ودا به‌ها مرۆییه‌كان هه‌مان ئه‌ندازه‌ ره‌سه‌نێتی وجێگیریان هه‌یه‌ كه‌ یاسا سروشتیه‌كان هه‌یانه‌، هه‌ربه‌م روانگه‌یه‌شه‌وه‌ كه‌ دروست به‌پێچه‌وانه‌ی "ماركس"یزم هه‌وڵده‌دات تاكو ئه‌م به‌هایانه‌ له‌پله‌و ڕیزی داب‌و نه‌ریت وبۆنه‌و ئادابه‌ كۆمه‌لایه‌تیه‌كان بژمێرێت وله‌قوڵیٚ ماددیگه‌ری ئابووری و كۆمه‌لایه‌تیدا نوقمیان بكات، ئیسلام هه‌موو هه‌وڵێكی له‌سه‌ر ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئه‌م به‌هایانه‌ له‌م دۆخ‌و داخوازیه‌ گۆڕاو و جه‌برییانه‌ی ژیانی ماددی رزگاربكات و له‌سه‌ر بنه‌مای فیتره‌تی مرۆیی ئاراسته‌ و رێنمونی بكات‌و ئه‌م به‌هایانه‌ش كه‌ به‌هایی له‌سه‌ر ویژدانی جۆری مرۆڤدا ده‌دره‌وشێته‌وه‌، بژمێرێت.

٥- "ماركس"یزم، به‌په‌یوه‌ندی دیالیكتیك به‌ماددیگه‌رییه‌وه‌ كه‌ جووڵه‌ی سروشت، مێژوو و كۆمه‌ڵگه‌، كه‌ له‌سه‌ر ئه‌و بنه‌مایه‌ ئاراسته‌ ده‌بێت، به‌"جه‌برێكی ماددی" گه‌یشتووه‌ كه‌ تیایدا، مرۆڤ ره‌سه‌نێتی خۆی له‌ ده‌ستده‌دات وخودی خۆی ده‌بێته‌ یاری ده‌ستی ئه‌م دژیه‌كیه‌ كوێره‌ی مادده‌ و له‌ئه‌نجامدا هه‌رچی ئه‌وه‌ی كه‌ به‌ناوی"مرۆڤگه‌راییه‌وه‌" بانگه‌شه‌ی بۆكردووه‌، لێره‌دا ئینكاری ده‌كات و مرۆڤ به‌یه‌كجاری هه‌م "ئازادی"و هه‌م "به‌رپرسیاریه‌تی" نامێنێت.

ئیسلام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌م دژیه‌كیه‌ی له‌پێكهاته‌ی دووانه‌یی مرۆڤدا راگه‌یاندووه‌، نه‌ك ته‌نها "ئازادی" (هه‌ڵبژاردن) و له‌ ئه‌نجامدا "به‌رپرسیاریه‌تی" ئه‌وی فه‌رامۆش نه‌كردووه‌، به‌ڵكو كتومت ئه‌م دووانه‌ له‌ده‌قی ئه‌م دژیه‌كیه‌دا دێنه‌ده‌ره‌وه‌، چونكه‌ له‌ پێناسه‌ی ئیسلامی مرۆڤ، مرۆڤ بوونێكی دژیه‌كه‌ له‌دوو پێكهاته‌ی قوڕ (حماء مسنون) و رۆحی خودا و ئیراده‌یه‌ك كه‌ ده‌توانێت هه‌ركام له‌م دووانه‌ له‌ به‌رامبه‌ر ئه‌ویتریان "هه‌ڵبژێرێت" و"به‌رپرسیاریه‌تی مرۆیی" لێی ده‌خوازێت كه‌نیوه‌ی خاكی خۆی له‌خزمه‌ت گه‌شه‌ی نیوه‌ی خوداییه‌كه‌یدا بێت و به‌م جۆره‌ به‌"ته‌واوكاری بوونی" و

به "دڵسۆزی رۆحی" و لەم روانگەیەوە، دووانەیی بوونی بەیەکتایی بگۆڕێت و "ئاکارو سیفەتی خودایی هەڵبگرێت."

٦- "مارکس"، دیالیکتیکی هیگڵ وەرگرتووە تاکو لە ئایدیالیزمەوە بەرەو مادیگەری بهێنێت، بەڵام دیالیکتیکی "هیراکلیت"ی وێران کردووە، چونکە "هیراکلیت" لەهەمانکاتدا کە هەموو شتێك لەبازنەی جووڵەو گۆڕاندا دەبینێت باوەڕی بەدوو بنەمای جێگیرە لەتەنیشت ئەم گۆڕانەدا، "یەکێکیان ئاگرە و ئەویتریان لوگوس" و ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کە لە بنەڕەتدا تێڕوانینی راستو دروست و تەواوی دیالیکتیکی _دروست بەپێچەوانەی ئەوەی کە "مارکس"یەکان لەدونیادا ناوبانگیان پێبەخشیون_ لەسەرەتادا تێڕوانینی عیرفانی بووە، بەوجۆرەی کە لە رۆژئاوادا لە "هیراکلیت"، (لەیۆنانی کۆن) تاکو "هیگڵ" (سەدەی نۆزدەهەم) و لە رۆژهەڵاتدا، لە هەموو جیهانبینی مەزهەبی ئایینە گەورەکان (زەردەشت، لائوتزو، مانی، هیندوئیزم، بودیزم، مەزهەبە ئیبراهیمیەکانی: یەهود، مەسیحیەتو ئیسلام) بنەمای "دژیەکی و گۆڕان" (دروستبوونو خراپبوون) پیچوەری راڤەی جیهان و ژیان بووە و تیۆریای "هیراکلیت" کە تیایدا "ئاگر" هێمای پیرۆزی ونەمرییە و "لوگوس" هێمای رێکخستنو ئاهەنگی جێگیر لەدەقی ئەم جیهانەدا سەراپا گۆڕان، جیهانبینیەکی بەتەواوی عیرفانی پیشاندەدات و "مارکس"یزمیش بەنەفیکردنی ئەم دوو بنەڕەتە جێگیرە لەدیالێکتیك، هەم رووگەو لایەنی جێگیرو هەم رێکخستنی نەمری لەجیهان و لە مرۆڤدا نەفی کردووەو ئەمەیە کە مرۆڤگەرایی ئەو نەك بەشێوەی "رووداوێك"، بەڵکو بەشێوەی کۆمەڵێك لە "شەپۆلەکان" دەخرێتەروو کە تیایدا هیچ جۆرە پشت و پەنایەك بوونی نیە.

٧- "مارکس"یزم، بەگوتەی Ed.Berth کە "مارکس"یەکی ناسراوی هاوچەرخی ئەنگلس و لینینە "فەلسەفەی بەرهەمهێنەرانە"ە.

ئیسلام بەدەستەواژەی قورئان "فەلسەفەی ڕێنمونی"یە.

٨- "مارکس"یزم باوەڕی وایە کە مرۆڤ "خودای بەدیهێناوە" و پاشان کە بەم جۆرە مرۆڤی بەو هێندەیە بەرزکردۆتەوە، لەوێ هیچ تەخت و کورسیەک نادۆزرێتەوە تاکو مرۆڤی لەسەر دابنیشێنێت و ناچار بەهۆی دیالێکتیکی وەرگێڕاو و ناتەواوی خۆی خێراو ڕاستەوخۆ بەرەو خوارەو وزەوی دەهێنێتەوەو دەیداتە دەستی بەرهەمهێنان و شێوەی بەرهەمهێنانی و مەحکومی جەبری مێژوویشی دەکات.

ئیسلام، لەکەناری ماددەدا بەبوونێکی دیکەی دەزانێت و دەژمێرێت و لەبەرئەوەی باوەڕی وایە کە خودا "مرۆڤی بەدیهێناوە." بەسەربەخۆی و لەجەبری سروشتی ماددی دەزانێت و پاشان بە"سەرکەشی" لەسروشتی بەهەشتیدابە "ئیرادەیەک کەسەربەخۆیە لەئیرادەی خۆی دروستی کردووە" دەیناسێنێت و بەم جۆرە لە کۆتی جەبری ئیلاهیش ئازاری دەکات ولەم ڕێگەیەوە بەتەرحکردنی مرۆڤ بەناونیشانی بوونێکی خاوەن ئیرادە و ئاگایی کەهەم لە کۆت و بەندی "ئاسمان" ڕزگاری بووەو هەم لە کۆت و بەندی "زەوی" بە"مرۆڤگەراییەکی" ڕاستەقینە دەکات و پاشان "ئەمانەتی تایبەتی خۆی کەتەنها مرۆڤ وەریگرت و هەموو جیهان وەریان نەگرت" _دەیداتە دەست مرۆڤ و هەموو فریشتەکانی_ کە هێمای هەموو هێزەکانی جیهانن_ لەبەردەمیدا کڕنوش دەبەن و لە کۆتایدا بەجێنشینی خۆی لەسروشتدا پێدەبەخشێت و ڕێگەی ئەم جیهانەی دروست دەکات تاکو وەکو سەرداری سروشت، جیهان بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و چارەنووسی

خۆی لەگەڵ رەنجو ئازارو دژیەکی و ئاگایی خۆی دروست بکات و لەم رێگەیەوە "خود ئاگایانە" بەرەولای خودا بگەڕێتەوە !

دەبینین کەفەلسەفەیەکی لەم جۆرە لە مرۆڤگەرایی‌و ناساندنی لەم جۆرەی مرۆڤ تاکو چ شوێنێك لەگەڵ "فەلسەفەی بەرهەمهێنەران" نێوانی هەیە !

لێرەدا کۆتا قسە عەللامە ئیقباڵ _ئیسلام ناسی گەورەی هاوچەرخ وتویەتی:

"ئیسلام و کۆمۆنیزم، هەردووکیان قسە لەبارەی مرۆڤەوە دەکەن‌و خەریکی بانگهێشتکردنی مرۆڤن، بەڵام کۆمۆنیزم هەوڵیداوە تاکو مرۆڤ لەخوداوە بەرەو خاك بهێنێت و بەپێچەوانەوە ئیسلام هەوڵدەدات تاکو لە خاکەوە بەرەولای خودای بەرزیبکاتەوە و بیبات.

ئەمەیە کە بەروونی دەتوانرێت ئەوە ببینرێت کەئیسلام و"مارکس"یزم لەسەر رووی جادەی "مارکس"یزم، دروست بەپێچەوانەی رووگەو ئاراستەی یەکتر لەجووڵەدان و لە ئەنجامدا تەنها بەنەفیکردنی یەکێکیان، دەتوانرێت ئەوی دیکەیان بسەلمێنرێت.

لە کۆتاییدا ئەم گوتەیەی ئاندرە پیتر _"مارکس"یزمناسی هاوچەرخ_ بەتایبەت لەدیدی ئەوکەسانەی کەئیسلام بەناونیشانی تەنها رێگەی سەرکەوتنی مرۆڤ لە نێوان "کارەساتە نوێیەکاندا" هەڵیان بژاردووە، شایەنی قوڵبیوونەوە وتێرامانی زیاترە کە لەوێنای گشتی "مارکس"یزمدا دەڵێت:

"لەراستیدا قوتابخانەی "مارکس" ناتوانێت دابەش بوون قبوڵ بکات، چونکە خۆی وەکو دیدگایەکی گشت لە مرۆڤ و جیهان دەردەبڕێت و "الف و با"ی بەم جۆرەیە.

لەبەرئەوە ئەم قوتابخانەیە، بەوردی جێگەی ئەو ئایینانە دەگرێتەوە کە بەتوندی خەباتیان لەگەڵدا دەکات.

ئەم وێناو تێڕوانینەو ئەم ئەنجامگیرییە بەدروستی لەبارەی ئیسلامەوە، لە بەرامبەر هەموو ئایدۆلۆژیاکانی تر کەقسە لەسەر مرۆڤ و جیهان دەکەن دەبێت دووبارە بکرێتەوە.

# مرۆڤی ئازاد _ ئازادی مرۆڤ

## مرۆڤـ!

ئەم تەنها منداڵەی سروشت کە دەتوانێت جیهانی سروشت بناسێت وخۆی وەك *"بوونەوەرێکی نەناسراو"* ماوەتەوە!

ئەم تەنها بوونەوەری کەتینووی بێ قەرار و پەرستشکەری عاشیقی عەدالەت کە سروشتی کوێری ماددیش لەسەر دادپەروەری دەوەستێنێت و خودای رەهای بالاش بەدادپەروەرێکی پابەند دەژمێرێتو لە درێژایی مێژوو سەرگوزەشتەیەکی ستەملێکراوی هەیەو خودی دروستکەری ستەمگەلێکە کەدڵرەقیە سەختەکانی سروشت وەکو بومەلەرزە و لافاو تۆفان و تاعون و پروشکی و ئاگراوی لەچاو ئەوانەدا هیچە.

کاروانی مێژوو لەسەر زەمینە سەرەتاییەکان و قۆناغەکانی دڕندەیی و ژیانی کۆڵەواری نێو ئەشکەوتو راوو سەردەمی بەردین هەرچی زیاتر دووردەکەوێتەوەو بەئاسۆی روونتری پیشەسازی و دەسەلآت و ئەزموون و زانست و کۆبوونەوەو رێساو یاساو تایبەتمەندی و پەروەردەو فێرکردن و سیستەمو حکومەت و کۆمەڵگە ومیللەتو لەوشەیەکدا بەشارستانیەت دەگات، لە کۆتو بەندی سروشت زیاتر رزگاری دەبێت، کە فەرمانڕەوایی بەسەر بوونیدا دەکرد و فەرمانڕەواییەکی داگیرکارانە و پڕ لە ستەمو ئەشکەنجە وکارەساتو کوشتنی زۆر و لەشکری بالاو نەخۆشیەکان و بومەلەرزەو تۆفان و هەورە بروسکە وزیندانەکانی تاریکی وکارەساتەکانی برسیەتی و نەبوونی ولافاو ئاگرو هەڵمەتەکانی شێرو پڵنگ و گورگو مارو بەرازو... ئارامتر دەبوونەوەو دەسەلآتی

زۆریان لەچنگی ئیرادەو ئاگایی و پیشەسازی وهێزی کاری گشت و ژیانی کۆمەلایەتی ئارامتر دەبوونەوەو لە ناخ و دەروونی سنورە گەورە و زەبەلاح بەرزی شارستانیەت لە ستەمە رەنگاو رەنگەکانی سروشت دەهاتەدەرەوە، بەلام بەوجۆرەیەکە دەلێی چارەنووسی مندالانی ئادەم کە هەر لەسەرەتاوە خودای گەورە بە"ظلوم و جهول"ی ناوی برد لەگەل ستەمدا تێکەلە، چونکە لەدەروونی ئەم سنورانەی خودی خۆی، ستەمگەلێکی رەنگاورەنگ و زۆرتری بۆخۆی دروستکرد و پاش نیشتنەوەو دابەزینی لەبەهەشتەوە لەسەررووی زەویدا جەهەننەمێکی دروستکرد کە تیایدا بەسزای بەسوێ (عذاب الیم) گرفتارەو و بە چالی وەیل و ئاگری توێنەرەوەو گەرمو ئەشکەنجەی نامیهرەبان و خۆراکی پیس و خوێنین و دۆزەخی لە*"سعیر"* و*"زقوم"* هەموو کارگوزاران و کارمەندانی ئیبلیس...![1]

چەندین شیلاق کەنەك تەنها بەسەر جەستەدا، بەلکو بەسەر گیانیشدا دەبارێن، چەندین داغ و سوتاوی بەسەر شان و پشت بەلکو بەسەر دل و مێشکیشدا دێن، چەندین خواردن وخواردنەوە کەئیدی نەك بەدەم بەلکو بەرۆحیش دەدەن و بەقولایی ویژدان و فیترەتی شاراوەی مرۆڤیشدا دەرژێن، چەندین ستەم کە بەرهەمی درەوشاوەترین بلیمەتیەکانە و چەندین کارەسات کەکاری پێشکەوتووترین زانستەکانە و چەندین بەلا و ئەزموونەکان و داهێنانەکان و ئامادەگیەکان و فەرهەنگەکان و هونەرەکان و خەزێنەی مەعنەویەتی مرۆیی لەدروستبوونیان بەکارهاتوون، چەندین نەخۆشی وەکو شێرپەنجە ئازاری نیە و چەندین بەدبەختی کە لە سیل و تاعوون، خراپتر و مەرگ هێنەرترن و لەگەل ئەمەشدا زانست و بیروهۆشی زۆرێك دەبێت کە بیاندۆزێتەوە وکەشفیان بکات،

---

[1] لەم نوسینەدا و چەند شوێنکی دیکە بۆشایی و خال دانراوە. ئەم بۆشاییانە دەبوو لەلایەن (د. شەریعەتی) یەوە پرکرابایەوە، بەلام ئەوە نەکراوە بۆ پاراستنی ئەمانەت وەك خۆی بۆشایی بەجێ هێلدراوە.

تێبگات و نەك وەكو دادوهاوارێك بەهۆی ئازارەوە كە هەروەك "تیئۆر" ێكی فەلسەفی یان زانستی رابگەیێنێت و زۆری بێشوماری بە(بەختێك كە لە ئاگردا وون بوون یاخود لەچاڵی قوڕ و گڵدا تاكو قورگیان بەرۆداچوون، بەشێوەی "ووتار"ی بێ تام یان "ووتار"ێكی بێ شەوق _كەبێگومان لە ئاگاییەكی بازرگانانە یان فلیمێكی خراپ كەمتر جێگای سەرنجە_ بخوێننەوە.

كارەسات و ستەمەكانی ئەمڕۆ ئیدی نەك سروشتی، بەڵكو مرۆیین ونەك كاری هێزی ماددی وكوێرو رووداوی سادە و ناسراوی جیهانی توخمەكان، بەڵكو كاری توانا فیكری و بیناكردن و شتانی ئاڵۆزو نەزانراوی كۆمەڵگەی مرۆییە و بەتەواوی مرۆڤ بەرەو تەواوكارییە و هەر رۆژێك هێمادارترو قووڵتر و مەرگبارترن. ئیدی نەك مەرگی جەستەكان، بەڵكو مەرگی رۆحەكانە، مرۆڤ هەروەك كرمی ئاوریشم، هەرچەندە لەكاری پێشكەوتنی زیرەكی و بەتواناییو داهێنانی خۆی زیاتردەڕوات و زیاتر دەچنێت، لەقۆزاخەی تاڵە نرمو جوانە ئاوریشمینەكانی خۆی زیاتر زیندانی دەبێت.

مێژوو نووسێك كەتابوتی بێ بەرهەمی رووداوەكانی رابردوو وروداوە بێ كاریگەرەكانی كەسانی رابردووی كەللەگەنیو رزگار دەكات و سەرگوزەشتەی مرۆڤ و ژیان ورەنجو ئازارەكانو شەوقو تاسەی رۆح لەپشت ڕوخساری نەناسراوەكانی داهێنانە بێ ناونیشانەكان دەپشكنێت و لەرێڕەوی مێژوودا بەدوایاندا دەگەڕێ، دەتوانێت بڕستێكی درێژ لە ستەمەكان و تاوانەكان و ئەو كارەساتانەی كە مرۆڤیان ئازارداوە و دەیدەن، ئامادە بكات، پێڕستێك كەسەراپا دروستبوونی دەستی مرۆڤە، دوژمنانی مرۆڤ، دوژمنانێك كە خۆیان لەریزی مرۆڤەكانن.

زۆر، یاساشكێنی، هێرش، دزی، ئەتكردنی ناموسو حورمەت، راستی لەناوبردن، سنوربەزاندن، پێچەوانەی جووڵانەوە دژی شەرع، ئەشكەنجە، بەندەیی، مرۆڤ فرۆشتن،

زیندوو لە گۆڕنان، نەخوێندەواری، پاراستنی نەخوێندەواری، نەخوێندەوارکردن، ! ستەمکاری، بەفیزی، دوورخستنەوە، داگیرکاری، بەرهەمهێنان، گێل کردن، خەڵکخەڵەتاندن، خراپی وچەپەڵی، حەسوودی، بتپەرستی، کەس پەرستی، خەڵك پەرستی، رابەرپەرستی، پێغەمبەر پەرستی، ئیمان پەرستی، پارە پەرستی، داگیرکارپەرستی، ژن پەرستی، خوێنپەرستی، خاك پەرستی، خانپەرستی، سێکس پەرستی،... ووردە ووردە ئاڵۆزترو هێماداترو نەزانراوتر دەبێت.. بوروکراسی، تەکنوکراسی، فاشیزم، رەگەزایەتی، تەکنۆژیگەرایی، سەرمایەداری، داگیرکاری کۆن، داگیرکاری نوێ، بێگانەبوون لەگەڵ خود، سڕینەوەی فەرهەنگی، سڕینەوەی مرۆیی، فەلسەفەی پوچی، بوونگەرایی ماددی، ماددیگەری فەلسەفی، ئابوریگەرایی، فەلسەفەی رەسەنێتی بەکارهێنان، سیستەمی "رەسەنێتی بەرهەمهێنان" بەندایەتی سیاسی و ناوی سۆشیالیزم، بەندەیی ئابووری وناوی لیبرالیزم....

جێگای سەرنجەکە مرۆڤ خودا روخساری زانستی بوون وبینایی و تەواوی وجوانی و پاکی و ئازادی دەپەرست و خۆی بەردوستکراوی ئەو جیلوەوو هێما ونیشانەی ئەوی لەخۆیدا دروستدەکرد هەوڵیدەدا تاکو ئیرادەو ئایدیای خۆی لەگەڵ ئەودا کەناموسی بەدیهێنانە وڕۆحی جیهان وهەستو تەواوی وجوانی بوونو ئاهەنگی سروشتو جەوهەری عەقڵ وگیانی زانست هەماهەنگ بکاتو هەروەك ئەوانەی _جەهەننەمی نوێیان بەرپارکرد_ هاواربکەن کەخودا رەسەنێتی مرۆڤ دەروشێنێت و گوێرایەڵی ئەو و ئازادی مرۆڤ سنوردار دەکات وئیستا ئەو مرۆڤەی کەوازیان لەبەندایەتی خودا هێناوە و بەرەو کۆتی بەندایەتی خودایانی شاراوەو ئاشکرای بێشومار رۆیشتوون کەچەندین جارلە خودایانی سەردەمی هاوەڵ پەیداکردنو بتپەرستی وئەفسانەی نزمترو ناشیرینترو سەرشۆڕهێنەرترو کۆتو بەندترن.

لەسەردەمی ئەفسانە ئاسیدا مرۆڤ مانگ و "پرومتە"و ئەستێرەی دەپەرست کە وەهماوی بوون، بەڵام چەمك گەلی لەعیشق ودۆستیو بەرەکەت و فیداکاری لەبەرخاتری مرۆڤ ورۆشنگەری و ئاگری پیرۆزی شەوشکێن و زستان شکێن و جیلوەی جوانی و هونەرو شەوق و تاسەی ژیانیان بەدەستەوە گرت. هەمان ئەو عەرەبە نەزانە بتپەرستانە، چەندین بێ هێمای جوانی و هونەرمەند پەرستش دەکرد کە لە ژیان وخۆرو نوورو بەرکەتی ژیان وجوانی بەهارو شەوقی جوانی ودلێری مرۆییو بەخشندەیی وچاکەو حەقیقەت وعەدالەت و سەربەرزی و شەرەف وخوێن پاکیو پەیوەندی و پەیوەستی عیشق و سەوزبوونی تۆو وزوڵاڵی سەرچاوە و تەڕی باران و سەفاو پاکی ئاسمان و ئازار کەمکەرەوەو رزگاری مرۆڤ حیکایەتیان دەکرد و هەوڵ پەیداکەری نوێ چەندین بتی تاشیوە کە هێماو رووی ناشیرینی وپیسی و درۆو فێڵو دووڕوویی و سەرشۆڕیو دڵڕەقیو بەهرەکوشتن و بەندایەتی و تاریکی وبێ‌رەحمی ودڕندەیی وتارکی و ستەمن: ماددیگەری، سەرمایەداری، سنورداری، ستالیزم، مائۆنیزم، تەکنۆلۆژیاگەرایی، فاشیزم، رەگەزپەرستی، ئابووری، فرۆیدۆنیزم، نهیلیزم، ناسیۆنالیزم، شۆڤینیزم، سیکسوالیزم.

لە جیاتی هاوەڵ بڕدانانی (شرك) جوانی کۆت کە مرۆڤی بەرەو پەرستنی میتراو ئاناهیتاو "پرومتە"و ڤینوس وئەتلەس و زوهرەو ئاهورا بانگ دەکرد کە بەهەرحاڵ مانای باڵاو سیفەتی ئیلاهی و فەزیلەتی پیرۆز و بەهای ئەخلاقی مرۆیی بوون، هەرچەندە وەهماوی و بەلایەنی کەمەوە بێکاریگەر، شیرکی نوێ چەندین بتی لەپەرستگای رەش و ترسناکی ئەم شارستانیەتە دروستکردووەو جێگیرکردووە کە هێماو نیشانەی ئیبلیس و واقیعیاتی بوونو ترسناك و جەهەننەمی!

خـودای یـەکتایی کەیـەکتایی بـوونی مرۆیـی و نزیکـی مـرۆڤ و سروشـتی ئاراسـتە دەکردو بەها باڵا مرۆییەکانی بەپەرستنی خۆی لە مرۆڤدا هەمیشە زینـدوو رایـدەگرتو بەبوونو ژیانی مرۆڤ و بەپەیوەندی مرۆڤ بـەجیهانو بەسیـستەمی سروشـت و پـەیکـەری بـوون و هەسـت و ئامـانج و لـە ئەنجامـدا "مانـا"ی پـێ دەبەخـشی و خـودی خـۆی جیلوەگای بەرزی هـەموو فەزیلەتـەکان بـوو کـە مـرۆڤ لەناسـینی وعیشقو پەرسـتش و پەیرەویکردنی وخۆسپاردنی بەو شتانە، تەواوکاری بوونی و مەعنەوی خۆیشی ئاراسـتە دەکرد و هەم خێرای دەکـردو هـەم حـەزو شـەوقی پێدەبەخـشی وبوونێـك بـوو "بـصیر، علیم، حکیم، عزیز، جلیل، رحیم، رحمن، غفور، کریم، لطیف، هادی، حبیب، وکیل، عـادل، محسن، مصلح، منتقم، جمیل" لەگەڵ شەپۆلی راگەیاندنی رۆشـنبیرانی بورجـوازیی نـوێی ئـەوروپای سـەدەی هـەژدەو نـۆزدە کـە منـداڵانی نامەشـروعی زینـای"داگیرکـاری" و"سـەیارە" بـوون و بـۆنی"پـارە" مەسـتی کردبـوون، لـەهزرو ژیـانی کۆمەڵگـەی ێن وێ رۆیشتو لە جیاتی ئەو پەرستراوە تایبەتەکانی ئەم چینە _کە فەرهـەنگ و ئـەخلاق و دەروونناسی و جیهانبینیان نزم و ماددی و بازاڕیەو بەمجۆرەی کەخواستی کۆمەڵایـەتی و پێگـەی توێـژیان "مـام ناوەنـد" ([1]) دانیـشت: پـارە، بـەکارهێنان ومەسـرەف،

---

[1] ئەم ووشەی "دونیا" چەند بەچاکی لەگەڵ جیهانو جیهانبینی ئەم چینە سازگارە، نەك تـەنها بەمانای زاراوەکـەی کـە لـە فەرهـەنگ ئـەخلاقی ومەزهـەبی ئێمـەدا زۆر بەسـود وقوڵـە، بـەڵام لەدیدو روانینی زاراوەیش لە دابەماناى، نزم، نزيك، بەردەم پێ.... ئـەوەی کەتـەنها کـورت بینـەو خودگەراو خۆپەرست وروانینێك کەتەنها بەردەم پێیەکانی خۆی دەبینیت ودورتر نابینێت لەسەرئەنجامو کۆتایی کار بێئاگایە وهەستی سەروتر ناروات و تەنها خـۆی دەبینێـتو دەپێوێـت، دونیـا قەڵـەمرەوی تـەنگ و بەستووی ڕۆحێکی نزمی خۆبینی مام ناوەندو رۆحی غەریزی ئاکە کەسیە، دونیا ژیـانی مـاددی ئـاکی بورجوازێکە، نـەك جیهـانی مـاددی، سروشـت یـان سـامان وئـابوری کەلـە قورئانـدا بـەناوی "خـێر" و "فەزڵی خودا"ناوی هاتووە.

خۆشگوزەرانی، سێکس، سەرمایە، رابەر، خۆشی، خوێن، نەژاد، چاودێری، دەسەڵات، سوود، چێژ.

ئەمانەن "سیفاتی پەرستراو" و"اسماء الحسنی" و"بەهاو فەزیلەتەکان"ی مەزهەب و ئەخلاق و فەلسەفەی ژیان و مانای بوونی مرۆڤی نوێ لە فەرهەنگی بورجوازی مۆدێرن کە رۆشنبیرانی دووسەدە پێشتر _بەناوی زانست_ ئاوازیان لێ بەرزبوویەوە کە لە میحرابی ئیمانی چینەوە توێژەکانی خەڵکان خودا وەربگرینەوە و لایبەرین تاکو مرۆڤ لەجێگادا دابنێت و ئێستا بەچاو دەبینین کەخودایان نەهێڵاوە و لەبەرئەوەی بەئەزموون بۆیان دەرکەوتووە کەئەگەر خودا جیهان و لە ژیانی مرۆڤ نەمێنێت، جیهان پوڕ دەبێت و ژیان پووچ ولەجیهانێکدا هیچ مانایەکی نیە، قسەکردن لەمانای مرۆڤ وەهماویە و ئەگەر بەها مرۆییەکانی وەکو: جوانی، خێر، حەقیقەت، رەحمەت، گەورەیی، بوون، خۆبەخشی، فیداکاری، تەواوکاری، ئازادی، هیدایەت، رزگاری، ئاگایی، راستی، یەکسانی، عیشق، و...

لەم جیهانەدا واقیعیەتێکیان نەبێت، لەناکاو هەمووبان بەجۆرێك لە شکانی وەهماوی دەگۆڕین ولە ئەندێشە، ژیان و کۆمەڵگەی مرۆیی بەیەکجاری تێك دەشکێن و نامێنێت و لە ئەنجامدا، "ئەخلاقی مرۆیی" کە سیستەمێك لە بەها باڵاو رەسەن و ریشەدار و فەرمانڕەواکان بەسەر ژیان و سەرووتر و مەزنتر و خۆشەویستر لە بوونە و تەنها لەبەرئەوەیە کە سەر سپاردن و فیداکاری لەپێناو ئەوشتانەدا ئاراستە دەبێت و هەر مرۆڤێك و کۆمەڵگەیەك لەگەڵ ئەم پێوەرانەدایە کە (هەڵدەسەنگێنرێن) و دیارە کە سروشتێك خودای تێدا وون بێت — واتە هەست و ویژدان و ئیرادە و ئامانج — ئەرزشەکانیشی تێدا ونە و لەبەرئەوە بەگوتەی ئیزولە Isoulet ( ئەگەر خودا لەژێر بینای ئەخلاق لابەرین، دەکەوێت، چونکە گەڕان بەدوای راستی و دادپەروەری بۆ ژیانی مرۆڤ، لە جیهانێکدا کە تێیدا ونە وەکو وەرگرتنی جامێك ئاوی شیرین و خۆشە لە ئۆقیانوسێکی پڕ لە ژەهر، رادیکاڵەکانیش کە تەنانەت لە ( ١٨٠٠)ی زایینیدا لە درێژەی راگەیاندنێکی رەسمیدا کە بوویە بنەمای پەروەردە و فێرکردنی قوتابخانەکان و

رایانگەیاند کە پەروەردەی وەچەکانمان لەسەر بنەمای بەها ئەخلاقی و فەزیلەتە مەعنەویەکان پێویستیان بە خودا نیە ولەمەودوا دەبێت عەقڵ لە پەروەردەی ئەخلاقیدا بکرێتە جێنشینی خودا، بە گواستنەوەی گوتەکانی "ژان ئیزولە"، "ئەم فەلسەفەیە، ئاسمانی فەرەنسای ڕەش کرد و پایەی هەموو بەها مرۆییەکانی تێکشکاند! عەقڵ؟ عەقڵ هێزێکە کە باشترین مەرج و تواناو هۆکاری بۆ هەرچی زیاتر پاراستنی بوون و هەرچی زیاتر ژیانی مرۆڤی عاقڵی فەراهەمکرد، لە حاڵێکدا کە بەها ئەخلاقیەکان و"فەزیلەتە پیرۆز و باڵاکان" ە کە بوون گرانبەهاترلە ژیان بەرێزترە و تەواوکاری و فیداکاری وخۆبەخشی لە ژیان واتە "فیداکاری"یە، قۆناغێك سەرووتر لە عەقڵ، واتە عیشقە کە دەتوانێت لە خۆبواردن فێری مرۆڤ بکات و بێگومان کەسێك کە لە خۆی دەبورێ و واز لە خۆی دەهێنێ، مرۆڤێکە کە لە بەرامبەر ئەوەی لە بوون و ژیانی خۆی بە گرانبەهاتر و بەنرخترە وله سروشتی بێ خوادا لە بوون و ژیان بەبایەختر چیە؟ ڕێککەوت ئەگەر دەبینین لە درێژایی مێژوو و ئێستاش – ماددیگەری و سروشتگەرایی هەمیشە فەلسەفەی ئاراستەکەری ژیانی پوچ و توخمی بێ بەندوبار و بێ گوێدان بوو، چونکە ئیمان بەرپرسیاریەتی خستونەتە سەر و باوەڕبوون بە بوونی خودا لە جیهاندا زنجیرەیەك لە ((شایستە و ناشایستە)) حیساب و کیتاب، سزا و پاداشت)) دەخاتە سەر کردارەکانیان و کۆمەڵێك شتیان دەخاتە ئەستۆ و (بێ مەزهەب) لە ئەندێشە و بیردا لەگەڵ (ڕێگە پێنەدراوی) لە (کردار)دا هاوواتابووە و سروشتیە کە (پوچگەرایی)) شێوەیەکی بیرکردنەوەیە کە گوێنەدان و پەیمان نەدان و بەناونیشانی شێوەیەك لە ژیان سازگارە، چونکە هەر ئایدۆلۆژیایەك و جیهانینیەك، جۆرێکی تایبەت لە ژیان و کار دەخوازێت.

چون بی سر و پا باشد أوضاع فلك چونین

در سر هوس ساقی، در دست شراب اولی

ماددیگەری لە رابردوودا بەپێچەوانەی بیری ئەمرۆ توانای زانستی و هونەری کەلامی ولۆژیکی جەدەلی بەو جۆرەی نەبوو تاکو روخساری خۆی ئابرومەندانە دەربخات و تەنانەت بەهێزی سیحر ئەنگیزەی فەلسەفە و ماتماتیك و هوشیاری سیاسی لە بەهرە وەرگرتن لە لاوازی و داروخانی رۆحانیەت و گرێی ئابوری و فاشیزم و کارەساتی سەرمایەداری تەنها بە جیهانبینی سازگار لەگەڵ بەها مرۆییەکان و ئاراستەکەری فیداکاری و بەرپرسیاریەتی و خۆبەخش و شایەتیدان خۆی بناسێنێت و زۆر سەر راست و بێ پەردە و بێ سەفسەتە و فەلسەفە، رایدەگەیاند کە شوێنی راکردنی سروشتی و پەناگەی ئارام و ئاسان و ئازادی گۆشەگیرانی بێ خەم و دەسەلاتدارانی قارونی و مرۆڤانی فیرعەونیە کە لە سنوربەزاندن و راستی کوشتن و خوێنمژین و یاسا شکێنی و ریسواکەری و خستنە ژێرپێی هەموو مافەکان و پیسکردنی پیرۆزیەکان و ئەتککردنی هەموو حورمەتەکان، هیچ کۆت و بەندێك و سنورێك بۆ سواران و سنوربەزاندنیان سنوردار نەکات. بێ خودایی بۆ ئەمانە کارتی رێگەپێدانە لەهەر مەترسیەکە، چونکە بە گوتەی "دیسکۆفیسکی" کە "سارتەر" لەگەڵ هاوڕابوون لەگەڵ بوچونەکانیدا دەیگوازێتەوە (هەرکات خودا نەبێت هەموو کارێك رێگە پێدراوە) رێککەوت نیە.

مرۆڤ بە "ئازادی" دەستپێدەکات و مێژوو سەرگوزەشتەی نارەحەتی و سەختی ئەو بووە لەم زیندانەوە بۆ ئەو زیندانە ! و هەر جارێکش کە زیندانی خۆی گۆڕیبێ، هاوارێك بەشەوق و تاسەوە دەکات کە: "ئازادی"یە !.

مرۆڤ تەنها بوونەوەرێکی سروشتیە کە زنجیری هۆکاری کوێری و ماددیەت دەتوانێت لەدەست و پێی ئەندێشە و کرداری خۆی بکاتەوە و لەجەبری فەرمانڕەوا بەسەر هەموو دیاردە سروشتیەکانی خۆی رزگار بکات، خودی خۆی ئەڵقەیەکە لە زنجیری ناکۆتایی، خودی خۆی هۆکاری جەبری هۆی سروشتیە، بەڵام هۆکاری سروشتی خۆی دەتوانێت بگۆڕێت، دابهێنێت و بەوجۆرەی دەیەوێت (هەڵبژێرێت). گیانداران بەداخوازی (هۆکاری سروشتی) دروست دەبن و بە داخوازی (غەریزەکان) هیدایەت ورێنمونی، ژیان، رەفتار، حاڵات و سیفات، پەیوەندی و کرداریان، هەموویان دروستکرا و شێوە گرتوو و بەڵام

لەم نێوەندەدا گیاندارێکی ڕاپەڕیوە کە دەتوانێت گەردنی خۆی لە کۆڵی سەختی هۆکارە سروشتیەکان ڕزگار بکات و تەنانەت دەتوانێت دەستەمۆیان بکات، ئەمەش بەپێی ڕادەی تەواوکاری و ژیری خۆی و هەروەها لە بەرامبەر کوشتنی فێری غەریزەکانی خۆی بوەستێت و هەروەها بەپێی ئەوان کار بکات و ئەمەش موعجیزەیەکی سەرسوڕهێنەرەو باوەڕنەکراوی جیهانە و ئەو هۆیەی کاردەکاتە سەری کاری تێ بکات و بیگۆڕێت، چاکی بکات، بەهێز یان لاوازی بکات بەهەر حاڵ (علت)ی خۆی بکاتە (مەعلول)ی.

ئەمەش جەوهەری واقیعیەتێکی دیالێکتیکیە و مانای (پراکیس) هەر ئەمەیە، ئەوەی کە مادیگەری دیالێکتیکی تەرحی دەکات بەڵام لە بەڵێنی ئاراستەی عەقڵی ئەو تەرحە نایەتە دەرەوە، لەبەرئەوەی بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کە لە جیهانبینی یەکتایی قسەکردن لەبارەی مرۆڤەوە – بەناونیشانی هێزێکی سەربەخۆ لە زنجیرەی جەبری ماددی کوێر لە نێوان ئەو و سروشتدا کە دوو ئیرادەن، یەکێکیان ئازاد و ئەوی تریان جەبری و کوێر، پەیوەندی دیالێکتیکی بوونی هەیە – ئاسانە و جێگەی سەرنجە کە جیهانی مادییگەریدا کە هەموو جوڵەکان، یاسا و ڕێساکان، دیاردەکان و کاروکردارەکان واتە هەموو هۆکارەکان بەیەك شتی سەرەتایی – ماددە– لێکدەدرێنەوە، ناچار هەموو شتە بەرامبەرەکان و دژەکان بۆ یەکتایی یەکەمین دەگەڕێنەوە لۆژیکی و دیالێکتیکی، لە کۆتا شیکردنەوە و ڕاڤەدا، بە لۆژیکی میکانیکی دەگۆڕێت، چونکە دەبێت لەماددەوە دەست پێبکەین و لە هەمانکاتدا جگە لەماددە بەهیچ بوونێکی دیکە ڕازی نەبین، ئایدیا (مرۆڤ) هۆکاری جەبریەتی و پەیوەندی(علت) نێوان ئەم دوو پەیوەندیە یەك لایەنە (میکانیك)یە و قسەکردن لە پراکیس، واتە کرداری مرۆڤ کە بەناونیشانی ئیرادەی بەئاگا، بەسەر جەبری سروشت یان مێژوو کە دروستکراوی یاسا و ڕێسای کوێری ماددیە ولەدەرەوەی دەستگەیشتنی مرۆڤەوە کاردەکات و فەرمانڕەوایی بەسەردا دەکات، بەناونیشانی هۆکارێکی دەرەکی لە زنجیری پەیوەستی (علیت)ی ماددی شایەنی دەرك نیە، چونکە ئەگەر جگە لەماددەی کوێر هیچ نەبێت، لەدەرەوەی

زنجیرەی (علیت)ی مادیش هیچ شتێك بوونی نیە و راگەیاندنی ئەم دروشمە کە (مێژوو، دروستکراوی ئیرادەی مرۆڤەکان)ە کاتێك کە بەتێروانینێکی ماددی گەڕانە پرسیار لە ئیرادەی مرۆڤەکان دەپرسین و وەڵام دەبیستینەوە کە (ئیرادەی مرۆڤەکان دروستکراوی جەبری کوێر و هۆکاری کاری ماددییە) دروست ئەو پیاوە وەبیردەهێنێتەوە کە بەهۆی سفرەی رازاوەی خانەکەی ستایشی دەکرد و گوایا ئەم خۆراکانە هەمووی کاری دەست خێزانیەتی و لەوەڵامی پرسیاری میوانەکان کە بە سەرسوڕمان و ستایشەوە پرسیاریان دەکرد چۆن؟ روونیکردەوە کە تەلەفۆنیان کردووە و لەدەرەوە خۆراکیان بۆ هێناوە!.

ئەگەر مرۆڤ بوونەوەرێکە کە بوونی سروشتی ماددی دروست دەکات، نەژادی هەرێمی ماددی دروست دەکات، هزر و بیری سستەمی کۆمەڵایەتی دروست دەکات، کەسێتی فەرهەنگی ژینگە و دەورو بەری دروست دەکات، ئەخلاقی پێگەی چینایەتی دروست دەکات و ئیرادەی ئامێری کارکردن دروست دەکات، ئەو شمشێرێکی بێ پەل و دەمە و کە تەنها بوونێکی نوسراو یان وتراوی هەیە و دەڵێت تەنها لە راگەیاندن و کتێبە ئایدۆلۆژی و ئەدەبیاتی سیاسی و گفتوگۆی رۆژانەی رۆشنبیرانەوە وەربگیرێت لە پێکهاتەیەکی لەم جۆرە کە کاری دەستی بێ "خود" و (ناخودئاگایی) و بێ (بەها)یە بەناونیشانی هێزێکی سەربەخۆی ئازاد کە لە بەرامبەر هێزی جەبری ژینگەی سروشتی یان کۆمەڵایەتی دەتوانێت وەکو "هۆکار" ێك کاربکات و لەگەڵیدا لە پەیوەندییەکی دیالکتیکیدا بێت ولە زنجیری پەیوەستی (علیت) ماددی بچێتە دەرەوە و بەگوتەی "فیورباخ" (خودی خۆی ببێتە خودای خۆی) و جیهان لەگەڵ ئاگایی و ئیرادەی خۆیدا بگۆڕێت و مێژوو بە دوودەستی خۆی دروست بکات و بەهێزی خودسازی ئایدۆلۆژی بەسەر چینی کۆمەڵایەتی خۆیدا سەرکەشی بکات و دژی سیستەم و فەرهەنگ و ئەخلاقی بێت و بەهەڵبژاردنی لایەن و سەنگەری شۆرش و بەدەستهێنانی ئازادانە و زانستی شۆرش هەڵبژێرێت و بنیادی کۆنی و وەستاوی کۆمەڵگەی بگۆڕێت و (واقیعیەتە دیار و ماددیەکان) لەسەر بنەرەتی (حەقیقەتە مەعنەوی و هزریەکانی) خۆی بگۆڕێت و

جارێکی دی سەر لەنوێ دروستیان بکاتەوە و لەرێگەی هێنانەدی ئەم (ئایدیا زانستی و فیکری و ئامانجە ئایدۆلۆژیکیەکان و بەها مرۆییەکان و ئەخلاقیەکان) ئارەزوو غەریزە سروشتیەکانی خۆی بخاتە ژێر پێی خۆیەوە و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و مێژوویی و جینایەتی خۆی تێك بدات یان چاکسازیان تێدائەنجام بدات و رۆیشتن و جوڵەی جەبری خۆی بگرێت و ژێرخانو پێکهاتەی دەرەکی کۆمەڵگەی خۆی بەویستی دڵی خۆی لەناکاو بگۆڕێت و بەپێچەوانەی داخوازیە سروشتی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و جینایەتی و بۆماوەیی خۆی (کاروکردار) ئەنجام بدات.

هەڵبژێرێت، خیانەت بکات، سەرکەشی بکات، یاخود لەبەر خاتری دەمارگیری بۆ ئامانجە هزری و ئەو بەها پیرۆزە ئەخلاقیانەی کە لە (ئایدۆلۆژیا)ی خۆی وەریگرتوون، واقیعیەتی ماددی و زانستی بوونی خۆی و سوود و خودی ژیانی خۆی فیدابکات و تەنانەت عاشیقانە بوونی خۆی ببەخشێت و لەبەر خاتری رێزی مرۆیی و حورمەتی ئازادی و شکۆ و پاکی و پارێزگاری جەوهەری مرۆیی لە تەنیایی خۆی و دوژمنی، جەستە بەزەلیلی نەکات و بەدەستەوەی نەدات و بەڵێ نەکات بۆ نرخی گیانی خۆی بە پوچی و بۆ مانەوە بەوەفاداری بەراستی و حەقیقەت و پاسەوانی ئابوری سەنگەر و لایەن و هاوڕایان بهێنێتەوە و بمرێت و لە خەڵوەتی بێدەنگی دەمی سپێدەدا بەمەرگ پێبکەنێت تاکو داوێنی پارێزگاری خۆی بەپاکی بهێڵێتەوە و سەرچاوەی زوڵاڵی و دڵسۆزی لە ئیمان و جیهاددا پاك بمێنێتەوە، خۆی بەشکاندنی رۆژانەی لاوەکیەوە خەریك نەکات ولە بەرامبەری وەسوەسەکان و هەڕەشەکان و تەماعەکان و ئارەزوو و ژیان و بەکارهێنان و ژینگە و پارە و...دوژمن، خۆراگر، هۆشیار، بیرهێنەروە، رازیکەر، پارێزگار، بێهات و هاوار و بێدەنگ لە (دونیا) و سەودازەدە و (خۆفرۆش) بە بەها خودایی و ئیمانی و دوارۆژییەکان.

ئەم هەموو رێز و جوانی و پیرۆزی و بەها و فەزیلەت و موعجیزانەی کەنەك لە سروشتی کوێر و بێ هەست کە لە سەدو چەند تۆخمێکی فسیۆلۆژی بەرهەمهاتوون،

بەڵکولە دەماغی عەقڵ و زانستیشدا ناگونجێن، لە کوێوە ڕژاونەتە نێو ناخ و دەروونی مرۆڤەوە؟ ئەم مانا بەرزە ئەودیو سروشتیانە تەنها لە مرۆڤدا مانایان هەیە.

رووی قسەم لەگەڵ ماددی گەرایەکی نوێدا نیە کە ئینکاری بوونی خودادەکات تاکو بێ خودایی، نا بەرپرسیاریەتی خۆی لە جیهاندا، بێ ئازاری لە ژیان و بێحورمەتی خۆی لە ئەخلاق و بێباکی خۆی لە کوشتنی حەق و پیسی و ناشیرینی و گوێنەدانی لە ئەستۆی هەموو بەها مرۆییەکاندا ئاراستەبکات و ژیانی ئەپیکۆری خۆی لە جیهانبینیەکی لەم جۆرەوە دەربهێنێت و لە جیهانی خاڵی بە مرۆڤی پوچ بگات و ناچار بەفەلسەفەی پوچی ولە جیهانێکی لەمجۆرەشدا، مرۆڤێکی لەم جۆرە، تەنها شتێك کە مانای هەیە لە لای و دەخرێتە روو، چێژە و ئیدی هیچ!.

شتێکی رێککەوت نیە کە رۆشنبیرانی بوجوازی، پاش ئەوەی مەزهەبیان بەناوی زانستەوە وازی لێهێنا و پەرستیشیان بە بیانووی ئازادی خستە سەر پشت، ئیدی ئێستا نە ئازادییان کەسێك دەخەڵەتێنێت و نە زانستیان ئابڕوویەکی هەیە و نەعەقڵیان — کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد دەیەوێت ببێتە جێنشینی خودا — کەمترین بەهای نیە، ئێستاکە دەستیان هیچی تێدانەماوە راستەوخۆ باس لە پوچی دەکەن و ئەوە رادەگەێنن کە ماددی گەری بورجوازی کە دەیویست رێبەرایەتی مرۆڤ بکات و رزگاری بکات و بیگەێنێتە ئازادی و بەهەشتی گەراوەی خودا، خۆیان بەهاوکاری زانست و تەکنەلۆژیا و ئازادی تاکەکەسی لەسەر رووی زەوی بنیابکات.

ئێستا جەهەننەمێکیان بۆ مرۆڤ بەرپاکردووە کە ئازادیەکەی تەنها سوودی بۆ سەرمایەداران هەیە تاکو ئازادانە دروستکراوی خودا بەپێی ویستی ئەوان بجوڵێن و بیانکەنە بەندە و بەردەستی خۆیان، تەکنەلۆژیاش بەجۆرێك ترسناك بووە کە مرۆڤایەتی بەزانستی سەردەبڕێت و فیترەتی مرۆیی تیادا دەسڕێتەوە و هەموو بەها مرۆییەکان کە تەنانەت لە سیستەمی نامرۆیی سەرمایەداری گیانی تەندروستی خراپ کردبوو و لەسەدەکانی ناوەراستی رەشیشدا لەگەڵ رۆحی مرۆڤدا پەیوەست بوو ولە ویژدان و چینە مرۆییەکان ولە دووتوێی فێربوون و پەروەردە و فەرهەنگ و ئەخلاقی

میللەتەکان بڵاودەبوویەوە و تەشەنەی دەسەند و گەشەی دەکرد وە زانستیشی مرۆڤەکانی لە جەوهەری مەعنەوی و تایبەتمەندی جیایی و گەرم و گوڕی و دووڵی عیشق کە لە مێژوودا هەمیشە موعجیزە بەرهەم دەهێنێت، خاڵی کردوەتەوە و خۆی بوەتە تیغێك لەدەستی سەرمایەداری و داگیرکاری و دەسەڵاتخواز کەهەمیشە ولە هەموو جێگایەکدا لەمێژوودا دوژمنی زانست بوون، ئێستا بەبێ هیچ شەرمێك، بەئاشکرا تەپڵی ریسوایی خۆیان بەسەر بورجی بەرزی رۆژئاوادا لێدەدەن و ئێستا دان بەوەدا دەنێن کە هەموو باغە سەوز و سورەکان کە رۆشنبیرانی بورجوازی سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەم پیشانی میللەتی دەدەن و رایان دەگەیاند کە خەڵکینە!

خودا مردووە، ئێستا ئێمە پێغەمبەرانی عەقڵ و پەیامبەرانی زانست، بە موعجیزەی سەرمایە و سەیارە هاتووین تاکو مرۆڤەکان بێ نیاز بە خودا، ئیمان، عیشق، ئەخلاق، بەرپرسیاریەتی و ئەندێشەیەکی وەهماوی کە جیهانی بەخاوەن هەست و ویژدان و ماناو ئامانج و مەبەست و حیساب و کتێب دەژمارد و مرۆڤ لە بەرامبەریدا پەیمانی دەبەست و پێوەی دەبەستراییەوە و بەعیشق و پەرستش و نزیکی و خۆ بوونیادنان لە بەرامبەر ئەرزشە نامادی و مەعنەویەکان و سیفەتی بەرز و باڵاو بەرزتر لەوەی لەسنوری سروشت و ژیانی سروشتی و غەریزی بانگ دەکرد – بەرەو ئازادی، رزگاری، تەواوکاری، خودئاگایی، رەسەنێتی مرۆڤ، برایەتی مرۆیی، بەرامبەری کۆمەڵایەتی، زانست، تەکنەلۆژیا، جوانی، خۆشگوزەرانی، ئاشتی، خۆشبەختی و بەهەشتی زەمینی رێنمونی بکەین، هەموو ئەمانە قسەی ئامادە بوون، لە خۆشبینی نەزانانەی ڤۆڵتێرەکان یان فێڵبازانەی گۆشەگیرانە و زانایانەی فیزیۆکراتەکان و لیبراڵ و سیاسەتمەدارەکان و دەرەبەگەکان و هەوادارانی بازرگانی ئازاد، چاودێری ئازاد،سنوربەزاندنی ئازاد، کوشتنی ئازاد، بەندایەتی و بەندەیی ئازاد، ریسوایی و خراپەکاری و تاوانی ئازاد...

قسەی کۆتایی و کۆتا قسەی حیسابی مادیگەری بورجوازی کە بەبێ هیچ پەردەپۆشیەك و فێڵبازیەك ئاشکرا بووە و مانفێستی ئەم ئایدۆلۆژیە ئەوەیە کەئە لەزەویدا مانایەك هەیە و نەلە ئاسمان. جیهان و هەرچیش کە تێیدایە هیچ لە هیچدایە!

ماددیگەری، چرای جادووی زانستی لە دەستێك و گۆچانی جادووی تەکنەلۆژیا لەدەستەکەی دیکەیدا و هەموو جێگەیەك گەڕاوە و هەموو ڕێگاکان ڕۆیشتووە، و فەلسەفە کاری بەرەو پوچی ڕۆیشتووە، هونەری کاری بەرە و پوچی ڕۆیشتووە، رەسەنێتی مرۆڤدا لە کۆتاییدا بەپوچی گەیشتووە، بنەڕەت و مەبەست و مانای ژیان هەمووی پوچە، لە بنەڕەتدا مێژوو بەرەو پوچی هەنگاو هەڵدەگرێت، مرۆڤ چارەنووسی پوچی هەیە.

پوچی! (absurdie) ئەوەی کە ن وسەرەکانمان بە پوچی وەریانگێڕاوە لە سەدەی بیستەمدا ئومێدی ڕۆشنبیرانی ئازاد بیرکەرەوە بۆ رزگاری مرۆڤ لە جەبری ماددی و خەیاڵی مرۆیی و سوکی و تەسکی بوون کە لە ڕووی فەلسەفی و مرۆڤناسی و ئەخلاق لە "مارکس"یزمدا هەستیان پێدەکرد، بە بوونگەرایی بەرپرسیاریەتی و سۆشیالیزم بیپارێزن و لە هەمانکاتدا لە کوچە داخراوەانی "مارکس"یزم تێپەڕبن و هەم سەقفی کورت و خنکێنەری جیهانی ماددیگەری فیزیایی سەدەی نۆزدەهەم لەسەر ڕووی ئەندێشەی مرۆڤ لابەرن و هەم چوارچێوەی سەخت و سوکی ماددیەتی کوێر لەسەر پەیکەری بوونیدا بشکێت و بەجارێکی دی ڕەسەنێتی و حورمەت و گەورەیی و بەهای بوون و ئەودیو سروشتی دێریی پێ بدەنەوە بەشەوق و تاسەوە زۆر چاویان لە کییەرك گاردەکان، یاسپرسەکان، هایدگەرەکان، کانتەکان، .... برِی و...بەداخەوە کە بوونگەرانیش بە پەیوەست بوونی بەمادیگەری، هەموو ئەو بەهایانەی کە بەمرۆڤی بەخشیبوون، ئەوەی کە "مارکس"یزم ناتوانێت بیبەخشێت، وەریگرتنەوە، ڕۆحی بورجوازی لەگەڵ ماددیگەری بەجۆرێك نزیکیان پێکەوە هەیە کە هەرچەندە ئیرادە و ئاگایی لە خۆی دووربخاتەوە بەکۆششی فێری کە لە هاوخوێنی و هاونەژادی و هاونیشتمانی و نزیکی خێزانی و نەتەوەیی و خێڵەکی و جارێکی خود ئاگا و ناخود ئاگا بەرە و ئەوە رادەکێشرێن.

ئەمە بوو کەنەك تەنها بوونگەرایی کە بە خودا کردنی مرۆڤ دەستی پێکرد بە هیچی و پوچی گەیشت کە قوڵترین و گەورەترین ژێرخانی فەلسەفی مرۆڤناسی پوچی،

فەلسەفەی مێژووی پوچی، هونەری پوچ و لە ئەنجامدا، ژیان پوچ بوو و باشترین ئاراستەکەری فشەڵ بوون و رزگار بوون، شانۆ و فیلم و شیعر و ئەدەبیات و تەنانەت زمان چوچ! ئەخلاقیش پوچ و لە ئەنجامدا ژیان پوچ بوو و باشترین ئاراستەکەری فشەڵبوون، رزگاربوون، بێ ئازار و نابەرپرس و بێ ئامانج و بێ مانابوون، هیچ بوون و نەپاراستنی هیچ و حورمەتێك و باوەڕنەبوون بەهیچ حەقیقەتێك تەنانەت ناشیرینی و جوانی، خزمەت و خیانەت، خۆ فیداکردنی خەڵك و بەپێچەوانەوە، خەڵك کردنە قوربانی خەڵك، شەهوەت و شەهادەت، ناتەواوی و تەواوکاری، چاکە و خراپە، هەموویان لەگەڵ یەکدا یەکسانن، چونکە کاتێك هیچ مانایەکی لە جیهاندا بوونی نەبێت، ئەم سنورانە، ئەو هێڵانەن کە منداڵەکان بۆ یاری لەسەر رووی زەوی دەیانکێشن!.

نەك تەنها لە بوونگەریدا پەرەسەنێتی مرۆڤ و کردنەوەی زیاتری جیهان و مانادارتر بوو ژیان نەگەیشتین، بەڵکو هەمان بەرپرسیاریەتی کۆمەڵایەتی و سۆشیالیزمی ئابوریشمان لەدەستداوە!.

هەموو ئەمانە ئەزموونی دووبارەیە کە نزیکی ماددیگەری و بورجوازی پیشان دەدات، ئەوە پیشان دەدات کە هیچ جیهانبینیەك و فەلسەفەیەکی باشتر لەماددیگەری کە جیهانی پوچ و خاڵی و بێهەست و بێ ئامانج دەخاتە روو بوونی نیە، شێوەی ژیانی ئەپیکۆر، چێژ پەرستی، بێ ئازاری و نابەرپرسیاریەتی ناتوانێت ئاراستە بکات و ئەمەش ئایینەی ژیان و تێڕوانین و رۆح و ئەخلاق و کۆششی گشت و دەروونناسی و چینایەتی و بورجوازی نوێیە.

لەم کۆمەڵانەدا لەبەر خاتری هەماهەنگی لۆژیکی و سازگاری سروشتی کە لە نێوان جیهانبینی و ئایدۆلۆژی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و شێوەی کرداریان بوونی هەیە، بابەتی مرۆڤ و بەها مرۆییەکان چارەسەر بوون، ئەوەی کە لە جیهانبینی ماددیدایە و هەم لە ئەخلاقدا بۆ مرۆڤ بەها خودایی و بەرپرسیاریەتیە نامادی و مەعنەوییەکان و لە بنەڕەتدا هیچ بنەڕەت و مانایەك و حەقیقەتێکی باڵاتر لە ژیان بەچاکی و خۆشی و نۆش و ئارامی و ئاسایش و ئیستراحەت و — وەکو بەرازێکی خۆشبەخت لە دڵی دارستانێکی

سەوز و پرلە گیاندار بەسەر بردن — بابەتێکی دیکە بوونی نیە و لەبەرئەوە، بابەتێکی وەکو بەرپرسیاریەتی، پەیماندان، بەها، پەیام، ئادیۆلۆژیا، ئامانج و فیداکاری و شکۆ و حورمەتە و ئیپار ولە خواترسان و جەوهەری مرۆڤایەتی و خراپە و زوڵم و ستەم و ناشیرینی و پیسی و سەرشۆری و ستەم قبوڵکردن و نەزانی و داروخان و گەورەیی و حەق کوشتن و بێ ئازاری و خودپەرستی و داخوازی سوودی تاکەکەسی و سنورداری و نەبوونی جیاوازی لە نێوان مرۆڤەکان و عیشق فیتری لەمەر بەپاکی و دلێری و گەڕان بەدوای راستی و پێشوازی لە سەختی و بەندکردن و بێبەشکردن و هەژاری و ئەشکەنجە و مەرگ لە بەرامبەر بەهاکان.و ئامانجەکان و لەرێگەی پاکسازی ژیانی مرۆڤ لە وشەیەکدا بەدەستەواژەی کۆنی خۆمان جیاکردنەوەی خود لە هەموو پەیوەستە بوونە دونیاییەکان واتە، دانانی هەموو ژیان و ژین و تەمەن و هەموو ئامادەگیەکان و تواناکان و فرسەتەکانی خود بۆ ئامانجێکی گەورەی مرۆیی، حەقیقەت پەرستی و سنوردارکردنی هەموو هەوڵ و تێکۆشانەکانی ژیان بە ئەمر و نەهی رۆیشتن بەرەو ئەم ئامانجە، فەرمان بەچاکە، نەهی کردن لە خراپە تاکو چ شوێنێك؟ تاکو ئەو جێگەیەی کە بۆ وتن یان نەوتنی وشەیەك بەئاسانی سەری گیانی بەرز دەکاتەوە وتنی وشەیەك یان بێدەنگیەك لە تەمەن بەخۆشەویستر دەزانێت ولەم مامەڵەیەدا نەك تەنها پاداشتێك و داوی ناسینێك لە لایەن ئەوانی ترەوە ناکات و تەنانەت لە خەڵوەتی خۆیدا ولە قوڵیی گیانی خۆیدا عیشقی بەرامبەر ئەم بەهایانە هەیە و حورمەتی ئەو گەوهەرانەی کە لە دەرونی خۆیدا دەدۆزێتەوە، بەبەهای بوونی خۆی دەپارێزێت.

رووی قسەم لەگەڵ ماددیگەری دژە بورجوازیە کە بە بەرپرسیاریەتی مرۆڤ، حەق پەرستی و بانگکردنی مرۆڤەکان، بەبەهای لەبیربردنەوەی ژیان و بوونی خۆی، بۆ هێنانەدی عەدالەت، ئازادی ئەوانی دی و بەشداربوونی چینە بێ بەشەکان و کردنەوەی رێگەی سەربەرزی و بەرامبەری و ئاشتی و تەواوکاری جۆری مرۆڤ بانگ دەکات ولە مرۆڤێك کەتەنها بیر لە سوودە ماددی و ئابوریەکانی خۆی دەکاتەوە و جگە لە ژیانی ماددی خۆی بیر لە هیچ شتێکی دیکە ناکاتەوە و ئەوە نەفرەتی هەیە و ستایشکەری

زۆر توندی مرۆڤێکە کە بوونی ماددی و ژیانی ئابوری خۆی لە بەرخاتری حورمەتی ئەم بەهایانە و هێنانەدی ئەم ئایدیایە و رووکردنە ئەوانی دی و ئاراستەکردنیان بۆ ئەم ئامانجانە و سڕینەوەی خراپیەکان و نوێکردنەوە و زیندووکردنەوەی جوانیەکان لە ژیانی ئایندەی مرۆڤ بە دڵسۆزی و عیشقەوە، بەبێ ئەوەی چاوی بەهیچ جۆرێك لە سوود و مامەڵە و لێپرسینەوەیەك بێت، دەبەخشێت.

مرۆڤێك لەم جۆرە کە بەهای ئەوەی نیە پرسیاری لێبکەین لە جیهانی پوچدا کە ونبووی هەر جۆرە بەهایەك، مانا، هەست و نەست و ئامانجێکە، ئەم بەها بالآیانە کە لە بوون بەرزتر و سەرووترن لە جیهان لە کوێوە هاتونەتە نێو دەروونی مرۆڤەکانەوە؟ ئایا ئەم مانایانە، لە دەرەوەی هزر و مێشك و خەیالآتی مرۆڤەکان لەم بوونەدا هیچ سەرچاوەیەکیان نیە؟ ئەگەر بەمجۆرەیە چۆن دەتوانین لەگەڵ ئەوەشدا بەرزی و بالآیی و گەورەیی ئەم بەها سەروو ژیانی مرۆییانە بەو جۆرە بکەینە فەرمانڕوا بەسەر ئەندێشە و باوەڕی خەڵکیەوە و بیانپارێزین کە مرۆڤی ئاگا و خود ئاگا — کە کرداری خۆی نەك لەسەر بنەمای عادەت و دەمارگیری و هەستی ناخود ئاگا، بەڵکو بە شیکردنەوەو ئاراستە و رێنمونی عەقڵی ولۆژیکی هەڵدەبژێرێت— وایان لێ بکرێت کە لە جیهانی خۆیدا لە بەرامبەریاندا هەستی حورمەت و رێزگرتن و گەورەیی و پیرۆزی و فەزیلەت و بەتایبەت "رەسەنێتی" بنوێنێت، بە جۆرێك بە توندی بوون و ژیانی خۆی بە عیشق و پەرستش و لە خۆبوردەییەوە بۆ ئەوان دابنێت.

بۆ کەسێك کە لە رێ گەی هێنانە دی ئامانجەکانیدا گیانبازی دەکات، ئەو ئامانجە بۆ ئەو کەسە بەهایەکی مەعنەوی هەیە، بۆ ئەو ئایدیایەکە، هەرچەندە بۆ کۆمەڵێك نرخێکی نەبێت.

"جۆرج پولیتزر" دەڵێت: "ئێمە لە فەلسەفەدا ماددیگەراین و لە ئەخلاقدا ئایدیالیزم!" راستە، بەڵام ئەوەی کە تێگەیشتنی قورس و دژوارە ئەوەیە کە چۆن ئەم دژیەکیە لە ئەندێشە و کرداردا دەتوانیت لابەریت؟

پێچەوانەی ئەم دژیەکیەش لە رەفتار گەلێك لە گروپە سوننەتی و رۆحانیە رەسمی و دواکەوتووەکاندا دەبینین، کەسانێك کە لە فەلسەفە و جیهانبینیدا ئایدالیزمن و لە کردار و ئەخلاقدا ماددیگەرا!

نوێکەرەوەیەك، زانایەکی بێلایەن، نیوە رۆشنبیرێك کەعەقڵی لەچاوەکانیدایە، ژنێك و پیاوێکی "ئەمرۆ" مافی ئەوەیان هەیە بەشێوەیەکی رەها ستایشی پێشکەوتن بکەن‌و تێنەگەن کە لە چ زەمینەیەك و بە چ نرخێك ولە چ لایەکەوە و بەسوودی چ چین‌و توێژێك؟ مافی ئەوەیان هەیە پشت بەرەسەنێتی زانست ببەستن‌و تەنها لە کۆمەڵگەولە مرۆڤدا بیبینن و زانست تەنها بە ماوکێشەی زانستی بزانن و لەگەڵ ئەوەشدا کەخۆیان کاری زانستی دەکەن ونازانن کارگوزاران چ یاساو سیستەمێك وکارمەندان چ توانایەکن، تێنەگەن کەتێروانینی زانستی، رۆحی زانستی، رێگەی زانستی، لایەنی زانستی، پەیماندان و بەرپرسیاریەتی زانستی‌و دواجار بەکارهێنانی زانستی چیەو چۆن هەریەکە لەمانە بەستراو بەسیستەمی کۆمەڵایەتی‌و بوونیادی کۆمەڵایەتی ولایەنی سیاسی‌و ئایدۆلۆژیا ورۆحی فەرمانڕوا و شوێن‌و پایەی چینایەتی‌و جۆرو چۆنیەتی پێکهاتەی کۆمەڵگە دەتوانێت جیاوازو تەنانەت دژیەك بێت.

زانست تەنها کۆمەڵێك هاوکێشەی بیرکاری و رێساو یاسای جێگیری سروشتی نیە، زانست، لە بنەڕەتدا بەپێی زەمینە بەدوو بەش دابەش دەبێت:

١- زانستی سروشتی([٦]) و بەگوتەی ئەورووپیەکان (scienes exactes).

٢- زانستی مرۆیی([٧]) (sciences humaines).

---

[٦] بیرکاری، فیزیا، کیمیا، ئەستێرە ناسی، فیسیۆلۆژی، رووەکناسی، گیانەوەرناسی، ژینگەزانی.....

[٧] کۆمەڵناسی، دەروونناسی، زمانناسی، ئابوری، خەڵکناسی، مێژوو، مرۆڤناسی.....

جیاوازی بنەڕەتی ئەم دووانە، وردی زانستە ماددی یان سروشتیەکان‌و وردنەبوونی زانستە مرۆییەکانە، چونکە، یەکەمیان زانستی ماددی یان سروشتی کەبابەتەکانی سروشتەو سروشتیش لە مرۆڤ سادەترو ناسینی ئاسانترە، کۆمەڵێك یاساو ڕێسای جێگیر وگشتگیرەو شتانی دەگمەنیان تێداکەمە وچونکە توانای هێنانەدی و ئەزموون تیایدا زیاترە وبینین و توێژینەوەو جێگیری سادەتر و مرۆڤی زانا بەسەریاندا زاڵترە، ناسینی زانستیمان سەبارەت بەدیاردە سروشتیەکان دڵنیایی ترو ئەو ڕێساو یاسایانەی کەلێیانەوە دەستمان دەکەون بەڵگەنەویسترە و لەبەرئەمەش، شیکردنەوەو بەش بەشکردن‌و شیکار و هۆکاری زانستی جێگیرترو لەئەنجامدا پێشبینی زانستی لەم زەمینانەدا راست‌و دروستە.

بەپێچەوانەوە زانستە مرۆییەکان، زیاتر لەسەر گریمانەکان، جێگیربوون زۆر ناتەواو، هاوسەنگی کەم ئیعتبار، نزیکی زیاتر "عەقڵی" تاکو "زانستی" و زیاتر بڕیار محوکی"هزری" تاکو "دیارو واقیعی" وەستاوە گەرچی لەم ڕووەوە، بەشە جیاوازەکانی زانستی کۆمەڵایەتی، ئیعتیباری زانستی جیاوازیان هەیەو بۆ نموونە زمانناسی‌و ئابووری بەچەند قۆناغێك لە کۆمەڵناسی و مێژوو، زانستی ترن، بەڵام ئەوەی کە تایبەتمەندی هاوبەشی تەواوی زانستە مرۆییەکانە، نەبوونی ڕێساو یاسای جێگیرو وونبوونی وردییە، کە لە ناسینی زانستی دیاردە مرۆییەکاندا بوونی هەیەو ئەمەش لەبەر دوو هۆکارە: یەکێکیان ئەوەیە کە لە بنەڕەتدا زانستە مرۆییەکان لاون‌و هەندێك لەبەشەکانی نوێ‌و تەنانەت منداڵن یان لەحاڵەتی لەدایکبوون‌و پەیدابوون‌و خاڵێکی تریش ئەوەیە کەبابەتی ئەم زانستانە مرۆڤەو ئەم بوونەوەرە پاڵۆزو هێمادارو نەناسراوەیە کە لە گەڵ هەموو بوونەوەرو دروستکراوە گیاندارو بێگیانەکاندا جیاوازی بنەڕەتی هەیەو نەتەنها چەند لایەن و نهێنی ئامێزو زۆر سەخت پێچراوەو ئاڵۆزو سەرسوڕ هێنەرە، بەڵکو خودی

خۆیشی گۆڕانی بەسەردادێتو لە هەمانکاتدا جۆراوجۆرو ئەوەی کەکاری زانستیش دژوارتر دەکات و پێشبینی لەکاری مرۆڤدا.

لەزۆر بابەتدا مەحاڵ ونزیك بەمەحاڵە بریتیەلەوەی کە مرۆڤ بەپێچەوانەی هەموو دیاردەکانی سروشت، ئەڵقەیەکی بەتەواوی بەستراو بەزنجیری ماددیگەریەوە نیە و لە هەمانکاتدا کە هەروەك هەر زیندەوەرێکی سروشتی شوێنی یاساو ڕێسای هۆو هۆکار دەکەوێت و خودی خۆی لەڕۆیشتنی ڕووداوەکاندا بەشداری کاردەکات و بەڵگە نەویستە کە فزولیەکانی بەزنجیرەی جەبری کارو کاردانەوەکان و ڕۆڵی _واتە وەکو هێزێکی نادیارو دەستی غەیبی و ئیرادە ئازاد_ لەجەبری سروشتی جیهان، مێژوو، کۆمەڵگەی خۆی زۆروکەم دەگێڕێت.ناسینی خودی مرۆڤ، پەیوەندییەکانی، جیلوە مەعنەوی‌و لایەنەکانی بوونی، گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی وجولەمێژوویەکانو شەپۆلە فیکری‌و فەرهەنگیەکانی، شۆڕشەکان، داهێنانەکان، نەخشەکان و هەڵبژاردنەکانی و هەموو ئەوەی کە لەوەوە سەردەر دەهێنێتو پەیوەندی لەگەڵیدا هەیە .

کە هەر یەکێکیان بابەتی یەکێك لەزانستە مرۆییەکانە_ دژوار، ئاڵۆزو پێچراوەو ناپەیدای دەکات و ئەمانەیە کەئەوەی زاناولێکۆڵەری ڕاستەقینەو گەڕان بەدوای ڕاستی و حەقیقەتی زانستە مرۆییەکاندا ئازار دەدات وشیکردنەوەی قوڵو لێکدانەوەو هۆکاری وردی گۆڕانکاریە مرۆییەکانو جوولە کۆمەڵایەتیەکانو پێشبینی مێژوویی هەمیشە ناتەواو، گومانـاوی وهەندێجار بێ بەها دەکاتو لەرەسەنێتی زانستی بنەماکانو یاساکانی زانستە مرۆییەکان بەو جۆرە کەم دەکاتەوە کە هەندێجار لەبابەتیبوونی هەندێك لەزانستەی مرۆییەکان گومان دروست دەبێت وهەندێجار لە بنەڕەتدا لەزانستی بوونیدا گومان دەکرێت.([1])

---

[1] بەوجۆرەی کە بۆ نموونە: ئێستا لەبارەی مێژوو، جیاوازی بۆ چوونەکان بەئەندازەیەکە کە هەندێجار نائومێدکەر دەبێت، چونکە هەندێك بە *"فەلسەفەی"* دەزانن وهەندێك بە*"زانست"* وهەندێك وەکو

بەڵام ئەوەی جێگەی تێڕامانی زۆرە و زۆرماناداو ڕیشەدارە ئەوەیەکە لەقۆناغی نوێدا، پێشڕەو و پێشەنگ کە بەناونیشانی ووتەبێژی تەواوو سەرەکی زانستیان بە مەزهەب داناوەو دڵنیاییان هەموو جیهان داوەکە زانست بەرەهایی لەگەڵ ئیمان ناسازگارە و لە ڕۆیشتن‌و جووڵەی تەواوکاری خۆیدا بەرەو کەشفکردنی *"بێ خودایی"* نزیك بوەتەوە و پەیامی ریشە کێشکردنی هەستی عیرفانی و وونبوونی خودا پەرستی گرتۆتە ئەستۆ و لەجێگەیدا ماددیگەری کەشوێنی سنوردار ولانەبراو نەگۆڕی ئەوە و لەگەڵیدا هاودەم‌و هاوڕایە وهاو واتایە، زۆرجار لەخودی زانایان نین، فەیلەسوف، نووسەر، ئەدیب، کۆمەڵناس، ئابوریزان و سیاسەتمەداران وخاوەنانی زانستە مرۆییەکانی نەك ئەزموونیەکان کە بەوەکالەت فزولی لەلای زانستەوە قسەدەکەن‌و بۆچوونی خۆیان دەردەبڕن وئەرکی بۆ دیاری دەکەن‌و بەڵگە نەویستە کەمەبەستی ئەوان لەزانست، تەنها زانستە ئەزموونیەکانە کە مافی ئەوەیان هەیە سەبارەت بەجیهان، سروشت، بوون، ماددە، جووڵە، ئەزەلیەت، ئەبەدیەت، بەدیهێنان، کۆنی یان تازەبوونی جیهان، مەرگ‌و ژیان، ڕۆح وجەستە، ماددەو دژەماددە و ئەودیو ماددە، غەیب، ئیرادەو هەست و ویژدان و ڕێکخستنی خود ئاگایان ناخود ئاگا لەسروشتدا و دواجار بوون یان نەبوونی خودا لەم جیهانەدا جەربڕن وەگەرنا زانستە مرۆییەکان کە ناتوانن پەیوەندییەکیان لەگەڵ ئەم بابەتانەدا هەبێت.

هەروەها زۆرجار پێشەنگانی زانستە ئەزموونیەکان لەسەردەمی نوێدا _واتە توێژەوەران، دۆزەرەوان، بوونیاتنەران، بلیمەت و کەسانی دیاری هەمان ئەو زانستانە

---

"رومن رولان" بە*"هونەر"* کەهەر کەسێك بەوجۆرەی کەدەیەوێت دروستی بکات وتەنانەت هەندێ کەس وەکو "ئەمرنف" بە*"شیعر"*ی دەزانن! وهەندێکیش بەهیچ! بەگوتەی "ناپلیۆن"، *"مێژوو کۆمەڵێك درۆیە کەلەسەریان رێککەوتوون"* ویان بەگوتەی "ئەمرسون و کارکیل"، مێژوو، شەرحی حاڵی چەند قارەمانێکە و ئیدی هیچ!

كە بەناوى "زانستى نوێ" لەلايەن ئەو كۆمەڵانەوە، بەرەهايى ماددیگەراو بەسەلماندن دژەخوداو لە بنەڕەتدا دژەمەزهەبى ناسێنراون_ خودا پەرستن و هەندێجار رۆحى سەختى مەزهەبى و زۆرجار لەم بارەوە بێدەنگ بوون واتە خۆيان پێشەنگى زانستى نوێ بوون و لە هەوالّى گەرمى ماددیگەرابوونى رەهاى زانستى خۆيان بێئاگا و لەرێڕەوى لێكۆڵینەوەى زانستى خۆيان پێكداداان لەگەڵ هەستى مەزهەبى وئیمان بەخودايان هەست پێنەكردووە و لەكەناريەوە تێپەربوون. ئەوكەسە ديارانەى كەزانستى ئەزموونى نوێ لەوپەڕى پێشكەوتن و تەواوكاريدا بەرجەستەيان دەكەن، چ كەسانێكن؟ (ديكارت، كانت، لاپلاس، نيوتن، باسكاڵ، كيپلەر، پاستۆر، ئەنيشتاين، ماكس پلانك، داروين)، كارت ئەمانە كە زۆرجار قووڵتر لەرۆحانيە مەزهەبيەكان لەگەڵ خوادا ئاشنان و بەگوتەى "ئەنيشتاين" لە بەرامبەر جوانى وگەورەيى هەستى عيرفانى حەيران بوون، ئەوە ماكس پلانكە كەدەڵێت: كيپلەر بەخەڵاتى و بەخششى ئيمانى كەبۆ هەستى ئەم جيهانە هەيبوو، بوويە دروستكەرى زانستى فيزياو چۆن زانست دژى مەزهەبە كە "ئەنيشتاين" بالاترين كەسى ديارى زانستى ئەم جيهانەمان باوەڕى وايە كە: "هەستى عيرفانى لە هەموو لێكۆڵینەوە زانستيەكانەدا هەيە و دەرك دەكرێت" و ئەمەش "داروين"ە كە لە گەڵ هەموو هاوارەى كە"ماركس" پاش بلاوكردنەوەى كتێبى بنەرەتى جۆرەكانى هەستاندو تيۆرياكەى كردە "ژێرخانى بايۆلۆژى ململانێى چينەكانى خۆى" و بەپێچەوانەى ئەو هەموو بيركردنەوانە كە لە گەرووى كڵێسادا خواپەرست مايەوە و تەنانەت پەيدابوونى رۆحى"عيرفانى" بەبەشێكى زانستى ژمارد كەجۆرى مرۆڤى لەمەيمون بەبەرزتر وبالاتر دەزانێت و بەم هەستەيەكە مرۆڤ دەست پێدەكات!

لەمێژوودا گاڵتەكانى ميللەتەكان لەمە شيرينترو پێكەنيناويتر ناتوانرێت بدۆزرێتەوە كە كۆمەڵێك قسە لەدژە مەزهەبى بوونى زانست دەكەن كەخودى ئەو

کەسانە زانانین، لە کاتێکدا ئەوانەی کەخودی دروستکەری زانستن و زانان، زۆرجار مەزهەبین.

بەڵام ئەم مەتەڵە هەرگیز ناتوانێت رێککەوت و بێ حیکمەت بێت. زانستە ئەزموونیەکان بەهەمان ئەندازە کەناسراون و باوەرپێکراو جێگیرن، دوورن لە تێکەڵ بوونی مرۆڤ و مرۆڤ ناتوانێت خۆیانی تێکەڵ بکات و بەهەمان ئەندازە کە لە گەڵ واقیعیەتی دیارو بینراودا هاورێکن، لەقاڵرێژی هزری ورەنگ ئامێزی چێژی ناوەکی و ئەنگیزەی هەستو هۆکارە بیروباوەری و کۆمەڵایەتیو تایبەتمەندی تاکەکەسی جیهانی دەرەوەن و لەبەرئەوە، لەزانستە سروشتیەکاندا _بەتایبەت لەو جێگایەی کەقسە لەسەر یاساو رێسای بەڵگە نەبیستراو هاوکێشەی جێگیرو زانستیە و تاکو ئەو جێگەیەی کە ناسینی زانستی لەقۆناغی گریمانەکانو جیاوازی بۆ چوونەکان تێپەریوە و بەوردی و بەهێزی لەسەر واقیعیەت وەستاوە و بەئەزموون و بینینو جێگیری وکردار جێگیربوون_ زانست لەزانا سەربەخۆیەو پێش داوەری تاکەکەسی رۆحی کۆمەڵایەتی و داخوازی ئەژادی، چینایەتی، مەزهەبیو فەرهەنگیو پەروەردەیی زانای خودئاگایان ناخود ئاگا ناتوانن لەزانستدا کاریگەریەکی دیاریکراویان هەبێت وە بەپێچەوانەوە لەزانستە مرۆییەکاندا لەو رووەوەی کە هێشتا زیاتر شوێنکەوتووی هزری جیهانە تاکو واقیعیەتی دەرەکی، بەمجۆرەی کە لە هەندێك لەبەشەکانی زانستە مرۆییەکاندا، زانستێك، لە قوتابخانە جیاوازەکان یان لەلای ئەم یان ئەو مامۆستا و زانا وبیرمەندە هەندێجار تاکو ترۆپکی دژیەکی و دژبوون دەتوانێت جیاواز بێت.

بۆ نموونە: زانستە مرۆییەکان _واتە کۆمەڵناسی ومێژوو_ لە قوتابخانەی فەرەنسادا، ئینگلیزو ئەمریکادا لەلای زانایان کە بەرەسەنێتی تاك رازین یان رەسەنێتی کۆمەڵگە، لایەنگرانی دەروونناسی یان کۆمەڵناسی، ئەوانەن کە باوەریان بەجەبری

مێژوویان هەڵبژاردنی مرۆیی، کۆمەڵێک کەجوگرافیا بەهۆکاری تەواو دەزانن یان ئامێری بەرهەمهێنان یان ئیرادەی قارەمانان لەفەلسەفەی ماددیگەری، ئایدیالیزم، بوونگەرایی، رەگەز پەرستی یان ئابووری و تەنانەت لەلای هەرزانایەکی مێژوو یان کۆمەڵناسی وەکو: (کروچە، پارتو، ئۆگست کۆنت، پرودون، سان سیمون، هیگڵ، شیلەر، ئەشپینگەر، مارکس، گوبین و، دۆرکهایم، هالبواکس، ئەسپنسەر، کارلیل، ئەمرسون، مان، گورویچ و موس... ) بەجۆرێک گۆڕاو تەنانەت دژیەکە کە بەراستی دەرچوونی زانست بەو رونکردنەوەیە جۆرێك لە ئاسانکاریە.

گورویچ دەیوت: "لەسەدەی نۆزدەهەمدا زانایەك ۱۹۸ یاسای زانستی بۆ کۆمەڵناسیدۆزیبوویەوە و ئەمڕۆ پاش سەدەیەك کەمتر کۆمەڵناسیەکی قوڵو بەئاگا هەیە کەتەنانەت بنەڕەتێکی زانستی سەلمێنراو جێگیر کە هەمیشەو لە هەموجێگەیەك دانی پێدابنێت، پێی رازی بێت".

لەبارودۆخێکی لەمجۆرەدا دیارە کەبیرمەندانی زانستە مرۆییەکان، بەتایبەت فەیلەسوفی مێژوو، کۆمەڵناسان، دەروونناسان، زانایانی ئابووری، مەزهەب ناسی و مرۆڤ ناسی لەو جێگەیەی کەمێژوون کۆمەڵگە، مرۆڤ و مەزهەب، بەناوی زانست، قسەدەکەن تاکو چ شوێنێك خودئاگا وناخودئاگا ووتەبێژی خۆیانن وواقیعیەتە دیارەکان لەپشت چاویلکەی رەنگینی تێڕوانینی تایبەتی خۆیان سەیردەکەن ولەرۆح و ئەنگیزەو باوەڕی خۆیان رەنگ دەکەن و بەدەستەواژەی وردی بڵاوی فەرهەنگی ئیسلامیمان لەم زانستە نائەزموونیەدا "تەفسیر بەبۆچوونی"ی خۆیان جیهانی مرۆیی راڤە دەکەن.

لەبەرئەوە بەپێچەوانەی زانستی ئەزموونی سروشتی، زانستە مرۆییەکان فراوانترین بواریان بۆ بەشداری وبوونی قسەی مرۆڤەکان لە واقیعیەتی زانستی دەکەنەوەو تاکو

نەدۆزیوەتەوە، لەسەردەمی ئێمەدا ئەمە ئامۆژگاریەکی بێ بەرهەمە کە دەبێت زانا خۆی لەرێڕەوی لێکۆڵینەوە وتوێژینەوەو ناسینی زانستی بەتەواوی فەرامۆش بکاتو بەرەهایی لەخۆی خاڵی ببێتەوەو بەچلەکێشان ونەفس کوشتنی زانستی وپارێزگاریو بێمەبەستی و ئازادی زانایانەو تەنها بەئەنگیزەی حەقیقەت پەرستیو واقیعیەت ناسی زانستی بەکاری لێکۆڵینەوەو ناسین و دۆزینەوەو دەرهێنانی بەڵگەی دروست وبڕیاری بێکەموکوڕی وهەڵسەنگاندنی بێلایەنانەو دور لەخۆشەویستی ورەق وکینەی تاکەکەسی و وابەستەبوونی چینایەتی ومیللی و مەزهەبیەوە خەریك بێت و هەم ئاگایانە، حەقیقەتی زانستی لەرێگەی بەرژەوەندی سیاسی، ئابووری، نەتەوەیی، کۆمەڵو دەستەیی وتایبەتی کە پێوەی پەیوەست دەبێت فیدانەکات و نەبەخشێتو بینا لەسەر ئەم داخوازیانەو لە ئاراستەی ئەم مەبەستانە ئاراستە وتەفسیر و شیکردنەوەو دواجار لانەدانو هەم نائاگایانە لەهەڵبژاردن یان رەتکردنەوەی قوتابخانەیەك یان ئایدیایەکی فەلسەفی وگریمانەی زانستی یان توێژینەوە، هۆکارهێنانەوە، ئەنجامگیری، دەرهێنانی بنەماکان ورێساو یاساکان، تەرحکردنی بابەتەکان، کەشفکردنی پەیوەندیەکان، دەربڕینی بۆچوون، سەلماندن یان پوچەڵکردنەوە دواجار، تێگەیشتنی راستیە زانستیەکان وناسینی واقیعیاتی دەرەکی و دیارو بەش بەشکردنو شیکردنەوەی بابەتەکان وچاککردنو رێکخستنی رێساو یاسا زانستیەکان، لەژێر کاریگەری حەزوو ئارەزووەکان، چێژەکان، عاداتو خووەکان، موقەدەسات، ئەخلاقیات وبیرو باوەرەکانی پێشووی خۆی نەبێت وپێکهاتەو کۆشکی پەروەردەیی، کۆمەڵایەتی، وابەستەبوونە سۆزداریەکان، رۆحی فەرهەنگی، کارو پیشەیی، خێزانی، بۆماوەیی و تایبەتمەندیە تاکەکەسیەکان کە هەموویان جۆرو کاراکتەرو شێوەو کەسێتی مرۆڤێك دروست دەکەنو بەسروشت جۆرو شێوازی فیکری و هزری، هەست، تێڕوانین، لایەنگیری وپشتگیری دیاریکراو دەبەخشن وتێڕوانینی زانستی

رەنگرێژنەكات و جیهانینی سنوردارنەكات ولێكۆڵینەوەی زانستی _كە گەڕانی ئازادو بێ پاشماوەی حەقیقەتە_ ئامێری گەیاندنی بۆچوون وهێنانەدی هیواو ئومێدەكانو ئاراستەكردنی حەزەكانی خۆی دروست نەكات، بەو جۆرەی زانست كە دەبێت رابەری زانابێت، بەپێچەوانەوە زانا ببێتە رێبەری زانست و لە ئەنجامدا، موجتەهید ببێتە شوێنكەوتوو وەجێگیر ببێتە سەرۆكو ئیمام و لە جیاتی ئەوەی زانست ئاوێنەیەك بێت كە روخساری واقیعیەتی تێدا بدۆزنەوەو بزانن چیە؟ و بەچ شتێكەوە وابەستەیە؟ چ شتێكی دەوێتو چۆن بیردەكاتەوەو چ شتێك پەسەند دەكات و بەكورتی چ جۆرە مرۆڤێكە و لە چ تاقمو دەستەیەكە؟

ئەمەیە كە زانستە مرۆییەكان كەهێشتا زیاتر بەجیهانی خۆیان وابەستەن تاكو بەبابەتی خۆی و بەبیرو بیركردنەوە زیاتر لەبینین وشتە دیارەكان رۆڵی هەیە وكەسانی تایبەتمەندی لەزەمینەی تایبەتی خۆیدا زیاتر داهێنەرن تاكو دۆزەرەوە وهەندێك لەبەشەكانی لەفەلسەفەو ئایدۆلۆژیاو هونەر نزیكترن تاكو لەزانستەوە كە لەسەر ناسینی وردی واقیعیەتی وتێگەیشتنی دروستی حەقیقەت وەستاوە، بەلایەنی كەمەوە لەم سەردەمەدا كەقۆناغەكانی یەكەمین گەشەی خۆی بەرێ دەكات، هەرچەندە بیانەوێتو هەوڵبدەن، ناتوانن هەروەك زانستە سروشتیەكان، لەزاڵبوونی بلیمەتیو كەسایەتی وویژدانی بیرمەندان و پسپۆڕە گەورەكانی خۆی، خۆیان رزگار بكەنو ئازاد لەحەزو ئارەزووەكان وبیرو باوەڕەكان وتایبەتمەندیەكانو بەرپرسیاریەتیان كەهێشتاش فەرمانڕەواییان بەسەردا دەكات، سوكو بێكۆتو بەندو بێ مەبەست، راستەوخۆ عاشیقی راستگۆو پارێزگاری حەقیقەتبن ویارو وەفادارو دەست پاكی واقیعیەت بن و لەئەنجامدا تەنها شوێنكەوتەی دەمارگیری ئەو بنەما و حوكمانە بن كە لەم رێگەیەدا بەدەستهێنراوەو بەم شێوازو رێگەیە لەدەقی شتە دیارەكان دەرهاتووەو پەیدابووە.

لەبەرئەوە زانستێك كەزانستە، چەپو راستو بالاو نزم، مرۆیی‌و دژە مرویی و هەروەها بورجوازی‌ونیە، تەنها لەزەمینەی زانستە ئەزموونیەكان و زانستە سروشتیەكان دەتوانێت راستگۆبێت كەزانستەكان ئەزموونین ودەتوانن بەدەمارگیری‌و بۆ حقیقەت‌و لەپانەی حوكمە جێگیرەكانی واقیعیەت، لەحكومەتی تاكە كەسی‌و موڵكایەتی تایبەتی ئەو مرۆڤانەی كەسەرووكاریان لەگەڵیاندا هەیەو بەپەیرەوی لەحەقیقەت بەرەولای خۆیان رایانكێشن وله بەرامبەر حوكمەكانیان بەرەو بەتوانایی و بەهێزبوون برۆن.

زاناكانی زانستە مرۆییەكان كە لەم بەشانەدا كەسی دیارو خاوەن قوتابخانەن دوولایەنی ورووی هاوبەشیان هەیە: یەكێكیان ئەوەی كە هەموویان رۆژئاوایین، دووەم: ئەوەی كە هەموویان لەدایكبوو و پەروەردەی سەدەی نۆزدەهەمن‌و ئەم كات وشوێنە لوتكەو ترۆپكی چەماوەی گەشە، كولانی رۆح‌و تێروانینی بورجوازیە: رۆژئاوایی بوون و پیشەسازی بوون.([1])

پاش گەشەكردنی زانستی كۆمەڵناسی، بۆچوونی زۆربەی بیرمەندان بەرەو رووی گەڕان بەدوای هۆكار لەدەقی كۆمەڵگە و مرۆڤ رۆیشت و ئەم سەرەتای سەربەخۆیی

---

[1] رۆژئاوا كە میراتگری فەلسەفە وروح وفەرهەنگی یۆنانی وروحی كۆنە، بەبەراورد لەگەڵ رۆژهەڵات كە رووخساری مەلەكوتی هەیە وعشق، عیرفان، پەرستن، پشت بەستن بە بەها، رووكردنە ناوەوە وجەوهەری بالا لەمرۆڤ ودووڵی ودڵەراوكێی بوون گەڕان بەدوای حەقیقەت وتینوویەتی تێرنەبوو وگەڕانی ماندو بوونی نەناسراو لەپێناو *"غەیبیەت، راز، رەهایی، ئەبەدیەت، تەواوی، جوانی، بالایی، مانا، پیرۆزی، رزگاری"* تایبەتمەندی دیاری رۆح وفەرهەنگیەتی _فەرهەنگ وروحی عەقڵی، فەلسەفی، پشت بەستوو بەسوود، دەركی، گەڕان بەدوای دەستەلات، داخوازی خۆشبەختی‌و لەهەشتی زەمینییەو لەووشەیەكدا *"دونیاگەرا"* كەباشترین زەمینەی فەلسەفی‌و رۆحی ومێژووی بۆ بۆرجوازی نوێی رۆژئاوا هێناوە.

کۆمەڵناسی، لەزاڵبوون ودەست بەسەردا گرتنی حوکمەکانی سروشتی ماددی ورووکەش بینین‌و سادە بیرکردنەوەی دەمارگیرانی سروشتگەراو ماددیگەرا میکانیکیەکانە.

بەباوەڕبوون بەوەی کەمێژوو و کۆمەڵگەو مرۆڤ، یاساو ڕێسای زانستی خۆیانیان هەیە، جارێکی دی لەگەڕان بەدوای هۆکاری سەرەکی ودیاریکەری جوولەی مێژوو و شێوەی کۆمەڵگەو دروستبوونی مەعنەوی مرۆڤ، هەر کەسێك لەگۆشەیەکەوە ڕۆشت:

ئامێری کار؟ ("مارکس"یەکان)، ئابووری؟ (ئابوریەکان)، نەژاد؟ (ڕەگەزپەرستەکان) پێشەواو پێشەوایی؟ (فاشیەکان)، مەشیەت؟ (کاسۆلیکەکان وروانینی گشت‌و گشت مەزهەبەکان)، فیکر، زانست، ئیمان، کارە عیشق، برسیەتی، خەبات لەگەڵ سروشت، شەڕ، بلیمەتی، غەریزەی گەڕان بەدوای تەواوکاریدا...(قوتابخانە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤگەرایی)

لەم شەڕە گەرمەی بیروباوەڕەدا کە لە نێوان قوتابخانەکاندا لەبەرچاوگیراوەو هەریەکێکیان پشت بەهۆکارێك دەبەستێت و هەموو شتێك لە مرۆڤدا لەسەر ئەوە بینادەکەن و بەلە دایکبووی ئەوەی دەزانن، ئەوەی کە هەمەگەرایی بەبێ ئاگایی بەسەریدا تێپەڕبوون گۆڕانی هۆکاری دیاریکراو بەپێی گۆڕانی قۆناغی مێژوویی‌و تەواوکاری وجۆرەکانی گۆڕان‌و گۆڕانکاری کۆمەڵگەکانە. هەموو بیرمەندانی کۆمەڵناسی و فەلسەفەی مێژوو _لەگەڵ هەموو جیاوازی و دژیەکی فیکری_ لە شێوەیەکدا ڕوانینی لێکچوون و ئەو دوو تایبەتمەندیەش "یەك ڕوانین وجێگیر ڕوانین"ە هەمووان لەپێشەوەوە دڵنیان کە هۆکاری دیاریکەر لەپێکهاتەی مێژوو، کۆمەڵگەو مرۆڤ، سەرەتا یەکێکەو پاشان هەمیشە هەر ئەو سەرەتاو یەکەمینەیە!

جێگای سەرسوڕمان نیە ئەگەر ئەم تێڕوانینە زانستیەش لەبیرمەندانی شۆڕشگێری خەڵکگەرا بدۆزینەوەو هەم لەدەمارگیرترین پارێزگارانی دوژمنی شۆڕش و تەنانەت دوژمنی هەرجووڵە و گۆڕانکارییەك.

بەڵام ناتوانرێت ئەوە بەسروشتی ولۆژیکی وعەقڵانی بزانرێت کە کەسێکی وەکو "مارکس" وهەوراپانی کە لە بنەڕەتد، لۆژیك (logiguoe) یان بەڵگەی ئەوەی کە لەسەر وێنەی عەقڵی وەستاوە وچەمك وگوتەزاکان بەجێگیر دەزانن، ئیدی لەبەرەئەوە کەدەیانخەنە کەنارەوە ودیالێکتیك بەناوی ئەوەی کەلۆژیکی گۆڕان و دژیەکی و جووڵەیە لەجێگەیدا هەڵدەبژێرن، لەگەڕان بەدوای هۆکاری زانستی گۆڕانی مێژوویی ودیارە کۆمەڵایەتیەکان ودەرکەوتەو تەجەلیاتی بوونی مرۆڤ، دوچاری هەمان "یەك ڕوانین وجێگیر ڕوانین ویەك لایەن ڕوانین" دەبن کەشێوەی فیکری تایبەتی پەروەردەکارانی لۆژیکی "وێنەیی جێگیری" ئەرستۆیی و ماددیگەری میکانیکیە و تەنانەت دەمارگیرترین دوگماتیزە متافیزیکیەکان یان فیزیۆکرات و هەروەها پێشەوا پەرستان و خوێن پەرستانی فاشیست.

ئەم سەرسوڕمانیە کاتێك بەکۆتایی دەگات کە بەبیر بهێنینەوە کە "مارکس"یەکان گەورەترین شانازییان پەیوەستکردنی دیالیکتیکی "هیگلیە" بەماددیگەریەوەو سەبارەت بە "بنەڕەتی گۆڕان" هێندە زیادەڕۆییان کرد کە گشتگیری ڕەهایان پێ بەخشیو ئەم ڕستە بەناوبانگەو ترسێنەری لینین یان بەناونیشانی بنەڕەتی بنەڕەتو بنەماکان (اصل الاصل) ڕاگەیاند کە: تەنها شتێك کە نەگۆڕو جێگیرە، گۆڕانە[1]!

---

[1] ترسێنەر، چونکە ئەم بنەڕەتی بنەڕەتانە دەتوانێت بەهێزبوون و ڕەسەنێتی هەر قوتابخانەیەك کەبانگەشە بۆ بەرپرسیاریەتی پەیماندان، بەها، ئیمان وئامانج دەکات و لەسەر ڕەسەنێتی سنوری

"یەك جۆر روانین و خەیالکردن" بەو مانایەی کە لە هۆ هێنانەوەی بابەتە ئالۆزە کۆمەڵایەتی ومرۆییەکان، هەموو هۆکارەکان بەتەنها هۆکارێك _بەناونیشانی هۆی هۆکان یان یەکەمین_ راڤە دەکرێن، روانینی جێگیرانە بەو مانایەی کە لە زنجیرەی هرکاردا، هەر ئەلقەیەکی هۆکار جێگەی نەگۆرو جێگیری هەیە و لە ئەنجامدا هۆی هۆکارەکان بۆ هەمیشە و لە هەموو کاتێکدا وەکو هۆی هۆکار بەمیرات دەمێنێتەوە.

"بەرەو یەك لاروانین" کەروانینێکی بەرەهایی سروشتگەراییە، وێنەیی و میکانیکیەو بەتەواوی دژی دیالێکتیکی، بەو مانایەیە کەپەیوەندی هۆو هۆکار یەك لایەنە ولە هۆوە بۆ هۆکار و"مارکس" بەپێچەوانەی هەموو ماددیگەراکان بەتوندی پشتی بەدیالێکتیك بەستووە و ئەمەش کەسازگار بەتێروانینی عیرفانی، مەزهەبی و ئایدیالیە ولە درێژایی مێژوو، پێوەی پەیوەست بووە و بەستراوەتەوە، بۆ یەکەمین جار بەماددیگەریەوە دەبەسترێتەوە لەو روەوە کە ماددیگەرایەو مادیگەریش لە بنەرەتدا "یەکتاییەکی بوونگەرایی ماددی" و لەسەر مادده وەستاوە بەناونیشانی هۆکاری یەکەمین وتاقانەو رەها و بەناچاری بەهۆکاری کۆتایی دیاردە مرۆییەکان وجولەمێژووییەکان وبابەتە کۆمەڵایەتیەکان دەگات و هەموو شتێکیش بەوە کۆتایی پێدەهێنێت ولەویشەوە دەست پێدەکاتو پەیوەندی دیالێکتیکی کە لەسەر بنەمای بەرامبەری و دژیەکی و کاریگەری وکاریگەربوونو کۆکردنەوەی دوو دژو دێتەدی، کاتێك

---

جیاکەرەوەی وخراپە، ناشیرینی و جوانیو نزمی وبالایی وناتەواوی وتەواوی وفەزیلەت ورەزیلەت پشت دەبەستێت جیهان بینی زانستی و ئەخلاقی مرۆیی خۆی لەسەر بنیادەکات و مرۆڤەکان بەپیرۆزی وپەرستشی بنەماکان، پێوەرو ئاماجەکان بانگێشت دەکات کە لەبەر خاتری ئەوانە تەنانەت مردن لۆژیکیە ئەوا تێکیان دەشکێنێت و بۆ رەسەنێتی هەر ئیمانێك وپەیامێك و هەر بانگەوازێك دەتوانێت روخێنەرو تێکشکێنەر بێت.

کە بە ماددە دەگات کەهۆی یەکەمین وهۆی هۆکارە رەهاو سنوردارەکانە، ئەوە ئیدی بەپەیوەندییەکی میکانیکی (یەك لایەنە) بگۆڕێت([1]).

ئەم سێ تایبەتمەندیە _ یەك روانین و تاك روانین لە هەموو قوتابخانە گەورەکان کۆمەڵناسی سەدەی نۆزدەهەمدا بوونی هەیە، بەڵام سادە بیرکردنەوە، تەفسیرو راڤەو شیکاری رووکەشی و بڕیارە جێگیرو نەگۆڕو دەرکردنی حوکمە بەشیەکان ودوو ودوو، چواردەکات کە کۆمەڵگەی وەکو پێکهاتەو بینایەکی سادەی میکانیکی دەردەبڕێ کەخاوەنی ژێرخانێکی دیاریکراو وسەرخانێکی دیاریکراو و هەرشتێك تیایدا روونو ناسراو و دروستکراو روڵی ودۆخی هەر دیاردەیەك بەهاوکێشەیەکی سادە، تەنانەت سادەتر لەهاوکێشە فیزیکیەکان بەدەست دەهێنرێت، ئەمڕۆ ئیدی لە کۆڕو کۆبوونەوە زانستیەکاندا دەبینرێت و ئەگەر هەیە، تەنها لەهەندێك لەحیزبە سیاسیەکانی وڵاتە دواکەوتووەکان ولە نێوان ئەوە نیوە رۆشنبیرانەی کە بەخوێندنی چەند پارچە و چەند ووتارێکی سەر پێی لەم جۆرە رازی دەبنو هەموو نهێنیەکانی مێژوو ومەتەڵەکانی مرۆڤ وکێشەکانی کۆمەڵناسی بەچارەسەرکراو دەزانن، بڵاوەو تێڕوانینی شێوە زانستی ئەمڕۆ تەنها بۆ پەیداکردنی خۆراکە راگەیاندنیەکان وسیاسیەکان بەکاردێت و وەگەرنا لایەنداری زانستی کۆمەڵناسی _بەدەستەواژەی "جۆرج گۆرویچ" کە هەمیشە دووبارەی دەکردەوە_ بەرەولای هەرچەندە زیاتر "خۆبەکەم زانینە" و هەرچی زیاتر خەریك بوون بەلێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی واقیعیەتەکان و هەرچی کەمتر دەرکردنی بڕیار و دروستکردنی بیروباوەڕو دەربڕینی هەست و بەزاراوەی زانستی: دەست بردن بۆ "بڕیاردان لەسەر بەهاکان (Jugement des valeurs)".

---

[1] پەیوەندی نێوان ئاگرو ئەو ئاوەی کەلەسەری دەکوڵێت، ئەو پەیوەندیە پەیوەندیەکی هۆکاری یەك لایەنە.

بەهەمان ئەو ئەندازەیە کەحوکمی یاساو ڕێساکانی زانستە سروشتیەکان بەسەر کۆمەڵگەی مرۆیی ودانانی مرۆڤ وەکو دیاردەیەکی جوگرافی و پەروەردەی هەرێمی وناوچەیی کە لە ڕوانینی دەمارگیرانەو زبری زانستی سەردەمیە کەزانستە سروشتیەکان بەچەند سەرکەوتنێك لەناکاو دەستی گەیشتبوو وغروری گەیشتن بەسەردەمی ن وێو پێنەگەیشتن ولە بەرامبەر زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا هێشتا بەسەربەخۆیی نەگەیشتبوو و داگیرکاری زانستە سروشتیەکان بوو، لەهەمانکاتدا ناتوانرێت کاریگەری سروشت و ژینگەی جوگرافیایی و مەرجی، ناوچەیی لەو کۆمەڵگەیەی کەهێشتا بەشێوەی خێڵ دەژین و ئابووری شەوانەیان هەیە وشێوەی بەرهەمهێنانیان لەسەر بنەمای ڕاو و شکارکردن یان ئاژەڵداری و کشتوکاڵی دەشتەکی، بەهەمان ئەندازەی بەهیچ حیسابکرد لە کۆمەڵگەی پێشکەوتوودا لەبەقۆناغە باڵاکانی شارستانیەتدا گەیشتبوو.

بێگومان لەقۆناغی سەرەتاییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، مرۆڤ بەتوندی مەحکومی سروشتە و لە شێوەی بەرهەمهێناندا، پەیوەندی سروشتی، دابەشکردنی کار، پەیوەندی کۆمەڵایەتی، سوننەکانی گەلان، دەروونناسی مرۆیی، جیهانبینی، بیرۆکە وبیروباوەڕ، لایەنگری و ئامانجەکانو مەزهەب و فەرهەنگ و هونەر و پیشەسازیو ئەدەبو دابونەریتی گشتو شێوەو پێکهاتەی خێزانی و کۆمەڵایەتی و سیاسیو شێوەی ژیانی ماددی مەعنەوی خۆی، هۆکاری سروشت ودۆخی جوگرافیاو مەرجی هەرێمی و ژینگەو ژیان و گوزەرانی ڕۆڵێکی دیاریکەری هەبووە و هەیە.

لەم قۆناغەدا لەمێژوو، کۆمەڵگە مرۆییەکان، بەپێی ئەوەی لەکەناری دەریادا ژیان بەسەردەبرد یان لەدڵی کوێستاندا یان لەسینەی دەشتە ووشکو فراوانەکان یان لەدڵی دارستانەکاندا، ژینگەی سارد یان گەرم، ناوچەی جەمسەری یان ناوەراستو مام ناوەند... چەند شێوەی کارو ئابووری وسیستەمە کۆمەڵایەتیەکان و چەندین جۆر

فەرهەنگو شارستانیەت ورۆحی مرۆیی دەردەبڕ کە بەپێی ژینگەی کۆمەلایەتی و هۆکاری جوگراف شایەنی تەفسیرو وردبوونەوەو شیکردنەوەیە و دەبێت بەم پێوەرانە دابەش بکرێتو بەراوردو هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت.

لەم قۆناغەدا، کۆمەڵگە بەناونیشانی هۆکاری تەواو، بەرهەمهێنان و بەناونیشانی ژێرخان یان مرۆڤ بەناونیشانی هێزی جوڵێنەری مێژوو و دروستکەری کۆمەڵگە، ناتوانێت بژمێردرێت، چونکە ژێرخانی بنەڕەتی سروشتە و ئەمانە هەموویان لەسەر بنەمای ئەو دروست دەبن وپێك دێن.

بەورادەیەی کە کۆمەڵگە لەرێڕەوی تەواوکاری خۆیدا بەرەو پێش دەڕوات وگەشە دەکات، بەتوانای داریکەری هۆکاری جوگراف کەم دەبێتەوە و فەرمانڕەوایی رەهای هێزی سروشتی لاواز دەبێت و کۆمەڵگە لەسروشت سەربەخۆ دەبێتو لەئەنجامدا بە "خود موختاری" و هەڵبژاردن لەلایەن خودی خۆیەوە نزیك دەبێتەوەو ئەمەش بەو مانایەیە کە هۆکارەکانی جوڵەو دروستکەرو نەخشەدانان لە دەروونیدا بەهێز دەبنو لێرەدایەکە شایەدی گۆڕانکارییەکی قوڵن لە رابردوو و سەرگوزەشتەی کۆمەڵگە مرۆییەکان و ئەمەیش جۆرو جۆریەتی و هەمەرەنگی زۆرە لە شێوەکانی کۆمەڵگەدا و دەرکەوتنی چەندین جۆرو ژمارەی زۆری شارستانیەتەکانو فەرهەنگەکان کە لە جۆرو جۆریەتی مەرجە هەرێمیو ناوچەییەکان زۆرترەو بێجگە لەوەش لەبارودۆخی تاکە هەرێم و ناوچەیەکدا یان لێکچوودا، چەندین جۆر کۆمەڵگە و شارستانیەت و فەرهەنگ دەبینینەوە کەلایەنی هاوبەشی و لێکچوونی زۆرکەمیان هەیەو تەنانەت دژیەکیو ناچوونیەکی و نایەکسانی زۆر بوونی هەیە.

✦ مرۆڤ

لێرەدا کە مرۆڤ، وردە وردە لەدەسەلاتی سروشت ئازاد دەبێت، بەلام بەهەر هەنگاوێك کە لەم زیندانە دێتەدەرەوە، هەنگاوێك بەرەو زیندانی کۆمەڵگە هەنگاو دەنێت.

سەیری مرۆڤێك بکەن کەخێڵەکی بوو، پاشان بوویە جوتیار و لادێ نشین و پاشان رێگەی شاری گرتەبەرو شاری گەورە و پێشکەوتوو کەچوار وەرزەی ساڵ وخۆرو مانگیش تێیدا دەرناکەوێت و بۆ سەیرکردنی ئەمانەش دەبێت دیوانی شاعیران بکاتەوە یان تابلۆی وێنەکێشان ببینێت یان لەتەنیشت تەلەفزیۆنەوە دابنیشێت و لەناو فیلمەکاندا لەگەڵ ئەم دەسەلاتدار وسوڵتانانەدا رووبەڕوو ببێتەوە!

شەڕی کۆمەڵگەو سروشت بەرەو زاڵبوونی کۆمەڵگە بەسەر سروشت بەرەو پێش دەڕوات‌و لەم پێشکەوتنەدا، شەڕی مرۆڤ و کۆمەڵگە دەخرێتە روو.

کاتێك دەڵێین سروشت، مەبەست لەو هۆکارەیە کە تێکەڵە لە هەوا، ئاو و خاك‌و خۆرو بارودۆخی سروشتی کە کۆمەڵگەی مرۆیی دروست دەکات‌و مرۆڤ دروست دەکات کاتێك دەڵێین: "کۆمەڵگە"، مەبەست لەو هۆکارە تێکەڵەیە کە لە شێوەی ئامێری کارو کارو پەیوەندی کۆمەلایەتی ودابەشکردن‌و تایبەتمەندی و جەمسەرگیری‌و میللەکان‌و قۆناغی مێژوویی‌و پەیوەندیە دەرەکیەکانوکاریگەریە دەرەکیەکان (شەڕ، پەیوەندی بازرگانی، سیاسی، فەرهەنگی، مەزهەبی، لایەنگیری، پەیمان و پەیوەندییەکان...) کە هەموو ئەم هۆکارە بەشیانە دروستکراوی کاری کۆمەڵگەو مرۆڤن‌و بەشداری کاریگەری هەرکامیان پەیوەستە بەبارودۆخ‌و مەرجی کۆمەلایەتی، کات‌و سەردەم، بارودۆخی ناوچەیی و جیهانی، قۆناغی مێژوویی و جۆری کۆمەلایەتی و بەپێی ئەمانەش گۆڕانی بەسەر دادێت و ئەگەر یەکێکیش لەوانە بەهۆکارێکی تەواویان بەهێز وەربگرین و رادەی هاوسەنگیەکەی لەهەر بارودۆخ‌و مەرجێکدا، بەشێوەیەکی رەهاو جێگیر بزانین،

دووچـاری دۆگمـایی بـووین کـە لـە واقیعیـەتی کۆمەڵایـەتی کەهەمیـشە دەگۆڕێـت و جۆراوجـۆرە دووردەکەوێتـەوە بـەوجۆرەی کـە بـۆ نموونـە: بەقۆناغـەکانی دەسـەڵاتی داگیرکاری لەجیهاندا، دەبینین کە داگیرکاریو پەیوەنـدی داگیرکـاری لـە کۆمەڵگەیـەکی داگیرکراودا ژێرخانە و هۆکاری دیاریکەرو هەموو شتێکە، تەنانەت ئامێری بەرهەمهێنان، شێوەی بەرهەمهێنان و بینای ئابووری ئەو کۆمەڵگەیە شتەکانی دەرەوەو ژێر بینانیـە، لـەم جـۆرە کۆمەڵگەیانـەدا، تەنانـەت جوڵێنـەری مێـژوویش هێـزی داگیرکارییـە کـە لـە دەرەوە بەسـەریدا دەدرێـت و رێـڕەوی مێـژوویی کۆمەڵگـەش دەگۆڕێـت وبینـای بەرهەمهێنان و قۆناغی مێژوویی خۆی دیاری دەکات.

بەهـەرحاڵ، بەشـی ئـەم هۆکارانـە هەرشـتێك بێـت، کۆمەڵگـە بەناونیـشانی دەسەڵاتێکی فەرمانڕەوا، هۆکاری بەهێزو "ژینگەیەکی زاڵ هێزێکـی دیاریکـەر" بەسـەر رووی مرۆڤدا کاردەکات و مرۆڤێکیش کـەپێش ئەمـە، دروسـتکراو پـەروەردەی ژینگـەی سروشتی بوو، ئێستا دروست بوو و دروستکراوی"ژینگەی کۆمەڵایەتی" دەبێت.

وادەردەکـەوێت کـە بەورادەیـەی کـە کۆمەڵگـە ئـاڵۆزتر دەبێـت وشارسـتانیەت پێشکەوتوو تر دەبێت، مـرۆڤ زیـاتر ئـازادی خـۆی لەدەسـتدەدات و کۆمەڵگـەی بـەهێز، مرۆڤی لاوازی هەیە و لە قۆناغی سەرەتاییەکان کـەژیان سـادەتر بـوو وشارسـتانیەتیش سەرەتایی، مرۆڤەکان بەهێزترو سەربەخۆو ئازادتر بوون، زۆرجار ئەم هەستەیان هەیـەو زۆرن ئەو شاعیرو نوو سەروو تەنانەت فەیلەسوفی گەورە کە بەحەسرەتەوە یـادی ئـەو رۆژانە دەکەنەوە ولەم زیندانـە کـە مرۆڤـی بـێکۆتو بەنـدی شارسـتانیەتو سیـستەمو جەبری ژینگەو دەووبـەری فـەرمانڕەوا راکێشاوە، هاواریـان لێ بەرزبوەتـەوە بەلایـەنی کەمەوە "لائوتز" ومامۆستا "کنفۆشیوس" لەچینی سەدەی حەوتەمو شەشـەمی پـێش زاینی تاکو "جان جاك رۆسۆ" ئەم هات وهاوارو حەسرەتە دەبینین وئێستا ئـەم حـەزە

بەراکردن لە ژیانی مۆدێرنو گەڕانەوە بۆ سروشت و _بەگوتەی شارل پگی_ بەپاکیەتی و بێتاوانی سەردەمی منداڵی، بەتایبەت لە کۆمەڵگە پێشکەوتووەکاندا ڕۆژ بەڕۆژ فراوانتر دەبێت و گەشە دەکات. بەڵام ئەمە "هەستێکی ڕاستگۆیانە هاوڕا لەگەڵ داوەریەکی درۆزنانەیە"، هەستکردن بەکۆتو بەند لەزیندانی سیستەمە پێشکەوتووە کۆمەڵایەتیەکان ڕاستە، بەڵام ئەم بڕیارە کە لە ڕاکردن لەم زیندانەو پەنابردنە بەر سروشتو گەڕانەوە بۆ سادەیی سەرەتا دەتوانێت بەئازاری و ئەوەی کە لەم قۆناغەدا مرۆڤەکان ئازادترو سەربەخۆتر بوون، داوەرییەکی ناڕاستەو درۆزنانەیە، چونکە ئەگەر خۆمان لەچنگی هەستە ڕۆمانسیو شاعیرانەکان ڕزگار بکەین و بەلۆژیکی زانستی و شیکردنەوەی مرۆڤ لەبەردەم دەرگای ڕۆیشتن بەرەو شارستانیەتو پێش لەگەشەو زنجیرەی سیستەمی کۆمەڵایەتی خۆمان خەریك بکەینو ئازادی وسەربەخۆیی هەست پێدەکات وهەستی پێکردووە، لە کاتێکدا کە لە هەمان کاتدا ئەسیری زیندانی سروشت بووەو ئەم ئەسیری وزیندانیەش تاکو ئەوجێگەیەی بەقوڵایی بوون وهەستو ئەندێشەیدا ڕۆڵ وکاریگەری هەبووە کەهەستی نەکردووەو ئەسیربوون وهەست نەکردن بەزیندانی بوون، زیندانیەکی ئاڵۆزو ترۆپکی ڕەهای زیندانی وخودی زیندان.

پەیدابوونی ئەم هەستە، هەستکردن بەخنکان، هەستکردن بەزیندانی بوون، ئازار چەشتن لە کۆت و بەندبوون، حەزی ڕاکردنو ئارەزووی ڕزگاری لە کۆتو بەندو زیندان وهەوڵدان وگەڕان بۆ دۆزینەوەی شوێنێك بۆ ڕاکردن بەرەو ئازادی، بالاترینو ئومێدبەخشترین دەستکەوتێکە کەمێژوولەڕێڕەوی تەواوکاری خۆیدا بەخەڵات بەمرۆڤی ئەمڕۆی دەبەخشێت ونیشانەی شەوقو تاسەی لەدایکبوونی مرۆڤێکی دیکەیە و بەدەستەواژەیەکی ڕاستتر، لەدایکبوونی مرۆڤی ڕاستەقینە، یان هاتنەدی تەواوی مرۆڤێك، چونکە مرۆڤ، واتە ئازادی، نیشانەی لەدایکبوونی ئازادی وهەستکردن بەزیندانیبوون، خود، هێمای ئازادیەو ئازاربردن لەزیندانی بوونو کۆتو بەندبوون،

نیشانەی لەدایکبوو ئازادیەو ئەمەش موژدەیەکە کە ئێستا خودا لە"ڕۆحی خوێ، بەبەری ئادەمدا دەکات لەسەر شێوەی ڕەحمن، دروست دەبێت"و دەیەوێت "سیفەت ورەنگی خودایی بگرێت"و ئامانجی خودا "لە دروستبوونی بوونەوەرێك کە لە سروشتدا ببێتە جێنشینی" دێتەدی.

چونکە هەموو بوونەوەرەکانی ئەم جیهانە بەزنجیری جەبری فەرمانڕەوا بەسەر دروستبوونیدا، سروشت، ڕابردوو وچارەنووس و باروودۆخ و پەیوەندییان، بەستراونەتەوەو تەنها خودایە کە لەم زنجیرە ئازادەو خودی خۆی فەرمانڕەوای جیهانیان وهێماو نیشانەی ڕەهای"خودئاگایی، ئاگایی، ئازادی، بەدیهێنان، ڕێبەری، تەواوکاری، جوان، بەها، نەمری، فەرمانڕەوایی ئیرادە بەسەر سروشت، گۆڕینی ڕێڕەوی جەبری فەرمانڕەواو زنجیرەی جەبری هۆو هۆکار، فراوانی ڕەها بوون وجەوهەری قودسیو باڵاو نامادی و مەعنەوی...".

جێگای سەرسوڕمان نیە کە ئەمە مرۆڤ نیە کە لە هەوڵی تەواوکاری خۆیدا بۆ نزیکی ئەو دەگەڕێت وسیمای ئەو وەردەگرێت؟ بەگوتەی توینبی: "مێژوو شوێنێکە کە تیایدا ئیرادەو کاری خودای تێدا دێتەدی" وئیستا مرۆڤ کە بەبەخششی"ئاگایی" و بەهێزی"کاری بەکۆمەڵ" و توانای"ئامێرسازی" و ئامادەیی"بەکارهێنان" کە هەموویان لە کۆمەڵگەدا دێنەدی _بەشەڕکردن دژی سروشت کەناوی کارە لە فەرمانڕەوایی سروشت ئازاد دەبێت وسەربەخۆیی خۆی بەدەست دەهێنێت وەلەم ڕێڕەوەدا لەو چارەنووسە هاوبەشەی کە لەگەڵ بوونەوەرە سروشتیەکاندا هەیەتی دووردەکەوێتەوەو لە سروشتەوە دەچێتە نێو مێژووەوە وئێستاش ئیدی نەمندالی"کاتی ڕۆژمێری" کە "کاتی کۆمەڵایەتیە" (Temp social)یە و نە پەروەردەی جیهان کە کۆمەڵگەیەو نەشوێنکەوتەی یاساو ڕێساو مەحکومی هۆکارە فیزیکیەکان کەدروستکراو و هۆکاری جەبری مێژوییو هۆکارو هۆ و بوونیادو دامەزراوەو پایەکانی

ژینگەی مرۆیی خۆیەتی، شەڕێکی نوێی دەست پێکردووە، جەنگێکی ڕزگاری بەخشی نوێ کە لە جەبری مێژوو وحکومەتی کۆمەڵگە ڕزگاری بکات و ئیرادەی خۆیشی بەسەر ژینگەی کۆمەڵایەتیەوە زاڵ بکاتو بەسەربەخۆیی بوون بکات و بەدەستەواژەی جوانی ئینجیل "منداڵی مرۆڤ دەربکەوێت" و ئادەم، عیسی بهێنێتەدی ولە "سروشت وپێکهاتەی بوونیدا" لە ئاخیرزەمان کە ڕزگاریە لە سروشت دوورخراوەو چارەنووسی زەمینی مرۆڤ، بەرەولای خودا بگەڕێتەوە ولە "چارەنووسی بوون"یدا لەزەویدا، ببێتە جێنشینی خودا و سیفەتە خودایییەکان وەربگرێت.

جەنگی ڕزگاری بەخشی مرۆڤ لەجەبری سروشت، بەخەڵات و بەخششی"ئاگایی سروشتی" بوو لەگەڵ "هێزی کار" و جەنگی ڕزگاری بەخشی لەجەبری مێژوو، بەبەخششی"خود ئاگایی مرۆیی و شۆڕشی کۆمەڵایەتی" لێرەدایە کە مرۆڤ بەپێچەوانەی هەمیشە کە بەجیهانی دەرەوە خەریك بوو وئەنجامەکەشی ئەوەی ئێستاکە سروشت و کۆمەڵگە باش دەناسێت و ئەمە تەنها "خودی" خۆیەتی کەبۆی"بوونەوەرێکی نەناسراوەو نەزانراوە" بۆ یەکەمین جار، چاو بەرەو ڕووی خۆی دەکاتەوە بەوردبوونەوەو سەیرکردنو تێرامان لەخۆی خەریك دەبێت و هێنانەدیو وردبوونەوە لەخودی خویدا ولەکەشفکردنی جیهان وجوگرافیای گەورەو پڕ لەنهێنیو سەرسوڕمانی خۆی بۆی دەردەکەوێت کە:

اسمان ها است درولایت جـان — کار فرمـای اسمـان جهان

در ره روح، پستو بالاها است — کوەهای عظیم و صحراها است!

واتە: "ئاسمانەکان لە ویلایەتی گیان، کارو کرداری ئاسمانی جیهانن، لەرێگەی رۆحدا، نزمو بەرزاییەکان بوونیان هەیە، کێوی گەورەو چەندین بیابان هەیە".

پەیامی "ئایین – کە دواکەوتوویی سەرمایەداری کۆن بەرەو چەق بەستوویی ولاوازکردنی بردو ماددیگەری بورجوازی ن وێ لەگەڵیداو بەرق و کینەوە لەگەڵیدا روو بەروو بویەوەو تێڕوانینی پێشکەوتنی هاوچەرخ، بەتاوانبارکردنی بەچەق بەستوویی ولاوازی، فەرامۆشی کرد– کاری خۆیان بەو مرۆڤانەی کەرۆڵی مێژوویی سەرمایەداری لێڵ و بەرجوازی نزم بەناسراوترین و بنبەستی زانست ولەخۆبێگانە بوون وسڕینەوەی مرۆڤ لەسیستەمە کۆمەڵایەتیەکاندا هەست پێکردو گەڕانەوە بەخودبوونی بوون (Existence authentique) وتین وویەتی ئازادی دوودڵی گەورەیەتی، لەدەقی مێژووییدا جۆرێک مرۆڤ دەست پێدەکات و دروست دەکات، چونکە پەیامی هەموو ئایینە گەورەکان لەسەر ئەم بنەما هاوبەشە وەستاوە:

### ١- خودئاگایی:

خودئاگایی مرۆیی کەجۆرێك ئاگایی سەروو زانستیەو بینایی بوونی کە لەوەوە، نەك فەلسەفە و تەکنەلۆژیا، بەڵکولەعیشق وئیمان و ئایدۆلۆژیاوە سەردەردەهێنێتو هەر مەزهەبێك بەناوێکەوە بانگی دەکات: بلیمەتانی یۆنان ناوی Sophia لێ دەنێن و ئامانجی فەلسەفە یان بەدەست گەیشتن بەو (sophia)یە دادەنا، لە مەزهەبی هیندیدا، بینایی (vidia)[١] لە فەرهەنگی کۆنی ئێراندا: "پشتا منن و" کەژیری قودسی وعەقڵی سپی و لە ئیسلامدا "حیکمەت"[٢] کە نەزانیاریو زانینی دیاردەکان یان وێنای شتەکان

---

[١] voir لەئەوروپاداو "بیم" لەفارسیدا ریشەیەکیان هەیەو بینایی لەناسینی حەقیقەت، لەئاگاییو دانایی (زانست) باڵاترو دڵنیایی ترە.

[٢] بەهەڵە، فەیلەسوفەکانمان لەژێر کاریگەری فەیلەسوفانی یۆناندابوون بۆیە بەهاو واتای فەلسەفە دایان ناوە! وفەرموودەی "الحکمه ضالة المؤمن" یان بەستایشی پێغەمبەر (ص) لەفەلسەفە دەردەبڕی کە حیکمەت وونبووی ئیماندارە! ولەوەش بەچێژتر فەلسەفە لەئیسلامدا ئەوەی کەلە جیاتی ئەوەی حیکمەت بەراستی مانابکەن، گومرایی (مناله)یان بەهەڵە ماناکردووە بەپێچەوانەی مانای زاراوە کەبە "گومراکەری ئیمانداران" راڤەی دەکەن.

لەهزر (زانست)کە "ئاگایی بوون"ەو زانستی"بەهاکان، نیگاو روانینی حەقیقەتناس"، زانست "رینمونی"و هەستێك کە "ڕێگا" دەکاتەوە و"لایەنگیری" دەکات و"ئامانج ناسی"زانستی"ئەوەی کەهەیە" نا بەڵکو زانستی"ئەوەی کە دەبێت ببێت"و نە ئەوەی فەرهەنگ دروست دەکاتو دستەلآت بەڵکو، ئەوەی کەئیمان بەدی دەهێنێتو جووڵە و تەواوکاری، ئاونا، بەڵکو تین ویەتی، حکومەت بەسەر سروشت نا، بەڵکو حکومەت و فەرمانڕەوایی بەسەر خودی خۆیدا، "واقیعیەت" نا، بەڵکو "حەقیقەت"، "ئەوەی کەهەیە" نا، بەڵکو "ئەوەی کە دەبێت ببێت" و دواجار "ئاگری "پرومتە"یی، نووری خودایی" و ئەو رۆحە کە لە تاریکی وچەق بەستویی شەو وزستانی جیهانی مرۆڤ، خۆرو بەهار دروست دەکات و ئەندێشە رووناك دەکاتەوە وڕۆشنگەری بەڕێزی دەبەخشێت ولەجەستەی سری وەچەو گۆڕستانی مردوی هاوچەرخو بوونی ساردو سڕولێڵی مرۆیی بەنەفخی ئیسرافیلی گیانی بەبەردا دێتەوەو هەستان وقیامەتی شۆڕشی بەرپادەکات و پاشان ئیدی تەرازووی کاری خۆیان دەبن، ئەم "خودئاگایی مرۆیی" یان حیکمەتی ڕۆشنگەرەوەو داهێنەرو حەقیقەتناسو جووڵە دروستکەری بەرپرسیاری هێنەری بەها دروستکەری ئایدیاو ئامەزرۆ بوونی بەرز وبالآی تێدا دروست دەکات عیشق وپەیماندان وئیمانو بەڵێن وخۆبەخشی دروست دەکات ولەقوڵێیی فیترەتی مرۆیی شۆڕشێکی قوڵو گۆڕانی لەبوون وشەوق وتاسەو خۆدروستکردن لەدایك دەبن ودێنە بەرهەم و لە جیاتی زانا، ڕۆشنبیر پەروەردە دەکات و لە جیاتی فەلسەفە، ئایدۆلۆژیاو لە جیاتی"پێشکەوتن"، "تەواوکاری" و لە جیاتی"سوودو" "بەها" و لە جیاتی"دەسەلآت" "حەقیقەت" و لە جیاتی"جوانکاری"، "بەڵێن" و لە جیاتی"خۆشگوزەرانی" "ئامانج" و لە جیاتی"چۆن بوون" دەبێت و لە جیاتی"موجتەهید" "تێکۆشەر"... هەمان ئەوەیەکە قورئان، پێغەمبەران بەهەڵگری دەزانێتو بۆ گەیاندنی وبەخەڵکی رابگەێنن وچ بگابەوەی کەجیهان کە ئەم هەستە

وجوودیەو لایەنگرەو حەقیقەناسە لەلای زیاتر وون و چ بگابەوەی "نەخوێنددەوار" کە لەم ڕێگەیەدا، پێشەنگی کاتو سەردەم وسەرۆکی میللەتنو ئەمڕۆ ئەمە خودئاگاییە کە مرۆڤایەتی خستۆتە جووڵەو شارستانیەتی مرۆیی لە ناخەوە خستۆتە لەرزەو ڕۆحی نوێی خستۆتە نێو مرۆڤی ئەمڕۆوە و بەسەرکەشیەکی نوێ لەم بەهەشتە بێ دەردە زەمینەدا وازی لە مرۆڤ لێهێناوە.

## ٢- ئەخلاق:

ئەنگیزەکانی مرۆڤ دووجۆرن، یان لەسەر بنەمای"ویست"ن یان "پرسیار"، یان شتێکمان بۆ خۆمان دەوێت و ئەم خواستەمان بەرەو ئەو شتە رامان دەکێشێت یاخود بۆ شتێك وئەنگیزەیەکە کە هۆکاری حورمەتو رەسەنێتیەك کەبۆی رازینو بەرێزدارتر لەبوونی خۆی دەژمێرێت، لەحاڵەتی یەکەمدا، ئێمە لە بەرامبەر "سوود"داینو لەحاڵەتی دووەمدا لە بەرامبەر "بەها"دا، هەوڵ و کۆششە سروشتیەکانی مرۆڤ، هەمیشە مرۆڤ بەرەو "سوود" دەبەن "تەماعو ترس" کەدوو رووی دراوێکن، ئەنگیزەی سەرەکی غەریزە وعقڵن. غەریزە، کۆششی سروشتی و لە بنەڕەتدا ناخود ئاگای مرۆڤە لەسوودی ئەوەی بۆ پارێزگاری خودو دابینکردنی ژیان وگەشەو بەرهەمهێنانی وەچەی سوودمەند یان لابردنی ئەوەی کەزیانی هەیە. عەقڵیش هێزێکی ڕێنمونیکەرە کە لەو ڕێگەیەدا یارمەتی دەدات و ئەوەی کەبۆ ژیان سوودی هەیە، دەیناسێت ورێگاکانیگەیشتنی پێ پیشاندەدات و _ئاگایانە_ بۆ گەران بەدوای ئەوەی بۆ ژیاسوودی هەیە یارمەتی دەدات.

لەبەرئەوەی لەحاڵەتی ئاسایدا، عەقڵو زانستیش لە مرۆڤدا هاودەست وهاوداستانی غەریزەکانن و بەرەو "پارێزگاری" و"گەڕان بەدوای سوود" دا دەیبەن.

✦ مرۆڤ

تاکو ئەم شوێنە، مرۆڤ هێشتا ئاژەڵێکە، کۆتایی ودواپلەی ئاژەڵێك کە بەرەو تەواوکاری رۆیشتووە و بەعەقڵو زانستیش پڕچەك بووە، ئەوەی کەسنوری بوونی جۆریی مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکردەوەو "جەوهەری مەعنەوی ویوونەوەرێکی رەنگ خودایی" پێی دەبەخشێت، پرسیارەو ئەویش ئەنگیزەیەکە کە جووڵە بەمرۆڤ دەبەخشێت، بەپێچەوانەی ئاراستەی سروشتی ونەك بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی ژیانی، جووڵەیەك کەهەندێ جار تەنانەت لەرێڕەوی هەوڵو کۆششە غەریزەییەکانی بەربەست دروست دەکات و ئەوەی کە سروشت بۆ پارێزگاری بوونی ودابینکردنی ژیانی مرۆڤ دیاری دەکات وغەریزەکانی بەرەو ئەولایە رایدەکێش وعەقڵی بۆئەوشتانە بانگی دەکاتو زانست و زانیارییەکەشی ئەم بانگهێشتە پەسەند دەکەن، ئەوا ئاگایانە دووردەکەوێتەوەو بەدەستی خۆی، بەئەنقەست ئەوەی کەبۆی سوودمەندە لەناوی دەباتو کە بەردەم ئەو شتەی کەزیانی بۆی هەیەو تەنانەت ترسناك ومەرگ هێنەر، قوربانی دەکات،.

کتومت هەرلێرەدایە کەجۆری دەگمەنی لەسروشتدا، بەناوی مرۆڤ دەست پێدەکات کەخاوەنی گەلێك ئەنگیزەو دەرکەوتە و تەجەللیاتی رۆحی وشەوقو تاسەو رەفتارو رەوشتی و چەندین لایەنگیریە کە لە دەماخی سروشتدا ناگونجێت و لەگەڵ هیچ یاساو رێسایەکی زانستی وعەقڵی و ژینگەناسی و دروونناسی کە لە سروشتداولەکاری سروشتدا تێکەڵن، سازگارنیە، چونکە لە بەرامبەر خۆیدا بوونەوەرێك دەدۆزێتەوە کە بەپێچەوانەی پێکهاتەی فسیۆلۆژی وپێویستیە بایۆلۆژیەکان وزیندەییەکانی خۆی کاردەکات ودەجولێتەوەو بەوزەیەکی هێمادارەوە بەناوی "عیشق" کە بە هاوکێشەی خۆراك وسوتانی سروشتییەکەی شایانی تەفسیرو راڤەو شیکردنەوە نیەو لەسەرچاوەیەکی نەناسراوەوە سەردەردەهێنێتو لەهەندێ کەسدا بەتوندیەکی باوەڕپێنەکراو بەدی دێتو بەئەنگیزەو ئامانج گەلێك کە بەداخوازیەکانی دروستبوون

وپێکهاتەی ژیانی خۆی دژو پێچەوانەیە، هەندێجار بەلەناوبردنی بە ئەنقەست خۆی لەناودەبات.

لەبەرئەوە "ئەخلاق" بەپێچەوانەی ئەوەی کە لەمزرو مێشکی رۆشنبیری ئاسایی ئێمەدا بەکاردانەوەی دێرین و بەگەڕانەوەی دەزانن _ روونکەرەوەو دەربڕی روخساری دیاری مرۆڤە، روخسارێك کە مرۆڤ لەم جیهانەدا و لە دەقی تەواوی بوونەوەران بەباڵای دەزانێت. ئەخلاق کۆمەڵێك "بەها"یەو هیچ قوتابخانەیەك نیەکە "سیستەمێکی بەها"ی تایبەتی خۆی دەرنەبڕێت، چونکە هەر قوتابخانەیەك بابەتی بنەڕەتی بریتییەلە مرۆڤ و مرۆڤ تەنها لەسیستەمێکی ئەخلاقیدا مانا دەکرێت و بوونی دیاری دەکرێت.

تەنانەت "مارکس"یزمیش _بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە ڕێنمونی دژە مەزهەبیو دژە ئایدیالیزمی کەسانی دواتر و زیاتر دەمارگیرانی دروست دەبێت و بەتایبەت لەسەنگەرگرتنی توندو زیاتر سیاسی و بەرژەوەندیخوازی""مارکس"یزمی روسی"! دەبینرێت_ لەوێدا کەقسە لە"لەخۆبێگانەبوون" وسڕینەوەی جەوهەری جۆری مرۆڤ لەسیستەمی بورجوازی و فەلسەفەی فێربوون قسەدەکات و وێنایەك لە مرۆڤی تەواو و فیتری بەناوی hommetotal دا (مرۆڤی تەواو) وبۆچوون دەردەبڕێت، ئەواپشت بەبەها ئەخلاقیو مەعنەویەکان دەبەستێت کەرێگەو شێوازی فیکری"سوشیالیستە ئەخلاقیەکانی" ئەڵمانیا باس دەکات کەهەندێك لەقوتابیانی "هیگل" و"مارکس"ن لەسەرەتادا لەوانەوە بوو وهەندێ جار لەم "مەعنەویەتگەراییە ئەخلاقیە" کاتێك کەبورجوازی بەناونیشانی سیستەمێکی دژە مرۆیی وخراپکەرو رەشکەرەوەی حەقیقەتی مرۆڤ قسەدەکات، بەجۆرێك زیادەرۆیی دەکات کەئاوازی عیرفانی وەردەگرێت وهەندێکیش بەمیراتی فەرهەنگی مەسیحیەت دەریان بڕیوە.

ئەمەیە کەمەزهەب، پاش ئاگایی، پشت وپەنای بنەڕەتی لەسەر ئەخلاق، بەناونیشانی سیستەمێك لەئەرزشەکان و بەدەستەواژەی خۆمان "فەزیلەت" کەفەلسەفەی بنەڕەتی ژیانو گەشەی تەواوکاری مرۆڤ بەتایبەتی بنەمای بنەڕەتی سیستەمی"فێرکردن و پەروەردەی" دیاری دەکات و لێردایە کەسنوری دیاریکراو، فەلسەفەی"مرۆڤسازی" لە فەرهەنگی ماددی (بورجوازی ومارکسی) و فەرهەنگی مەزهەبی لەیەکتر جیادەکاتەوە، لەوێدا فەلسەفەو پەیامی بنەڕەتی پەروەردەو فێرکردن، ئامادەکردنی هێزی مرۆییە.

بۆ نەهێشتنی کۆمەڵگە لەرووی تەکنەلۆژیا، بەرهەمهێنان، دابەشکردن، بەڕێوەبردن، خزمەتگوزاری، پەیوەندیەکان، پەیوەندی گشتی، بیرۆکراسیەت، دیپلۆماسی... بەرهەرحاڵ، کاری کۆمەڵایەتی ولێرەدا گەیشتینە بەدوو ئامانجی بنەڕەتیە، یەکێکیان گەشەی فیکری و زانستی لەرووی کەشفکردنی حەقیقەتی جیهان وناسینی جەوهەرو پەیامی بوونی مرۆڤ و مانای ژیانو ڕێڕەوی فیترەت و ڕێگەی جوڵەی مرۆڤ لەهەماهەنگی لەگەڵ بووناو ئەوی دیکەیان، گەشەی بوون و پەروەردەکردنی بەها باڵاو تەواوکاری مەعنەوی مرۆڤ.

زانستیش لەم دوو فەرهەنگەدا دوورووی پێچەوانە وەردەگرێت: لە فەرهەنگی ماددی، زانست ئامێرو ئامرازی دابینکردنی پێداویشتیە ماددیو بەدەستهێنانی دەسەڵاتو خزمەت بەپێشکەوتنی تەکنەلۆژیایەولە فەرهەنگی مەزهەبیدا زانست چرای هیدایەت ورێنمونیە ورووناککەرەوەی حەقیقەتو خزمەت بەپێشکەوتنی ئایدۆلۆژیا دەکات. فرانیس بیکۆن لەدەستەواژەیەکدا، گۆڕینی ڕێڕەو ئاراستەی زانست لە کۆتایی قۆناغی حکومەتی رۆحی بۆرجوازی و ماددیەتگەرایی ن وێ پیشان دەدات چونکە:

"زانست دەبێت هەمیشە کە بەدوای حەقیقەتەوە بوو خۆی رزگار بکات‌و تەنها داخوازی دەسەلآت بکات" ئەم گۆرانی زاسنتە کەرێرەوی جولەی شارستانیەتی ن وێ راڤەدەکات: "کۆمەلگەی شارستانی بەلآم بەمرۆڤی درندە!" رۆیشتنی پێشکەوتنی شارستانیەت بەرەو دەسەلآت‌و دەولەمەندی ورۆیشتنی مرۆڤ بەرەولاوازی رۆحی‌و هەژاری مەعنەوی. ئەمە نهێنی مەتەلی حیرەت هێنەرە کە لە بەرامبەر خۆماندا دەبینین کەبۆچی شارستانیەتی نوێ کەگەورەترین کۆمەلگەکانی مێژووی دروستکردووە، لەدروستکردن‌و پەروەردەکردن "مرۆڤە گەورەکان" وشکۆفەیی"رۆحە بالآو بەرزەکان‌و بلیمەتیە دەگمەنەکان" بێ توانایەو ئاهەنگی گشتی و بنەرەتیەکەشی لەرووی زۆری"مرۆڤە مامناوەندەکان و روخسارە بێ نوورەکان ودووبارەبووەکان ویەك جۆری فیکری و فەرهەنگی و بەهاو نیازو ئامانجەکانە". دەتوانین ئەم واقیعیەتە بەگەشتێکی سادەی گەران لەنێو نەتەوەکان‌و ولآتە جۆراوجۆەکان‌و تەنانەت دوورلەیەك و هەروەها بەروانینێکی خێرا بۆروخساری مامۆستایانی زانکۆ ورێبەرانی سیاسی ولآتە گەورەکان، بەچاو ببینین. ئەمەیە کەزۆرێك لەخاوەن بۆچوونەکان ئەوە رادەگەێنن کە لە بنەرەتدا سەردەمی پیاوانی گەورە، بلیمەتیە گەورەو رێبەران‌و پیاوانی گەورەو درەخشان تێپەر بووە.

بەشێوەیەکی گشتی، ئایدۆلۆژیا، زانست، فەرهەنگ و هونەر لە تێروانینی مەزهەبیدا بەدەرکەوتە و تەجەلای قودسی و مەعنەوی‌و سەرووی ماددی([8]) فیترەتی مرۆڤ دادەنرێن و لەخزمەتی تەواوکاری بوون‌و ناسکردنەوەی مەعنەوی‌و گەورەیی‌و

[8]- مەبەستم لەسیفەتی "سەروو ماددی" "ئەودیو سروشتی" فەلسەفی نیە، بەلکو ئەودیوە تێروانین‌و دیاردەکانە وەئەو سیفەت‌و پەیوەندیانەیەکە لەژیانی ماددی گەران بەدوای چێژو، سودو جیهانبینی تاکەکەسی و هەولێو کۆششی غەریزی‌و رۆحی نزمی بورجوازی وئابووری ومەسرەف پەرستی کەهەموویان لەئەخلاقی مەزهەبیدا بەدونیا "نزم وپەست" دەردەبرێن.

دەوڵەمەنـدی رۆحـی مرۆڤـدان لـە تێروانینـی ماددیگەرایـدا مـاددەو ئـامرازن لـەبینای کۆمەڵگــەدا بــەکاردەهێنرێت و بوونیــادی ئــابووری و پێــشکەوتنی تــەکنیکی و بەرهەمهێنان و دابینکردنی پێویستیەکانی سیستەمی کۆمەڵایەتی لەئەنجامدانی پـرۆژەی بیناکراو لەسـەر فراوانـی و بـەهێزکردن و زیـاتر بەشـداربوونی نەتـەوەییو پێشکەوتنی دەوڵـەت هاوکـاری دەکـەن. لەبەرئـەوە لـە ووشـەیەکدا، بنـەماو بنـەڕەتی پـەروەردەو فێرکردن کە سیستەمی مـرۆڤ سـازیە لـە فەرهـەنگی مەزهەبیدا لەسـەر مـرۆڤ وەسـتاوە (جەوهـەری بـوون، پێداویـستی و ئامـانجی مرۆیـی) ولـە فەرهـەنگی ماددیـدا لەسـەر کۆمەڵگەو لەبەرئـەوەی فەلسەفەی ژیـانو سیـستەمی دیـاریکراو و کـرداری بەسروشـت لەسەر پایەی فەلسەفەی هزری و فیکری بینا دەبێت، لە فەرهەنگی ماددیدا، سیستەمی کۆمەڵایـەتی بەجـەبری لەسـەر "ڕەسـەنێتی ئـابووری وپەرسـتنی مەسـرەف" بوونیـاد دەنرێـت(١) و لـە ئەنجامـدا جـۆری پێداویـستییەکان و ئاهـەنگی گەشـە وپێـشکەوتنی کۆمەڵایەتی _کە بەداخوازی زیابوونی بەرهەمهێنان وڕێساو یاسای جـەبری فراوانبـوونی ئابووری وپێداویستی تەکنەلۆژی و یاسای فەرمانڕەوا بەسەر بازاڕو بەکارهێنانو...هتـد دیـاری دەکرێـت _ لەگـەڵ نیـازو پێداویـستییە مرۆیـیو ڕێـڕەوی گەشـەی مەعنـەوی و تەواوکاری و جۆری مرۆڤ ناسازو هاو ئاهەنگ نابێت ولەواقیعدا کۆمەڵگە لەگەڵ "مرۆڤ"دا دەبنــەدژو مــرۆڤ فــەرامۆش دەکــاتو بــێ ئاگــا مــرۆڤ بــەکاردەهێنێت ولەگەشــەو بەرزبوونــەوەی جەوهــەرو گەشــەی ئامادەگیــە جۆراوجۆرەکــانی ومــەزنی وجــوانیو دەوڵەمەنــدی مەعنــەوی وناســکردنەوەی رۆح و فراوانکردنــی ئاســۆی ئەندێــشەو فراوانکردنـی لایەنـەکانی بـوونی هاوکـاری دەکـات وبێئاگـا لەمـەرجو پێداویـستی ئـەو توانایـەی کـەئارامی و ئاسـایش وچـێژو شـیرینی بـەژیانی ئاسـایی ولوتـفو چـێژو حـەز

---

١- جیاوازی مارکسیزم وسەرمایەداری لە "سیستەمی ئابووری"دایە وەگەرنا بەکردار لە"ڕەسەنێتی ئابوری"دا لەگەڵ یەکدا هاوبەشن.

بەرۆژەکانی تەمەنی دەبەخشێت. ئەم بەرنامە دارێژەرانە، تەکنۆکرات و بوروکراتی ووشك و وەستاون کەجگە لەوەی (خێرایی ئامێرو زیادکردنی بەرهەمهێنان و مەرج و دۆخی بازارو بنەماکانی پارە وسەوداگەرایی) کەپشتیان پێ بەستوون هیچ شتێکی دیکە تێناگەن وهیچ نابیستن وناناسن و مرۆڤەکانیش لەلای ئەمانە وەکو ماددەی خاون کە بۆ جێگیرکردنی لەم دەزگا گەورەو ئالۆزەدا بەشێوازی جۆراوجۆر دابتاشرێن وقاڵب و ئامرازی وەستاوی "بەرهەمهێنان".([10])

جێنشینکردنی "کۆمەڵگە" لەجێگەی مرۆڤ کە بەرهەمەکەی رووتکردنەوەو داماڵینی مرۆڤە لە هەموو بەها بوونی "وجودی"یەکان و دەرکەوتەکانی جەوهەری جۆری مرۆڤ و نەفیکردنی هەموو رەسەنێتەکانە لە مرۆڤدا وپشت بەستنی مرۆڤ وگێرانەوەی بۆ جەبری کۆمەڵایەتی گەورەترین هۆکاری "لە خۆبێگانەیی ــ Ahienation" مرۆڤە لە بەرامبەر کۆمەڵگەدا.

"فیورباخ" – کە "مارکس" لەهێرشکردنیدا بۆ سەر مەزهەب، تەنها قسەکانی ئەو دووبارە دەکاتەوە – مەزهەب بەهۆکاری لەخۆبێگانەیی مرۆڤ دەزانێت، بەو بەڵگەیەی کەخودا دەپەرستێت و خودا دەرکەوتەی دەرەکی خودی مرۆڤە، بەو مانایەی کە مرۆڤ، هەموو سیفەتەکانی، تواناو هێزەکانی کە لەبوونیدا هەن، لەدەرەوەی خۆی بەناوی خوداوە بۆیان دەگەڕێت و پاشان لە بەرامبەریدا دەست بەپەرستن دەکات و ئەوەی کەخۆی هەیەتی بەنزاو پاڕانەوە لەوی داوادەکات ولەم پەیوەندیەدا، مرۆڤ کە لە خۆی

---

[10]– هەڵبەتە لێرەدا باس لە "کۆمەڵگە پێشکەوتووە شارستانیەکان" دەبێت وەگەرنا لەکۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا ئەم شتانە هەڵەن.

خالّی بوەتەوەو هەست بەهیچی خۆی دەکاتو وونبووی هەموو ئەو شتەی کەهەیەتی وبێگانە لەگەڵ ئەو سیفەتانەی کە بە حەقیقەت دەیناسێنن.(١١)

## ٢- رزگاری

ئامانجی کۆتایی هەموو مەزهەبەکان، رزگارییە. مەزهەبی هیند سەراپا تاسەو گەرمیو هەوڵدانە بۆ رزگاری. موکشا (Maksha) ئەو ووشەیەی کەهێندی بێ ئارام کردووە وتۆقیان وسی بێ سنوری فەرهەنگی ئەم قارەی فەلسەفەو رۆحی لە درێژایی مێژووی دووروودرێژ کەباس لەتەمەنی شارستانیەتی مرۆڤی رۆژهەلآتی دەکات، هەمیشە بەجۆشو خرۆشو بێئارامی کردووە، بەمانای (رزگاری)یە.

سێ مەزهەبی گەورەی برا، یەهود، مەسیحیەت، ئیسلام کە لەسەر ئاینی (ئیبراهیم) وەستاون، بانگهێشتێکنو ئەویش بانگکردنە بۆ (سەرکەوتن)، یەکتاپەرستی کە ژێرخانی بنەڕەتی سنوری ئایینی ئیبراهیمەو دروشمی گەورەی ئیسلام، خودی ئەمە رێگەیەکە بۆ گەیشتن بە(رزگاری) (قولوا، لااله‌الاالله، تفلحوا).

لێکۆڵینەوەو بەراوردی (فەلسەفەی دروستبوون) لە هەموو مەزهەبەکاندا ئەفسانەکان و ئەفسانە کۆنەو دێرینەکانی گەلو نەتەوەکان، لەدروستبوونی تەوراتی سامییەوە تاکو مسیۆلۆژی یۆنانی، بەدیهێنانی زەردەشتی تاکو ئەفسانە رەشەکانی ئەفریقیاو سورپێستانی ئەمریکای باکور، ئەوە پیشان دەدات کە لەو فەرهەنگانەی کە تاکو ئەم ئەندازەیە دوورن و لەیەکتر بێگانەن و چەند بنەماو بنەڕەتێك هاوبەشن و دووبارەن ئەوانیش:-

١- دروستبوونی مرۆڤ بەناونیشانی دیاردەیەکی ئاراوتەیی (استثنایی).

---

١١- لەکتێبی "حەقیقەتی مەسیحیەت" لەوانەکانی مرۆڤناسی (زانکۆی ئەدەبیاتی مەشهەد) ئەم بابەتەم بەدرێژی باسکردووە.

٢- قۆناغ و سەردەمی نوور، پاکی وخۆشبەختی وحکومەت دادپەروەرو راستیو یەکسانی.

٣- دەرکەوتنی شەڕ، گەندەڵی، زۆرو سولتەی تاریکی بەدەستی مرۆڤ.

٤- پەشیمانی خودا لەدروستبوونی مرۆڤ و نەفیکردن ودەرککردنی.

٥- پەیدابوونی تۆفان، لافاو بەڵا کە دەبێتەهۆی لەناوچوونی وەچەکان وپاش (چاکسازیەکی نەژادی) کە لەسەر بنەمای (هەڵبژاردنی چاککرد مانەوەی نموونەی باشتری وەچەکان) بەئەنجام دەگەیێنرێت. قۆناغێکی نوێ لەمێووی مرۆڤ بەشارستانیەت و فەرهەنگو ئەخلاقی نوێ دەست پێدەکات.

٦- حەسرەتێکی هەمیشەیی لەقۆناغێکی زێڕین دوورو (بەهەشتێکی ونبوو لەرابردوویەکی دوورو دواجار ئومێدو ئیمان بەسەرکەوتنی نوورو راستی وپاکی وحەقو (رزگاری کۆتایی).

گوناهی یەکەمین (peche originale) لە هەموو فەلسەفەکانی دروستبووندا لەگەڵ مرۆڤدایە. دەبینین کەبابەتی (گوناه)یان (سەرکەشی) لە مرۆڤدا بابەتێکی بوون (Existentiel)ە وەئەمەش تایبەتمەندی زمانی ئەفسانەیەکە هەمیشە (سروشت بەشێوەی (سەرگوزەشتە) باس دەکات و دەبێت بەئاگابێت کە لە ئەفسانە وچیرۆکی مەزهەبیدا، رووداوەکان (فەلسەفە)ن، نەك (مێژوو) قسەلە (راستیەکان) دەکەن، نەك لە (رووداوەکان). ئەمە بنەڕەترین بنەمایەکە کە دەبێت بزانرێت و تەنها بەم تێڕوانینەیە کەدەتوانرێت بەجیهانی پڕ لەجوانی و قوڵی و حەقیقەت کەمەزهەب باسی لێوەدەکات وپێمان دەڵێت کەپێی ئاشنابین، نەزانینی زمانی مەزهەب بوەتە هۆی ئەوەی کە ئەم جیهانە _کەپڕ لەبالاترین ئەندێشەکانو پڕ لە ژیان و زیندوترین راستەقینەی (بان زانستی وعەقڵی) لەبابەتی بوونو ژیانو مرۆڤ_ بەشێوەی تاریکستانێك پڕ لەخورافاتی (دژە زانستی ودژە عەقڵی) دەربکەوێت، ئەوەی کە زۆرێك لە چینەکان دەکاتە قوربانی

وەهەم پەرستیو چەق بەستوییو هەندێك لە ڕۆشنبیران دەخاتە شكو گومانەوە و لە ئەنجامدا، هەردووكیان كە دەوڵەمەندترین گەنجینەی مەعنەوییەتی مرۆیی مەحروم دەبن، چین ودەستەیەك كەدەیتوانی ودەتوانێ ئەو گەنجینەیە ببێتەمایەی ژیانو بزاوت و جووڵەی و بۆ ڕۆشنبیریش سەرمایەی خود ئاگاییو تەواوكاری بوون. بەهەرحاڵ ئەوەی كەسەرچاوەی لەدایكبوونی عیشق، حەق پەرستیو ویندوومانەوەی (بەها مرۆییەكان)ە هەروەها یەكێك لەمەترسیدارترین هۆكارو ئەنجامی شكاندنی پێیەكانو شومیو جیاییو بێگانەیو تەنانەت جیاكارییو دووری ڕۆشنبیرو خەڵكیە كە لەڕووی فیكرییو فەرهەنگییەوە كۆمەڵگە دەكات بەدوو جەمسەرەوە و ئەمەش خراپترین سیستەمی كۆمەڵگەیەكە و هۆكاری بەش بەشكردنی كۆمەڵایەتیو لێك جیابوونەوەی میللی و نەتەوەییە.

سەركەشی كە لە هەموو چیرۆكو داستانەكانی دروستبووندا دووبارەبوەتەوە تایبەتمەندی بوونی مرۆڤە لە نێوان هەموو بوونەوەرەكانی سروشتدا پیشان دەدات. ئەم سەركەشیە لە بەرامبەر خوادا شێوە وەردەگرێتو دەبێت ئەوە بیر بهێنرێتەوە كەخودا لێرەدا هێماو ڕەمزی سروشتەو جەبری فەرمانڕەوا بەسەر هەموو دیاردەكان، لەبەرئەوە ئەو داستانەی كە هەموو فریشتەكان فەرمانبەرداری خودانو تەنها مرۆڤ لەفەرمانی سەرپێچی كرد، واتە: هەموو بوونەوەرانو هێزەكانی ئەم جیهانە مەحكومی چارەنووسی جەبری وچارەنووسی فیتری خۆیانن وشوێنكەوتەی ڕەهای یاساو ڕێسا فەرمانڕەواكان بەسەر سروشتو تەنها مرۆڤە كەئیرادەی ئازادە ودەتوانێت لەزنجیرەی جەبری هۆو هۆكار كە هەموان پێوەی بەستراونەتەوە ڕزگاری ببێت و(نزیك بوونەوە یان خواردن) "بەدەستەواژەی قورئانی پیرۆزو تەورات" (میوەی قەدەغە) لەچیرۆكی ئادەمدا بەم مانایەیە. میوەی قەدەغە یان بەچەندین تەفسیرو ڕاڤە لێكداوەتەوە وەك

له‌وانه‌كانی مێژووی ئایینه‌كان و ئیسلامناسیدا به "خودئاگایی" مانام كردووه، كه‌هه‌م باڵگه‌ی عه‌قڵیو هه‌م باڵگه‌ی نه‌قڵی زۆر پشتگیری لێده‌كه‌ن.

به‌ڵام ئێستا به‌بێ ئه‌وه‌ی ئه‌وه به‌هه‌ڵه دابنێم، سه‌باره‌ت به‌م ووشه‌یه ده‌سته‌واژه‌ی پوخته تروو وردترم هه‌یه، به‌تایبه‌ت كه له‌م ده‌ربڕینه‌دا پێویست به‌سه‌رنجدانی له‌فزی قورئان وده‌رچوون له‌مانا زاراوه‌ییه‌كه‌ی نیه‌و ئه‌مه‌ش ئیعتیباری بۆ زیادده‌كات، چونكه له‌شته عه‌قڵی ونه‌قڵی انستی و هونه‌ری و به‌پێی بۆچوونی زۆربه‌ی راڤه‌كاران له‌(ده‌ق) دوورناكه‌وێته‌وه و به‌سوود وه‌رگرتن له‌زاراوه‌كانی دیكه به‌جۆرێكی ترسناك وخلیسكێنه‌ر له‌(وه‌رگێران)ه‌وه به‌ره‌و رووی (لێكدانه‌و (تاویل) ناڕوات.

بۆچی دره‌خت یان میوه‌ی (قه‌ده‌غه) به‌گریمانه‌یه‌ك دانێینو گه‌نم، جۆ، سێو (یان دانه‌وێڵه‌و مێوه‌یه‌كی تر!) وه‌كو وه‌ڵامی بدۆزرێته‌وه و یان به‌لێكدانه‌وه‌ی فه‌لسه‌فی و عیرفانی وكه‌لامی و مه‌زهه‌بیه‌وه خه‌ریك بین.

قه‌ده‌غه، واته قه‌ده‌غه! دره‌ختی قه‌ده‌غه به‌مانای دره‌ختی (منع، قه‌ده‌غه بوون) ئه‌و شته‌ی هیچ بوونه‌وه‌رێك له‌م سروشته گه‌وره‌یه‌دا له‌بێگیانو رووه‌كو گیانداره‌وه، ناتوانێت لێی نزیك ببێته‌وه، هه‌رگیز ناتوانێت پێیه‌كانی له‌ده‌ره‌وه‌ی ئه‌و هێڵه‌وه دابنێت، سنورو چوارچێوه‌كانی دانراوی هه‌ر دیارده‌یه‌ك دیاریكراون، گۆڕان، جووڵه و بزاوتن، رووگه، سیفه‌ت، تایبه‌تمه‌ندی فیزیاییو كیمیایی، تایبه‌تمه‌ندییه بۆماوه‌ییه‌كان، كاریگه‌رییه‌كان، كاردانه‌وه‌كانو هاوڕابوون له‌گه‌ڵ ژینگه‌، شێوه‌ی ژیان، په‌یوه‌ندییه‌كان، دژیه‌كیه‌كان، هاوڕابوونه‌كان، ئه‌نگیزه‌كان، غه‌ریزه‌كان، نیازو پێویستیه‌كان، ئامانجه‌كان، ئاماده‌گییه‌كان، تواناكان، شێوه‌ی دروستبوون وگه‌شه‌و خۆراكو خۆشه‌ویستیو به‌رهه‌مهێنانی وه‌چه‌و چۆنیه‌تی په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ یه‌كترو له‌گه‌ڵ سروشتو تایبه‌تمه‌ندی ره‌گه‌زی، بۆماوه‌یی، هه‌رێمیو ناوچه‌یی، به‌ده‌ستهاتوو ودواجار هه‌موو ئه‌وه‌ی (بوون)و (ده‌بێت)ی دیاری ده‌كات، هه‌مووی دانراوه‌و دیارو شوێنكه‌وته‌ی

یاساو رێسای وردو هۆکاری هۆی جەبری و هەردیاردەیەك ئەڵقەیەکە لەزنجیری ناکۆتای هۆکارو دروستکراوی قاڵبەکانەکە پێشتر دیاریکراون‌و وابەستەیە بەپەتی جەبری‌و رەهاولەحەقیقەتدا، یاریچی رامکراوی تەقدیری سروشتی‌و مەحکومی رەهای جەبری زانستی‌و بەزمانی خۆمان، چارەنووسی لەناوچاوانیدا پێشتر نووسراوە وناتوانێت لێی رزگاربێت وزیندانیەکی گوێڕایەڵ‌و ناچارە کەسنور دەپارێزێت.

هەموو ئەو یاساو رێسایانەی کە بەسەر زینداندا فەرمانڕەوان بەوردی‌و تەواوی گوێڕاڵیان دەکات‌و هەموو ئەمرو نەهیەکان رەچاودەکات و ئەوەی کەلێی قەدەغەکراوە، رێزی دەگرێت، میوەیەك کە خواردنی بۆی قەدەغەیە، نایخوات، لەوجێگەیەی کە تابلۆی (رۆیشتن قەدەغەیە) یان داناوەو نابێت بڕوات، ناڕوات، هیچ سنورێك ناشکێنێت، ناتوانێت بیشکێنێت، هەروەك شەمەندەفەر رێگەیەکی ئاسنینە کە لە بنەڕەتدا پێکهاتەی وادەخوازێت کەتەنها لەسەر ئەو رێڕەوە دیاریکراوەدا بجولێت کەژێر پێی دەبینێت وبۆی بڕیاردراوە. ناتوانێت هەنگاوێك بەرەولای راست یان چەپ بەلاری هەڵبگرێت، ناتوانێت تەنها ساتێك رووگەی بگۆرێت، کەمترین توانایی (هەڵبژاردن‌و ئازادی) نیە، گەورەیان بچوك، نەرم یان زبر، جوان یان ناشیرین، زیرەك و بیرتیژ یان بیرکوڵ، ئازا یان ترسنۆك، لاواز یان بەهێز، گۆشت خۆر یان گیاخۆر، کەم بەها یان گرانبەها، ترسناك یان خزمەتگوزار.... بەهەرحاڵ هەموو ئەمانە سنورو چوارچێوەی دیاری کراو وقاڵبی پێشتر دروستکراون وئەندازەی بڕی وچۆنیەتی تەقدیری ئەون. هەموویان دانراوی ئەون و ئەو و فەرمانڕەوای تەقدیرە _تەقدیری ئیلاهی یان سروشتی_ و لەو شتانەی کەدانراون، گۆڕانکاری ئەنجام نادرێت.([12])

---

[12]– دەبینین کەچۆن لەدروست بوونی (ئادەم)دا، توخمی ئاگایی وسەرکەشی (شکانی قەدەغەبوون) تێکەڵ بەیەکدی بوون سەرکەشی‌و ئاگایی لازم‌و مەلزومی یەکترن وهەردووکیان دوورووی سکەیەکن کەناوی "ئیرادەی مرۆڤ"ە.

رۆژێکیان ئەم جیهانە شاهیدی حەیرەت زەدەی ڕووداوێکی سەروو ئاسایی بوو، موعجیزەیەك كە بەچاو دەبینیو باوەڕی نەدەكرد. لە نێوان بوونەوەری بێشومار كەشێوەیان، دەنگیان و ڕێگەی ڕۆشتنیان وهاتن وچوونو گەڕانەوەو مەیدانو رادەی ن ومایش وئەندازەو پێوانەیان پێشتر دیاریكرابوو ولەپێكهاتەیاندا دانرابوو و بەسروشت پێشبینی دەكراولەناكاو، جیهان بەسەر سوڕمانیەكەوە، سەیری كرد یەكێك لەمانە سەركەشی كرد! ئیدی فەرمانبەرداری ناكات گوێڕایەڵی و ئەمرو نەهی كرێكارانی غەیبیو ئەودەستەی كە لە پشتی دیارەوەولەنادیارەوە پەنهانو شاراوەیە، سەری هەموو پەتەكانی بەدەستە ناكات، لەو هێڵەی كەبۆی دیاریكرابوو، چووەدەرەوە، قەدەغەی شكاند، لەحكومەتی بەتوانا بەسەر هەموو شتەكاندا، سەرپێچی كردو سەربەخۆبوو، بەویستی دروستكراوی خۆی دەبات و دەیگۆڕێت، لەهەر سنورێكەوە كە تێدەپەڕێت، هەر سنورێك كەتێك دەشكێنێت، سیستەم و ڕێكخستن تێكدەدات، هەروەها لەكاری ئەوانی تریشدا فزولی دەكاتو سەیرتر، بوونەوەرەكانی دیكە بەرەولای خۆیو بەدوای خۆیدا رادەكێشێت، یاری بەهەموویان دەكات، ڕێگەی دیكە دەگرێتەبەر، رووگەیەكی دیكە دەگرێت، ئاراستەی دیكە دەدات، جارێكی خۆی دروست دەكاتەوە، دەست دەبات بۆ ڕێكخستن وڕیزبەندی سەرەتای وهەوڵدەدات تاكو بەخواستی دڵی خۆی بیگۆڕێت و بەكاری دەهێنێت، وێرانی دەكات، دەبێتە ڕێگری ڕێگەی ئەوانی تر، ڕێگەی تازە دادەهێنێت.

چ شتێك ڕوویداوە؟ ئەمە خودایە چیە كە لە شێوەی مرۆڤێكدا هاتۆتە سەرزەوی؟ نەخێر، یەكێك لە بوونەوەرەكان لەناكاو خۆی هاتووە، چاوەكانی كراونەتەوە، مرۆڤ، لەناكاو چاوی كردەوە، سەیری كردو وردبوویەوە، خۆی ناسی، بوویە بوونەوەرێكی خودئاگا، سەیری كردكە مرۆڤە، هەستی بەناشیرینیەكانی خۆی كرد، بۆیە ئیتر جوانی ناسی، زیندانی بوونی خۆی بۆ دەركەوت، بۆیە ئازادی خواست

ویوویه خوازیاری، خۆی به (بەندە)بینی، بۆیه بۆ خوداگەڕا، مرۆڤ بوویه (بینا)، (سەرکەشی)کرد، بوویه (مرۆڤ).

(ئاگایی) دۆزیەوەو و(ئازادیو داهێنانکاری وسالاریو ڕێبەری)و لەهەمانکاتدا لەرووی بوونیەوە، گۆڕانکاریەکی جەوهەری تێدا پەیدابوو.

گەورەیی، نەمری، بوون، بالایی، جووڵەو بزاوتی جەوهەری، بەرزبوونەوەی بوونی، ئامانج خوازی، تایبەتمەندی نامادديو سەروو ماددی، پیرۆزی، ئارامگری، گەڕان بەدوای راستیدا، جوانی، جەلال، ڕێنموونی، تەواوکاری، ناسینی حەقیقەت، غەیب، حیکمەت، دادپەروەری، دتدگەری، چاکە، لێبوردن، پارێزگاری، میهرەبانی، رەها، ناکۆتایی، عیشق، خۆبەخشی، پاککردنەوەی وجودی، ولەووشەیەکدا: (بەهاکان)!

جێگەی سەر سوڕمانە! مەگەر ئەمە چییە؟ نەخێر، خودایە کە لە ڕۆحی خۆی کردوە بەبەری ئەم مرۆڤە خاکیەدا و لەمەش (مرۆڤ)ێکی دروستکردووە ویستویەتی لەسروشتدا مرۆڤێکی ڕۆح خودایی بەدی بهێنێت وبیکاتە (جێنشینی خۆی)!

بەجۆرێك بەندەیەکی دروستکردووە کە ئامادەگی ئەوەی تێدابێت کە بەسەر خودی خۆیدا سەرکەشی بکات و ئەمەش نەك تەنها لەتوانای داهێنانکاری وداهێنانی ئەو ناتەواوی نیە، بەڵکو بالاترین هێمای توانای داهێنانکاریەتیو ڕۆخساری جوانی دروستکردنیەتی و ئەمەیە کە بەرهەمێکی دروستکردووە کە دەتوانێت جێنشینی خوا بکاتو دەتوانێت بەسەرخۆیدا خودایی بکات بەناونیشانی (احسن الخالقين) ئافەرینی ووت،. دروستکراوێك دەتوانێت بەرامبەر بەدروستکراوەکەی سەرکەشی بکات، بەگوتەی هایدگەر: "تەنها فریشتەیەکە دەتوانێت (گوناه) بکات، بۆیە ئەگەر نەیکردایە (ثواب)ی کردووە".

بابەتی (گوناه)کە توخمی جێگیرو هاوبەشی هەموو چیرۆکە ئایینیو ئەفسانەیی دروستبوونی مرۆڤە، باس لەدوو تایبەتمەندی وخەسڵەتی وجوودی دەکات لە مرۆڤدا لە(سنورێکی شۆڕشگێڕانە) تێپەڕیوەن سنورێك کەتەواوکاری بڕی و وێنەییو سروشتی لە کۆتاییدا ڕێگەی بەگۆڕانکاری خودی، گۆڕانکاری جەوهەری و تەواوکاری چۆنیەتی دەگۆڕێت و(سنور)ێکە کە بەو سنورە، جیهانێکی دیکە دەست پێدەکات وتوخمێکی (ئەودیو) و(سەروو ئێستا) دروست دەبێت. ئاگاییەك _کەپەیوەندی مێشکە لەگەڵ شتەکانو بەپێناسەی لۆژیکی کۆن، ئامادەگی وێنەی شتەکان لەمێشکدا_ دەتوانێت پلەیەکی بەرز لەجوڵەی تەواوکاری بوونی ماددی دەربڕێت، بەجۆرێك کەگەشەی ئەندامی زیندوو دەگاتە پلەیەکی باڵا کەخۆشیو سەفاو هەستکردنو وردبینیەك کە(هزرو مێشك وبیرکردنەوە) دەبەخشێت کە(بینینی دەرەوە) تێیدا ڕۆڵی دەردەکەوێت و(پەیوەندیەکانو دیاردەکان) دەرك دەکات.

بەڵام (خودئاگایی) لە بنەڕەتدا، چیەتیەکی ناماددیە. ئەگەر کەسێك گومان لەمەبکات، بێگومان، خودئاگایی لەقوڵیی بوونی خۆیدا نەدۆزریوەتەوە و هەمیشە کەسانێك ئەمەیان بە(ئاگایی) یان (زانست) بەهەڵە باسکردووەولێك داوەتەوەو ئەم دووانە بەشتێك دەزانن. زۆرجار ئەم هەڵەیە لە کە مو کوڕی ئەو زاراوەیەی کە لە فەرهەنگی عەرەبی، فارسی و ئەورووپی بەناچاری بەکاردەهێنین دەبێتەهۆی ئەوەی یان لایەنی کەمەوە زۆر کاریگەری لەسەر هەیە.([١٣])

خودئاگایی، لە بنەڕەتدا لەڕەگەزی (ئاگایی)نیە بەتەواوی بابەتێکی جیاوازیشە، لە کاتێکدا کەبۆ ڕوونکردنەوەی هەردووکیان ووشەیەك بەکاردەهێنین. (زانستی ئامادەگی) لە بەرامبەر (زانستی بەدەستهاتوو)، (خودئاگایی) لە بەرامبەر (ئاگایی)و

---

[١٣] وەك: بێ جیاوازی کەراڤەی زاراوەییەکەی (in different)ە یان ڕوانگە POINT DE VUE، چینی کۆمەلایەتی couche soc چین masse.

دواجارonscience لـه بەرامبـەرscience و ئـەم هاوبەشـی زاراوەییـە دەبێتـەهۆی ئەوەی کە بەبەراوردی (ئاگایی) کەزانستی زانیاری مرۆڤە لە بەرامبەر جیهـانی دەرەوە، (خودئاگـایی) بەزانـستی مـرۆڤ بـەخودی (خـۆی) تێبگـات و بـەوجۆرەی کـەدەزانین (ئاگـایی)و (خودئاگـایی) دووزاراوەی نـوێن کەراڤـەکاران و وەرگێرانمـان لـەرووی زاراوە دەرەکـی‌و فەرهەنگیەکــەوە دروســتیان کــردوون‌و هــەروەك زۆرێــك لــەزاراوەکان ودەستەواژکان‌و پێکهاتەی نوێ کە لە ئەدەبیات و فەلسەفە و هونەر وشیعر وسیاسەت وئابووری وتەکنەلۆژی و زانستی سروشتی‌و مرۆیی بڵاوبوونەتەوە، بەرووکەش فارسین، واتە توخمە وتراوەکانی لەزمانی فارسییەوە وەرگیراوە، بەڵام فارسی نیە.

لە بنەڕەتدا ئەوەی کەناوی (خودئاگایی) لێ دەنێین لەجۆری ئاگایی زانستی نیـە، بەڵکو جۆرێك (دۆزینەوەی بوون)یە کە تایبەتە بەمرۆڤەوە وتیایدا مرۆڤ (مانای بـوونی)و (جێگای جیهانی) خۆی دەکاتە (ویژدان).

## مرۆڤ و مێــژوو

### سەرەتا لە کۆتایدا.

مامۆستایانی بەڕێز، خانمان، برایان، دۆستانی فێرخواز:

بێگومان ئێوە ئەگەر لەهەریەشێکی خوێندندا هەبن، هەرچەندە بەشی تایبەت مەندو پسپۆڕی یان ئەو بەشەی کەتەواوتان کردووە، لەگەڵ بابەتەکانی پەیوەندی دار بەزانستە مرۆییەکان، کۆمەڵناسی، مێژوو، فەلسەفەو مرۆڤ ناسی زۆر دووربێت _بەوجۆرەی کەوایە_ بەدڵنیاییەوە کەم تازۆر لەگەڵ ئەم گوتەزاو زەمینانە ئاشنایتان هەیەو بێگومان سەرتان سوڕماوە کە لە کۆنفرانسێکدا، لەدانشتنێکدا، چۆن دەتوانرێت لەبارەی مرۆڤ و مێژووەوە قسەبکرێت؟

منیش لەگەڵتاندا هاوبیروڕام کە لە بارەی مرۆڤ و مێژوو وەپەیوەندی مرۆڤ و مێژوو، لە کۆنفرانسێكو تەنانەت لەچەند کۆنفرانسێکدا ناکرێت شتێك بوترێت. چوونکە ئاڵۆزترین و فراوانترین ئەوبابەتانەی کە لە زانستەکاندا دەخرێنە روو، ئەو بابەتانە پەیوەندیان بەمرۆڤەوە هەیە، لەو نێوانەشدا ئاڵۆزترینو فراوانترین بابەتی تایبەتی مرۆڤ، خودی خۆیەتی ومێژووەکەی، لەبەرئەوە دەبێت منو ئێوەش لەیاسا لەبارەی مرۆڤ و مێژووەوە بەپێناسەیەکی روون گەیشتبین، تاوەکو بتوانین قسە لەبارەی مرۆڤ و مێژووەوە بکەینو ئەمەش پێویستی بە زەمینەیەکی زۆر فراوان هەیەو ئەگەر پۆل بوایەو خوێندنو دەرس وتنەوە بوایە چەندین کاتژمێرم لەبەردەستدا دەبوو تاوەکو لەگەڵ فریرخوازانی دیاریکراوو جێگیر، بەناچاری دەبوو سەرەتا باسێك لەبارەی مێژوو،

مانای مێژوو، لەگەڵ ئەوەشدا قوتابخانە جۆراوجۆرەکان لەبارەی مێژوو شتێکی گشتی دەربارەی مێژوونووسە گەورەکانو گوزەرێك لەدروستبوونی زانست یان فەلسەفەی مێژوولەرابردووی دوورەوە تاکو ئێستاو هەروەها باسێك لەبارەی میتۆدی جۆراوجۆرو باسی جۆراوجۆ بەپێی قوتابخانە_بیروباوەڕە جیاوازەکان لەمێژوو، لەسەردەمی ئەرستۆ تاوەکو ئێستام دەکردو و پاشان دەگەیشتمە باسی مرۆڤ و مانای مرۆڤ، جارێکی دی لەسەردەمی ئەرستووە تاوەکو مرۆڤ گەرایی(hamanisme) "سارتەر"ولە نێوانیشیاندا گوزەرێك بەرۆژهەلآت، مانای مرۆڤ لەسەر زەمینی رۆژهەلآتو لە قوتابخانە مەزهەبیە عیرفانیو فەلسەفیە تایبەتیەکانی هیند، چینو ئێرانو مەزهەبەکانی ئیسلامو یەهوودو مەسیحیەتم دەکردوو پاشان دەگەیشتمە پەیوەندی مرۆڤ ومێژوو و ئەم کارانە هیچکامیان نەکراوونو ناتوانرێت ئەنجام بدرێتو وەبەو فرسەتی کەهەمە ناتوانم ئاماژە بەو بابەتە سەرەکیانەی کەباسم کردن، باسیان لێوە بکەم.

ناچار دەبێت بۆئەوەی کە ئەم بابەتە، واتە قسەکردن لەبارەی مرۆڤ و مێژوولە شێوەی محاڵەوە بەلایەنی کەمەوە بەشێوەی کێشەیەك پیشانی بدەمو دەری بخەم، ناچار دەبێت لە کۆتاییەوە دەست پێدەکەم.

واتە گریمانەی ئەوە بکەم کەئەو باسانەی پێشوو کراوونو دڵنیامو ئومێدەوارم کە ئەم گریمانەیەم خاڵی لەحەقیقیەت نەبێتو ئەوکەسانەی لێرە ئامادەنو تەشریفیان هێناوە تارادەیەکی پێویست ئاشنایان هەیە لەگەڵ ئەو بابەتانەی پەیوەستن بەزەمینەکانی زانستە مرۆییەکانەوە. لەبەرئەوە لەسەر بنەمای ئەم ناسیەنە قسەکانم دەخەمەروو و لەکوێی ئەوەشدا کەبۆچوونی خۆم لەبارەی مێژوو و مرۆڤەوە راڤە و شی دەکەمەوە، ئاماژە دەکەم بە قوتابخانەو بۆچوونە جۆراوجۆرەکان، بەتایبەت ئەو قوتابخانەو بۆچوونانەی کە لە دونیای ئەمرۆدا خراونەتەروو.

بابەتی کێشەدار کەهەم ئێمە هەمانەو هەم ئەوروپیەکانیش، کێشەیەکی سەرەتایی سادەیە کەگەرچی باسی زمانە، بەلام لەبەرئەوەی ئێمە تێگەیشتنمان بەهۆی ووشەیە. ناچار دەبێت سەرەتا ئەو زاراوانەی کەهۆی تێگەیشتن‌و گواستنەوەی ئایدیاو بۆچوونن روون بکرێنەوە:-

لەبابەتی مێژوودا دژیەکیەك هەیە، هەم لەووشەولەفزی مێژوولەئەدەبیاتی فارسی وعەرەبی و هەم لەم ووشەو دەربڕینەدا لەزمانی ئینگلیزی‌و فەرەنسی وئەلمانیشدا لەهەردوو فەرهەنگەکەدا، دووچەمکی جیاواز لەژێر ووشەیەکدا بەکاردەبرێت. دەزانین کە(زانست)ێك بوونی هەیەو (بابەتێکی زانست)یش هەیە، بۆ نموونە، زەوی، ئاسمان- خمەکان، کۆمەڵگە، دەروونی بابەتەکانی زانستەو زەوی ناسی، کیمیا، کۆمەڵناسی‌و دەروونناسی خودی زانست. ووشەی پزیشکیمان هەیە کەناوی زانستە، بابەتەکەی لەشی مرۆڤ ونەخۆشیەکانی جەستەی مرۆڤە. لەبەرئەوە بابەتی ئەم زانستە، زاراوەیەکی دیکەی هەیە بەناوی (نەخۆشیەکانی جەستە)، خودی جستە زاراوەیەکی دیکەیە بەناوی (پزیشکی)، بەلام لەمێژوودا، هەردوو چەمکەکە، واتە بابەتی مێژوو و خودی زانستی مێژوولەزاراوەیەکی هاویەشدا بە(مێژوو) دەردەبڕدرێن.

بابەتی زانستی مێژوو بریتییەلە: کۆی دیاردەکان و واقیعیەکان‌و پەیوەندییەکان و کردارو کاردانەوە و هەڵچوون و لەدایك بوون‌و مردنی رووداوەکان و دروستبوونی چینەکان‌و دەرکەوتن‌و هەڵهاتن ولە ناوچوونی شارستانیەتەکان‌و کۆمەڵگەکان‌و کۆی هەموو رووداوەکان ودیاردە تایبەتیەکانی مرۆڤ لەپەیوەندیدا لەگەڵ سروشت و لەپەیوەندیدا لەگەڵ ئەوانی دی لەرابردوودا لەناکۆتایی دووردا تاکو ئێستا. ئەمە بابەتی مێژووە کەئێمە لەمەش دەڵێین مێژوو. دووەم زانستی ئێمە و هەروەها ئاگاییمان یان بیروباوەڕیان بەپەیوەندی نێوان ئەم دیاردانە و لەگەڵ ئەوەشدا بیروباوەڕیان بەو رێڕەوەی کە مرۆڤایەتی لەماوەی ئەم رابردووەدا بڕیویەتی‌و ئەو یاساو رێسایانە کە

ئێمە باوە یان وایە لەسەر بنەمای ئەم یاساو ڕێسایانە مرۆڤایـەتی پێشتر لەمێـژووەوە تاکو ئێستا، ژیان، جووڵەو بزاوتـو تـەواوی هـەبووە، ئەمـە بریتییەلـە زانسـتی مێـژوو و ئەمـەش بەمێـژوو ناودەبـەین. لەبەرئـەوەی لـەناو ئـەو دەسـتەواژەو دەربڕینانـەی کـە بەکاریان دەهێنم، دەبێت ئاگاتان لەوەبێت کەهەندیجار مەبەست لەبابەتی مێـژووەو کـە لە دەرەوە دیارە هەر لەرابردووەوە تـاکو ئێستا، وەهەنـدێ جاریش بـەمانای زانسـتی ئێمەیە لەبارەی بنەماکانو ئەو یاساو ڕێسایانەی لەدوو توێی ئەم واقیعیەتـەدا لەکاتـدا بوونیان هەیە.

بـەڵام لەزمینـەی لێکۆڵینـەوە مێژووییـەکانمان شـێوازی مـردوو، دەرچـوو لـە لێکۆڵینەوەی مێژوویی، کە بریتیە لە پڕکردنی توخمی مێـژوویی، هێشتا بـوونی هەیـەو زۆرجار بەکەسێك دەڵێن مێژوونووس کەزانیارییەکانی سەبارەت بە(ئەوەی کـەرابردووە) فراوانـەو بـەم کەسـە (شـارەزایە وخـاوەن زانیاریـە) دەڵـێن (مێـژوونووس) واتـە، هـەر ئەوکەسەی کەتەنها (بابەتی مێژوو)ی هەیە نەك (زانستی مێژوو) ئەمەش وەکو ئەوەوایە کەسێك هەموو نەخۆشیەکانی تێدابێت و دایکی نەخۆشیەکان بێتو پێی بڵێن: پزیشك!

## مێژوو، زانستی"دەبێت"ی مرۆڤ

بەڵام ئەمڕۆ هیچ کەسێك بەکەسێکی لەمجۆرە ناڵێت مێـژوونووس بەدەسـتەواژەی فێرخوازان بە(باسکردنی پشتی سەری مردووەکان) ناتوانرێت بوترێ مێژوو، هەڵکەنـدنی گـۆڕو گواسـتنەوەی ڕووداوەکـان وراڤـە وباسـکردنی حـاڵو گـوزەرانی کەڵلـە گەنیوەکۆنەکان، مێژوونیە. نەك ئەوەی کارێکی لـەم جۆرە بـێ بەهایـە، نـەخێر، کـاری کەسێکی لەم جۆرە ئەگەر وردبێت لـەڕیزی کـاری لێکۆڵـەرو توێـژەرە، کەسـێك کـە لـە ئامـاردا کاردەکـات ودەروات لەشـارەکان ولادێیـەکان سـەرژمێری دەکـات و ئـەو سـەر ژمێریە دەهێنێتەوە و پاشان ئەم (زانیارییانە) دەخاتە بەردەم کۆمەڵناسـەوە و پاشـان

ئەوە کۆمەڵناسە کە لەسەر بنەمای ئەم داتایانە و ئەم سەرژمێرییەکە بەرووکەش هیچ پەیوەندیەکی هۆکارییان پێکەوەنیە وچینێك لە (کەلوپەلی پێکهاتەیی) بێ‌رۆح وبێ شێوەو وبێ مانان، بینایەك بەناوی کۆمەڵناس دادەمەزرێنێت و یاسایەك بەناوی یاسای کۆمەڵناسی لەونێوانەدا کەشف دەکات، ئەوەی کەئەو دەری دەهێنێت وکەشفی دەکات زانستی کۆمەڵناسیە. نەك ئەوەی کە لەو سەرەتاوە لەزەمینە جیاوازەکان کۆکراوەتەوە، ئەمانە ماددەو کەلوپەلن، هەربەو جۆرەی کەبینایەکدا کەسێك هەیە کەشێوازی ئەم بینایەی تەرحکردووە وبوونی دەرەکی پێ بەخشیووە، بەو جۆرەی کەدەبینین کەسێکی دیکە هەیە کەخشت وچیمەنتۆو گەچ وخاك لەدەورو بەرەوە هێناوەو کردوویەتیە بناغەوە.

بەرهەرحاڵ (دراوی زانستەکان) جگە لەزانایانی زانستەکانن، جیاوازی هەیە لە نێوان (کەسی شارەزا)و (بیرمەند) مێژوونووس بەرێگەو شێوازی هاوسەنگو مامناوەند کەسێك بووکە ئەم ئامرازو پێداویستیانەی لەرابردوو پردەکرد، بەڵام مێژوو بەمانای ئەمڕۆ لێرەبەدواوە، واتە پاش پڕکردنی هەموو ماددەو توخمە مێژووییەکان دەست پێدەکات، واتە کاتێك کە ئەم (شتی بینراوی روونەداو) لەسەر پەردەی بیرکردنەوەی زانستی رۆڵی گشتی دەبینێت، مێشکی زانایەك، فەیلەسوف و کۆمەڵناسێك، لەرێگەی پشکنینو لێکۆڵینەوەی زانستیو دیارولۆژیکیو لەسەر بنەمای ئەم توخمانە کەکۆی هەواڵو زانیارییەکان کۆیان کردوەتەوە، بینایەك بەناوی زانستی مێژوو([14]) دروست دەکات. بەم دیدوروانینەوە، مێژوو مانای ترو بەهاو گرنگی دیکە پەیدادەکات،

---

[14]– زانست دوو ناوچەی لۆژیکی هەیە: قۆناغی هەستی وقۆناغی هزری. لەقۆناغی یەکەمدا زانیاری هەیەو ئامرازی کاری (هەست)ەو (مێشك) وکاری کۆکردنەوەیە. قۆناغی، قۆناغێکە کەزانست دروست دەبێتو زانا لەم قۆناغەدا وئامرازی کاری (لۆژیك)ە و(عەقڵ)و کاری شیکردنەوەو بەرهەمهێنانە. بەداخەوە مێژوو، دوو فەرهەنگی ئێمە، مێشتا لەقۆناغی یەکەم هەنگاوێك زیاتری نەهاویشتووەو ئەمەش نەك (ناتەواویەکی زانستی) بەڵکو (کارەساتێکی کۆمەڵایەتی)و هەژارییەکی ترسناکی مرۆیی!

بەشێوەیەك كە لە "ئەمرسون" دەپرسن (مێژوو چیە)؟ دەڵێت (چ شتێك مێـژوو نیـە)؟ واتە بەو مانا كۆنـەی مێـژوو، ناپلیۆن دەیتـوانی بڵێـت "مێـژوو بریتییەلـەو درۆ وشـتە دروستكراوانەی كە هەمووان باوەڕیان پێیانە" بـەڵام بـەمانای ئـەمڕۆ قسەی ئەمرسـون راستە كەچ شتێك لە ژیـانی مرۆڤـدا بـوونی نیـەو پەیوەنـدنی بەئێـستای مرۆڤـەوە نیـە. بێهودەنیە كـە لـە فەلسەفەكانی وەكـو فەلـسەفەی "هیگڵ" و فەلـسەفەی "سـارتەر" مێژوو دەبێتە جێنشینی خودا. گەرچی قەسەیەكی لەمجۆرە لەبۆچوونی ئێمەدا شـتێكی بێ بنەمایە، بەڵام گرنگی مێژوولەجیهانی ئەمڕۆدا بەتەواوی ئەوەپیـشان دەدات، مێـژوو دەبێتـە جێنـشینی خـودا و ئەگـەر دەربڕینەكەشـی خواپەرسـتانە نـەبێت، ماناكـەی بەبۆچـوونی مـن خـودایی و تەنانـەت ئیـسلامیە. مەبەسـت لەوەیەكـە خـودای گـەورە شتەكان وبوونەوەرەكان لەبووندا دروست دەكات، لەبارەی مرۆڤ، ئەم پەیامە خوداییە و بەدیهێنەرییە دەداتە دەست مرۆڤ ودەیخاتە ئەستۆی و مرۆڤیش ئەم پەیامـەی كـەخودا پـێی بەخـشیوە بـەهۆی هۆكارێكـەوە بـەناوی مێـژوو ئـەنجامی دەدات. لەبەرئـەوە مێژوولەڕستەیەكدا بەگوتەی پرۆفیسۆر "شاندل": (زانستی كردنـی مـرۆڤ)ە. لەمێـژوو و بەهۆی مێژووە كە دەبێتە مرۆڤ. واتە مرۆڤ شێوەی مرۆیی، وەبوونی خۆی و مرۆڤبوونی لەمێژوودا دروست دەكات.

## كەسێتی مێژوویی مرۆڤ:

ئێمـە دەبیـنین كـە مـرۆڤ و ئەوكەسـێتیەی كەئێـستا بـەناوی مـرۆڤ و ئـەو كۆمەڵـە تایبەتمەندیـەی كـە لـە ژێرنـاوی مرۆڤبووندا تێدەگەین، لەئەزەلـەوە بـوونی نـەبووە. مرۆڤـی نیادەرتتـاڵ ئـەم تایبەتمەنـدیو ئـەم كارەكتـەرە مرۆییانـەی نـەبووە كەتایبـەت بەمرۆڤ یان دەزانین ودەبینین و هەموو ئەم تایبەتمەندییانە لەناكاو لە ئـەورووپا، لـەڕۆم، لەرۆژهـەڵات یـان رۆژئـاوا دروسـت نـەبوون، لەجێگەیـەكی وەرنەگرتووەولـە ئاسمانـەوە نەهاتوونەتە خوارەوە. ئەم مرۆڤە نیاندەرتاڵە، مەیمونی شـێوە مـرۆڤ، گەرچـی لـەرووی

فسیۆلۆژیەوە، ئەندام وپێکهاتەی دەرەکی ودیاری ئاژەڵی مرۆڤ بوونە، بەڵام لەرووی تایبەتمەندی مرۆییی لەگەڵ مرۆڤی مێژوویی و مۆدێرندا بێگانە بوون وەلە درێژایی مێژوودا بەشێوەی ئێستا دروستبوون. مێژوو (مەیمونی شێوە مرۆڤ)ی کردووە بە(مرۆڤی شێوە مەیموون).

لێرەدا باسێکی ن وێ دەخرێتەروو ئەویش ئەوەیە کەمن و هەموو ئێوە کەلێرەدا دانیشتوین، واتە من (Lemoi) بەناونیشانی تاکێکی مرۆیی کەلێرەدا قسەدەکەم وەئێوە بەناونیشانی هەر (من) یان (تاك)ێکی مرۆیی کە لەوێ دانیشتوون، لەسەر رووی زەویدان، کێشتان هەیە، پێویستیان هەیەو هەستەکانتان هەیە، بیردەکەنەوە (مرۆڤی گشتی نا، مرۆڤی هزری نا، مرۆڤ لەدرێژی مێژوو نا، هەر منی ئێرە، تۆکە هەیت، ئەوەی کەلێرەدایت) لەماوەی سی، چل، پەنجا ساڵ کەدەژین دروست نەبووین، سی، چل، پەنجا ساڵ پێشتر لە(عدم)ەوە نەهاتووینەتە دونیاوە، گەرچی کاتێك کەمنداڵ بووین وتازە لەدایك بوو بووین، هیچ یەك لەم هەستانە، سۆز، تایبەتمەندی، بیرکردنەوەو لایەنگری هزری، دەمارگیرییەکان، حەزو ئارەزوو سەلیقەکانمان نەبووە، بوونەوەرێك بووین بەبێ بوونی هیچ جۆرو ڕەنگێکی تایبەتی و دەمانتوانی لەهەر ژینگەیەکدا کە تیایدا ژیانمان بەسەر دەبرد، بەجۆرێکی دیکە دەربکەوین، بەڵام لەبەرئەوەی لەم ژینگەیەدا لەدایك بووین و ژیانمان بەسەر برد، بەم جۆرەی کەئێستا بوونمان هەیە، دروست بووین، بەڵام بەپێچەوانەی ئەوەی لە قۆناغی یەکەم بەهزرو مێشکدا دێت منو تۆ درێژایی ماوەی تەمەنمان دروست نەبووین، بەلەدایکبوونمان دەستمان پێنەکردووە، بەڵکو هەرتاکێك بریتییە لە کتێبی مێژووی کۆمەڵگەکەی، هەرتاکێکی دیار واقیعی کەلێرەدایە، لەدایکبوو و هۆکاری سی ساڵ، پەنجاساڵی تەمەنی نیە، بەڵکو هۆکارو دروست بووی سێ هەزار، چوار هەزار، پێنج هەزار، شەش هەزار ساڵو زیاتری مێژوویەتی. چونکە من ئێستا کەلێرە دانیشتووم، وەستاوم قسەدەکەم (هەربەو

جۆرەی ئێوە لەوێ هەستتان هەیە، تێدەگەن، بیردەکەنەوە و بڕیاردەدەن) وەبەو هەموو تایبەتمەندییەی کەهەمە، دروست ئەوە دەبینم کە هۆکاری هاتنی "سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص" بۆ ئێران (ڕووداوێکی مێژووییەکە "١٤٠٠"ساڵ پێش ئێستا هەبووە) هۆکاری هێرشی مەغۆل بۆ ئێران لەحەوت سەدەو نیو پێش ئێستا هۆکاری شەڕی خاچ پەرستەکان، هۆکاری دەرکەوتنی ئیسلام لەمەککەدا هۆکاری دەرکەوتنی زەردەشت لە(٢٦٠٠) ساڵی پێش ئێستا، دەرکەوتنی کۆرش و دروستبوونی نەتەوەی ئێران لە (٢٥٠٠) ساڵ پێش ئێستا، دەرکەوتنی (بوزا و مهاویراو لائوتز و و سوکراتو...هتد)

ڕاکردنی زاناکانی ڕۆم بۆئێرانی ساسانی، دروستبوونی سیستەمی "خواجە نظام الملك" و تەنانەت زەوق و هونەری (فیردەوسی وحافظ وسەعدی و مەولەوی) و هەروەها هەموو هۆکارەکانی دیکە کە (لەرابردووی مندا ڕوویانداوە) ڕاستەوخۆ لەپێکهاتەی ئێستای مندا دەستیان هەیە، هۆکاری دروستبوونی چۆنیەتی منن و من لەورەنگانەی کە لەسەر ڕۆح و خود سیفەت و ئەخلاق ورەفتارو بیرکردنەوە وسەلیقەی خۆمەوە دەبینم، هەست بەجێگە پەنجەی ئەم هۆکارە مەعنەوی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و مێژوویی دەکەم، بێگومان ئەگەر من لە کۆمەڵگەیەکدا ژیانم بەسەر بردایە کە لە رابردوومدا زەردەشت دەرنەکەوتایە، یان ئەسکەندەر هێرشی نەکردایە وەیان پێغەمبەری ئیسلام نەهاتایە، ئەوا خاوەنی ئەو دۆخە فیکری ورۆحیەو هەستەی کەئێستا هەمە، نەبووم، جیاوازیم هەبوو، مرۆڤێکی دیکەبووم و بووبوومە (من)ێکی دیکە.

## مرۆڤ: لەپێشتربوونی بوون بەسەرماهیەتدا

لەبەرئەوە بەگوتەی "سارتەر" کە هەروەك "هیگل" گەورەترین قسەو بەناوبانگترین قسەی لەفەلسەفەی مێژوودا هەیە "مێژوو هۆکاریکە کە لە مرۆڤدا، کەیەکەرێك بووە، بەڵام یەکەری هیچ کەس، بێ ڕەگەز، بێ حاڵەت و چیەتی و

چۆنیەتی _تەنهاو تەنها پەیکەرێك بووە کە(بووە)، کە(هەیە)_ ڕۆحی بەبەرداکراوە، ماناو واتای مرۆڤی داوە" لەوەڵامی ئەوەی کە(ئایا ئەو نیە؟) دەتوانین بڵێین (بۆچی هەیە) لەوەڵامی ئەوەی (ئەو چۆنە)؟ ناتوانین هیچ بڵێین[15] مرۆڤ بوون بووە کە هیچ جۆرێك نەبووە، مانای بوونگەرایی Exestanesyalisn لەپێشتر بوونی بوون Existence بەسەر ماهیەتدا (Essence)هەرئەوەیە. مرۆڤ سەرەتاو یەکەمجار بوونی بەهۆی خوداوە _بەگوتەی یاسپەرسی ئەڵمانی وکیرکەگاردی دانیمارکی- بوونگەرایی مەزهەبی _یان بەهۆی سروشت_ بەگوتەی خودی "سارتەر"و کونتی ونموونەی ئەمانە= بوونگەرایی ماددی دروست بووە، پاشان چۆنیەتی مرۆڤبوونی وچۆنیەتیەکەی لە درێژایی مێژوو بەهۆی کاری خۆیەوە (Praxia) دروست بووەو ماهیەتی پەیداکردووە. ئەگەر ئەم بابەتە بەتەواوی ڕوون ببێتەوە هەموو باسەکە ڕوون دەبێتەوە. دەڵێت هەموو شتەکانی سروشت سەرەتاو یەکەمجار ماهیەتیان دروست دەبێت وراستیشە، پاشان بوونیان: من دارتاشێکم، سەرەتا ماهیەتی مێزێك لەمێشکمدا دروست دەکەم، مێزێك بەچەند ئەندازەیەك([16]) و بەم سیفەتانە. ئەمە ماهیەتە، چۆنیەتیەکەی سەرەتا لەمێشکماندا دروستی دەکەین و دروست دەبێت پاشان من بوون دەدەمە ئەم ماهیەتە، واتە دەست دەکەم بەهێنانی چەکوش و ئامێری دارتاشی و تەختەو مێزێك دروست دەکەم، واتە بوون دەبەخشم، ئەمەش بەکام مێز؟

مێزێك کەپێشتر ماهیەتەکەی لەمێشکمدا بوونی هەبوو، کەواتە سەرەتا ماهیەتی مێزەکە هاتەدی و پاشان بوونی. خودای گەورە هەموو شتەکانی کەدروستکرد، سەرەتا وێنەی هزری وچۆنیەتی ئەو شتانەی لەلابوو، لەمەبەستیدا هەبوون، پاشان ماهیەتی

---

[15]– لەفارسیدا(هست)، (بوون)ە و(است)، (ماهیەت)ە ڕوون دەکاتەوە، برای هەیە، براکەی شاعیرە؟.

[16]– بەکێشەو جۆرو ڕەنگو سیفەتی تایبەتیو ئەندازەی جیاواز... ئەمانە هەموویان ماهیەتی مێزێك دەهێنن، پێش ئەوەی هێشتا مێز دروستکرابێت واتە، هاتبێتەبوون.

بەو بوونانە بەخشی، بۆ نموونە. بۆیە هەموو شتەکان سەرەتا ماهیەتیان دێتەبوون، پاشان بوونیان لەسەر بنەمای ماهیەتی پێشوویان دروست دەبێت _واتە ماهیەتیان دێتەدی و بوون پەیدادەکات وجگە لە مرۆڤ، کەخودای گەورە سەرەتا بوونی بەمرۆڤ بەخشی، چ جۆرە بوونێك؟ هیچ جۆرێك، تەنها بوون: یەك، پەنجا، شەست، حەفتا کێن وی بوونی دروستکرد. بەچ رەنگێك؟ چۆن؟ بەچ حاڵو چ دۆخێك؟ خراپ؟ چاك؟ ناشیرین؟ جوان؟ هیچ کامیان پاشان خودی ئەم بوونە.

ئەم بوونەوەرە بێ هەموو شتێکە، خودی خۆی بەهەڵبژاردنی خۆی، دەستی پێکرد بەدروستکردنی چۆنیەتی خۆی. هەڵبژاردنی ئەنجامداو تەرحی کرد ودەستی بەکارکردو لەم هاتنو رۆیشتنەدا سیفەتی وەرگرتو ماهیەتی وەرگرتو بوویە مرۆڤ، جۆریان رەگەزی مرۆڤ دوێنێ و ئەمڕۆ لەسەر رووی زەوی کە بە بەشداری خۆی و خودا هاتەبوون، خودای گەورە سەرمایەی بنەڕەتی بەخشی، هەویری سەرەتای بەخشی، خودی خۆی ئەم هەویرەی بەشێوەی ئێستا دەرهێنا، ماهیەتی پێبەخشی، هەموو ئەم سیفەتانە کەکۆی هەموویان چۆنیەتی مرۆڤی ئەمڕۆ پێك دەهێنن، بەهۆی مێژووەوە هاتوونەتەدی. بۆیە لەبوونگەراییدا، مێژوو بریتییەلە هەمان ئەو رووداوەی کەکاری بەدیهێنانی بوونی مرۆڤ بەهۆی خوداوە (یان سروشت) درێژەی کێشاوە و ئەم دوو ئیرادەیە یەکێکیان خودا یان سروشت کە بوونی دروستکردووە([17]) و ئەوی دیکەیان مێژوو، کەماهیەتی ئێستایی بەمرۆڤی بەخشیوە، ئەم دووشتە مرۆڤیان پێکهێناوە([2])

---

[17] روونکردنەوەیەك بدەم: ئەوەی کەدەڵێم خودا یان سروشت، لەبەرئەوەیەکە بوونگەراکان بەپێچەوانەوەی ئەوەی کەپێمان دەگەیێنن بەدڵنیاییەوە، بێخودانین، بەڵکو بونیاتنەرانی بوونگەرایی (کیرکەگارد) کەبونیادنەری یەکەمەو یاسپەرس کە هاوچەرخیەتی، هەردووکیان نەك تەنها خوداپەرستن، بەڵکو لەدیارترین کەسایەتیە مەزهەبیە دیارەکانی سەدەی نۆیۆو سەدەی نۆزدەهەمن، کیرکەگارد و یاسپەرس هەردووکیان لەگەورەترین فەیلەسوفە مەزهەبیەکانی ئەوروپان، یەکێکیانە لەسەدەی نۆزدەو ئەویتریان لەسەدەی بیستەم. پاشان قوتابخانەکەیان کە سارتەرو کنتو تاکو

## تەنها مرۆڤ خود ئاگا و جیهان ئاگایە:

"هیگڵ" باسێکی دیکەی لێکچووی سەبارەت بەم بابەتە لەبارەی مێژووەوە هەیە، گەرچی ئایدیالیزمی "هیگڵ" هیچ لێکچوون ونزیکیەتی لەگەڵ بوونگەراییدا نیە. "هیگڵ" باوەڕی وایە کە لەسەرەتادا، لەئەزەلدا، ڕۆحی ڕەها، ئایدیای ڕەهابوو، واتە خودای گەورە (دەتوانین ناوی خوای لێبنێنن بەلاّم خودایەك بەهەموو مەزنیەکی خوداییەوە، بەلاّم ناخود ئاگا).

ئەم ڕۆحە ڕەهایە لەسەر بنەمای سێپایە دیالێکتیك تەجەللای بوونی پەیداکردوە سروشتی ماددی بەدی هات و دروستبوو، ڕۆحی ڕەها لەسروشتدا دەرکەوت، سروشت بەشێوەی گیا تەواوکاری پەیداکردو گیا تەواوکاری پەیداکرد لە شێوەی ئاژەڵداو ئاژەڵ تەواوکاری پەیداکرد لە شێوەی مرۆڤ و لەبەرئەوە ئەو ڕۆحە ڕەهاو ئەزەلیە، ئەو ئایدیا

---

نیوەی ڕێگا ئەلبێرکامۆ کەلە فەیلەسوفە بونیاتنەرەکانی پاش شەڕی جیهانی دووەمی ئەورووپاو ئەو قەیرانە ترسناکە فیکریەن، بوونگەراییانە لەخودا جیاکردەوە وەبوونگەراییانە، بوونگەرایی بێ خودایە لەکاتێکدا کەفەیلەسوفە بونیاتنەرەکانی ئەم قوتابخانەیە بەناونیشانی گەورەترین ڕووکردنە ئەندێشەی مەزهەبی بوونگەراییەکەیان دیاری کرد، بەلاّم ئێمە هەمیشە بیروبۆچوون وقوتابخانە فەلسەفی وکۆمەلاّیەتیو هونەرییەکانی ئەورووپا نەك بەوجۆرەی کە هەن دەیانناسین، بەڵکو بەوجۆرە کەدەبێت بناسین، پێمان دەناسێنین وئەمەش شتێکە کەشایەنی ئەوەیە خەمی بۆبخورێت.

[2] لەداستانی دروستبوونی (ئادەم) مرۆڤدا، جۆرێك بوونگەرایی تایبەت، بوونگەراییەن کەبەپێچەوانەی هەوڵو کۆششە زارەکیەکانو لۆژیکیەکانی سارتەر، لەگەڵ هاورێك بوونی بەمرۆڤگەرایی، پێویستی بەهیچ ئاراستەو لێکدانەوەیەك نیە، دیارە خودا تەنها ئەوە وادەگەێنێت کەمەبەستی دروستبوونی ئادەم جێنشینێکی لەزەویدا هەیە، ئەوە فریشتەکانن کەبەپێوانەی مرۆڤەکانی پێش ئادەم قسە لەماهیەتی خراپو خوێنڕێژی دەکە (پێش دروست بوونی ئادەم) وخوداش نەئینکاری ئەوەدەکات نەدانی پێدادەنێت تەنها دەفەرموێت من ئەوەدەزانم کەئێوەی نایزانن. باس لەماهیەتی ناکات (ئادەم) بەسەرکەشی دروست نابێت، (ئادەم) سەرکەش دەبێت وئەم بابەتە بەدرێژای لەسەر گوزەشتەی (حەواو قابیلو هابیل)یشدا درێژە دەکێشێت. (بگەڕێرەوە بۆ کۆنفراسی مرۆڤگەرایی لەفەلسەفەی دروستبوونی ئادەم)دا زانکۆی نفت ئابادان ساڵ ١٣٤٧)

ڕەهایە ئەو من (lemoi)ی ڕەها بەپلەپلە کە سروشت بەرەو تەواوکاری دەڕوات لە شێوەگەلی تەواوکاری تری تەجەللای ڕوونتر پەیدادەکات و زیاتر لەخود ئاگایی نزیکتردەبێتەوە، تاکو کەدەگاتە مرۆڤ زیاتر لە هەمووان تەجەللا و ئاگایی پەیدادەکات، بۆچی؟ چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکە لە نێوان هەموو بوونەوەرانی سروشتدا کەهەست بەخۆی دەکات، ئاگایەبە سروشت، بیردەکاتەوە، ئیرادە دەکات، هەڵدەبژێرێت، دژی سیستەمێك سەرکەشی دەکات وەسوننەتی جەبری سروشت دەگۆڕێت، سیستەمی دروستبوونی خۆی دەوێت و هەوڵدەدات تاکو بەسەر ئەو سیستەمەی کەهەیە، جێبەجێی بکات. دروست دەکات، بەدی دەهێنێت، وێران دەکات... دەبینین کەکاری شێوە خودادەکات، گەرچی لێکچوویان هاوشێوەی ئەو نیە. لەبووندا تەنها خودای گەورەیە کە دەتوانێت بیربکاتەوە و بەوجۆرەی کەدەیەوێت بڕیاربدات، بەدی بهێنێت، هەڵبژێرێت، بمرێنێت و بەرهەم بهێنێت.

هەموو بوونەوەران بوونەوەرانی سروشتی ماددی، بێ گیان وگیاندار، هەموویان بریتین لە بەرژەوەندی ناخودئاگای ناچار لەدەستی ئیرادەی خودایەك یان جەبری سروشتی ماددی، لەخۆیان وهیچ جۆرە ئیرادەیەك ناسینیان لەبارەی خۆیانەوە نیە. گیا هەربەوجۆرەی کەگەشە دەکات، لق و پۆپ دەردەکات، گوڵ دەردەکاتو میوە بەرهەم دەهێنێتو پاشان زەرد دەبێت ووشك دەبێت، با دەجوڵێت، کێو وەستاوە بەبێ جووڵە، مانگ لەدەوری زەویدا دەسوڕێتەوە، هەموویان بەبێ ئەوەی بتوانن، بەبێ ئەوەی بزانن و بەبێ ئەوەی هەست بکەن، بەندەی یاساو سیستەمێکن کە لەسەر ئەو سیستەمە دروستبوون و ڕێکخراون، بەڵام مرۆڤ بەپێچەوانەی هەموو بوونەوەرانی کائینات، بیرکەرەوەو زاناو دروستکەرو داهێنەرو سەرکەش و خود ئاگاو جیهان ئاگایە.

"پاسکاڵ" لەدوو ئاکۆتاییدا (Les deux infinis) ووتەیەکی بەناوبانگی هەیە: بچوکترین شتی لاواز دەتوانێت مرۆڤ بشکێنێت (ئاکۆتای بچوك) ئەگەر هەموو کائینات

خۆیان پرچه‌ك بكه‌ن و كه‌مه‌رببه‌ستن بۆ كوشتنی مرۆڤ، جارێكی دی مرۆڤ له‌ هه‌موو جیهان و هه‌موو ئه‌و هێزانه‌ی كه‌ كوشتویانه‌ گه‌وره‌تره‌ (ناكۆتای گه‌وره‌)، چونكه‌ هه‌موو سروشت كه‌ده‌یكوژێت تێناگات، هه‌ست ناكات كه‌ده‌یكوژێت، به‌لام مرۆڤ كه‌ده‌یكوژێت، ده‌ناسێت و هه‌ست ده‌كات كه‌ده‌كوژێت. به‌سه‌ر هه‌موو بووندا گه‌وره‌یه‌ و ئه‌ویش زانسته‌، ئاگایی به‌خود و به‌كائینات و ئیراده‌یه‌و ده‌بینین كه‌ مرۆڤ به‌ئیراده‌، به‌ته‌كنیك، به‌زانست ده‌توانێت رێڕه‌وی جوگرافیایی، بارودۆخی ناوچه‌یی و هه‌رێمی و هه‌روه‌ها یاساو رێسای گیاناسی و ئاژه‌ڵناسی به‌سوودی خۆی جێگۆڕكێ بكات. ئه‌و گیایه‌ی كه‌ له‌سه‌ر بنه‌مای سوننه‌تی سروشتی ده‌بێت بگۆڕێت، مرۆڤ ئیراده‌و زانستی خۆی له‌م رێڕه‌وه‌ جه‌بریه‌دا كه‌ سروشت داخوازیه‌تی، به‌شداری ده‌كات و رێگه‌ی خۆی ده‌گۆڕێت، ئه‌م ئیراده‌ كێیه‌؟ به‌گوته‌ی "هیگڵ"، ئه‌م ئیراده‌یه‌ هه‌مان رۆحی ره‌هایه‌، ئه‌وه‌ خودایه‌ كه‌ له‌ ته‌واوترین جۆری له‌جووڵه‌ی ته‌واوی سروشت كه‌ مرۆڤه‌ ته‌جه‌للای كردووه‌ و به‌خود ئاگایی گه‌یشتووه‌.

## چۆنیەتی دەربڕینی مێژوولەتێڕوانینی ئەمڕۆدا

پاش ئەوەی کەباسمان کرد، ئیدی "هیگڵ" خەریك دەبێت بەو شتانەی پەیوەندیان بە نەژادەوە هەیە وە دروشمی میللی نەزانی دەخوێنێت وئەفسوس! کە ئەو رۆحە ڕەهایە رێرەوی خۆی لەسروشت لەگەڵ مرۆڤدا دەبڕێت و مرۆڤ کە هەڵگری رۆحی رەها خودایە، خۆی لەرێڕەوی مێژوو، تەواوکاری مەعنەوی دەدۆزێتەوەو تەواوکاریشی کەهەمان خود ئاگاتر بوونو لەجیهان ئاکادارتربوون (کەعەقڵ ومەعقوڵ لەفەلسەفەیدا یەك شتە) رۆحی رەهایە. بەشێوەی خود ئاگاتربوون دێتەدی.

لەبەرئەوەی لە نێوان مرۆڤەکان، رۆژهەڵاتیەکان زیاتر خاوەن سۆزو ئیحساسن و هەروەها ئیلهامیو ئیشراقین و زیاتر بەناخود ئاگاوە پەیوەست دەبن، بۆیە ناتەواوترن، وەمرۆڤی ئەورووپی گەیشتوونەتە قۆناغی عەقڵو شیکردنەوە و لۆژیك وبیرکردنەوەی ژیرانە زیاتر بەخود ئاگایی وردتر گەیشتوون.

تەجەللاو دەرکەوتنی ئەو ئیرادە رەهایەی تێدا زیاترە ولەقۆناغی ئێستادا (لەڕێنسانس) کەقۆناغی کۆتایی هاتنی سەردەمی مەزهەب وسەرەتای سەردەمی عەقڵ، واتە فەلسەفەیە ورۆژهەڵاتی عیرفانیو مەزهەبی ورۆژئاوایی لۆژیکی و فەلسەفسە. ئایدیای رەها بەکردار لێرەدا خەریکی تەجەللاو تەواوکاری لۆژیکیە. لەبەرئەوە رۆحی رەها، یان خودای ئەزەلی لە مرۆڤی رۆژئاواییدایە کەزیاتر تەجەللادەکات ولە مرۆڤە رۆژئاواییەکانیشدا ئەڵمانیەکان لە هەمووان زیاتر فەلسەفینو دەماخیان هەیەولۆژیکی ترن. بێگومان لە نێوان ئەڵمانیەکانیشدا خزمو کەسەکانی خودی جەنابی "هیگڵ"، دایك و باوكو مامو....هتد و ئەمانە زیاتر ئەو رۆحە رەهایەی

جیهانی ئەزەلیان تێدا دەرکەوتووە! پێنەکەنن! ئەمەمن دەیڵێم، قسەکانی خۆی زیاتر جێگای پێکەنینن.

دەڵێت: لە کۆمەڵگەی ئەڵمانیدا حکومەت (Etat)ە کەشوێنی دەرکەوتنی زیاتری رۆحی نەتەوەییە، واتە: دەرکەوتووترین جیلوەی رۆحی رەهایە ولەو حکومەتانەی کەهەن لەئەڵمانیادا زیاتر لە هەمووان و لە هەمووکائینات. لەبەرئەوە بەپێی ئەم فەلسەفەیە خودای رەها بەرۆیشتنی دیالێکتیکی سروشتو بەهۆی مرۆڤەوە بەخود ئاگایی دەگات، لەگوتەی خودی خۆی خودایە کەپێویستی بەمرۆڤە، نەك مرۆڤ بەخودا، لەبەرئەوە خودا لەفەلەسەفەی هیگلیدا، دەتوانێت یەکێك لە پەروەردەکارانی دەربارەی دەسەلاتی خودا پەروەری ئەڵمانیا. ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کەبلیمەتانی موعجیزە ئاسای وەکو "هیگڵ"، چۆن هەندێجار دەبنە شوێنکەوتەی خۆویستی ناوچەییو هەرێمی وخێزانیو هەڵەی پێکەنیناوی لەمجۆرە دەکەن.

وەئایا ئەم رووداوە ئێمە شاگردانی مام ئاوەندی "هیگڵ" و ئەوانەی کەخوێندەوارن زۆر ئامانترسێنێت کەئایا ئێمە پارێزگارین؟

دەبینین کەمێژوولەئەندێشەی "هیگڵ"دا (کەئەگەر خراپەی پارچە فەلسەفیەکەی دوور بخەینەوە، بەتایبەت ئەگەر هزرو بیری بنەرەتیەکە لەدەستەواژەی قوڵو ئاشنای فەرهەنگی خۆمان روون بکەینەوە، زۆر گرنگ دەردەکەوێت.) کەبریتییە لەو هۆکارەی کەرۆحی رەهای جیهانی ئەزەل لەرێرەوی تەواوکاری جیهانی سروشت دەگوزەرێنێت وەمێژووەکە مرۆڤ لە ئایندەدا لەقۆناغەکانی جیاوازی تەواوکاری کە بەدوایانەوەیە، دەیگەیێنێتە جێگەیەك کەجارێکی دی بۆ هەمان رۆحی رەها بگوردرێت، واتە هەر ئەم ئیرادەو توانای دروستکردنە کە لە مرۆڤی ئێستادا دروستبووە، هێندە بەهێزبێت وبگاتە تەواوکاری کە مرۆڤ ببێتە خودا بەدەستەواژەی "هیگڵ" خودا لە مرۆڤدا بگاتە تەواوکاری لۆژیکیو خودئاگایی. مرۆڤ بەجۆرێك بەسەر سروشتدا زاڵ ببێت کە

(هەروەك) خودا _واتە بەدیهێنەری رەهای عەقڵی گشتی_ بەجۆرێك دەبێتە بەدیهێنەرو خاوەنی ئیرادەی رەها كە هەموو یاساو ڕیساكانی سروشت كەمشتی خاوەندارێەتی ئەوولەدەستی ئیختیاری ئەودان، مرۆڤ دەگۆڕێت بەرۆحێكی رەها، دەگۆڕێت بەئایدیایەكی رەها.

لێرەدا پێوەری راستی ودروستی ئەم قسانە مەبەست نیە، ئەوەی كەمن دەمەوێت لەتەرحكردنی ئەم بابەتەدا ئەنجامێك دەست بخەم، یەكێكیان بەهاو مەزنی مێژوو و ئەوی دیكەیان چۆنیەتی دەربڕینی مێژووە لەتێڕوانینی ئەمڕۆدا، چ لە ئایدیالیزمی رەهای "هیگڵ"، چ لەماددیگەرای رەهای "ماركس" وچ لەبوونگەرایی نوێی "سارتەر".

سێیەم تێڕوانینی ماددی مێژووە لە قوتابخانە فەلسەفیە ماددییەكانی سەدەی نۆزدەهەم كەتاكو ئێستاش شوێنكەوتوی هەیە. بەشێوەیەكی گشتی ئەم فەیلەسوفانە لایان وایە مێژوو بریتییە لە جووڵەی تەواوكاری مرۆڤ لەرابردووەوە تاكو ئێستاو ئێستاش تاكو ئایندە، ئەم جووڵەی تەواوكاریە چۆنە؟

ماددی و لەسەر بنەمای زنجیرەیەك یاساو رێسای جەبری. بەو مانایەی كەخودی مێژوو، خودی كۆمەڵگەی مەدەنی، كۆبوونەوەی مرۆیی، وجەبرا دروست وەكوم بەردێك كە لەسەر رێڕەوێكی ئاودایە وهێزی ئاوەكەش ئەو پارچە بەردە دەجوڵێنێت و بەرەو پێشەوەی دەبات، كۆمەڵگەی مرۆیش لەرێڕەوی جۆگەی ئاوی رۆیشتووی مێژوودت بەجەبری بەرەو پیشەوە لەجووڵەدایە و ئەم جووڵەیە نەك لەسەر بنەمای ئیرادەی ئەم بەردە واتە مرۆڤ، یان ویستی ئەو، یان ئەو قارەمانانەی كە لە كۆمەڵگەی مرۆییدان، بەڵكو لەسەر بنەمای یاساو رێسای جەبری ماددی كە لە ناو كۆمەڵگەدایە، دروست دەبێت (determinisme historique)و كۆمەڵگەی مرۆیی ناچار لەو رێڕەوە بیەوێ یان نەیەوێت دەجوڵێت. واتە دەكەوێتە جووڵە.

مێژوو لەم فەلسەفەیەدا بریتیەلە جادەیەك کەخاوەنی شوێنی دیاریکراوو سنورداری ناچاریە، مەنزڵی یەکەمی کۆمەڵگەی سەرەتایی خاوەن ئاژەڵی بێ چین و توێژە، لەو شوێنەدا مرۆڤەکان هەموویان وەك یەکن و کەسیان شتێکی زیادەی بەسەر ئەویتریانەوە نیە، پەیوەندی ئاڵۆزیان لەگەڵ یەکدا نەبووە، چین وتوێژەکان بوونیان نەبووە، کاروباری جیاواز نەبوو، بەرهەمهێنان ئاڵۆزو کۆمەڵایەتی نەبوو، موڵکایەتی بەسەر ئامێری بەرهەمهێنانەوە بوونی نەبوو، سروشت فراوان و سەخاوەتمەندی بەرهەمهێنەربوو و مرۆڤەکان بەکارهێنەر، هەموویان پێکەوە دەچوون بۆ دارستان، کەناری رووبار یان دەریاولەوێ راویان دەکرد، میوەیان کۆدەکردەوە، پێکەوە بەدەستە دەستە گەڕانەوە، لەبەرئەوەی تەنها هەموو کارێکیشیان بریتیی بوو لە راوکردن و هەروەها سەرچاوەی بەرهەمهێنان و ماڵ و سامان، دارستان وسروشت لەئیختیاری هەموویاندا بوو و ئەمەش زیاتر بوولەپێویستی وپێداویستی خەڵکی. لەبەرئەوە جۆراوجۆریەتی و تایبەتمەندی و جیاوازی چینایەتی وموڵکایەتی ویەکێك هەبوو ویەکێك نەدارو یەکێك گەورەو یەکێك بەندەو دزی مەشروع و نامەشروع و خاوەن ماف و مافخوراو بوونی نەبوو، کۆمەڵگەبێ چین و توێژبوو. ئەمە کۆمەڵگەی سەرەتاییە، بەرامبەری و یەکسانی دەشتەکی مرۆڤەکان لەکەناری خوانی بەخششی سروشتی پڕ، مەنزڵێکی سەرەتایی کە مرۆڤی تێدادەژیا.

پاشان دەچێتە نێو قۆناغی کشتوکاڵیەوەو سنورداری سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان ودیاریکردن و ئامێری بەرهەمهێنان وموڵکایەتی دروست دەبێت و لەبەرئەوەی هێشتا نەموڵکایەتی ومیراتی باوك و نەئازادی گەورەکان و نەرووگەو رێنمونی مەزهەبی ونەهاوسەنگی ماف، تەنها زۆرکردن هەبوو وکەسی زۆردار کەمافی موڵکایەتی دیاری دەکرد وموڵکایەتیش کەهات بەدڵنیاییەوە و بەندەیش دروست دەبێت وچینی سەرەوە وخوارەوە دروست دەبن و مرۆڤ بەجەبری دەچێتە قۆناغی کۆمەڵگەی چینایەتیەوە، پاشان ئەم کۆمەڵگەیە بەچین و توێژەوە و لەسەر بنەمای موڵکایەتی لەسەر رووی زەوی کەقۆناغی کشتوکاڵیە فیودالیزم دروست دەکات.

قۆناغی فیودالیزم لەمێژوودا دەردەکەوێت لەسەر بنەمای جەبری دیالیکتیکی کە هەرچەندە گەشەدەکات، دوژمنی خۆی ودژەکەی خۆی نەفیکردنو سرینەوەی خۆی لەدەروونی خۆی پەروەردە دەکات. (هەر بەوجۆرەی من بەپلەیەی کەگەشەدەکەم، مەرگی خۆم لەناخو دەروونی خۆم پەروەردە دەکەم، بۆ نموونە، من دوو ساڵی دیکە، دوو هەنگاولەمردنی خۆم نزیکتر بومەتەوە، لەهەر هەناسەیەکدا بەو پلەیەی کە گەشە دەکەم، بەهەمان پلە، دوژمنی خۆم، لەناوچوی خۆم، لەدەروونی خۆمدا، دەهێنمە دی.) کۆمەڵگەی سەرمایەداریش بەو پلەیەی گەشە دەکات و فراوان دەبێت، وەکو هەر دیاردەیەکی دیکە لەم جیهانەدا. لەسەر بنەمای دیالیکتیکی تەواوکار بەدۆخی چینایەتی، شێوەی بەرهەمهێنان و ژیانی قۆناغی سەرمایەداری هۆکارێك بەناوی بورژوازی ژیانی پارە، ژیانی بازرگانی، ژیانی جوڵاو و کراوە، ژیانی ئاڵۆزی شاری لە دەروونی ژیانی سەرمایەداری دەهێنێتە دی.

بە هەرحاڵ، بورژوازی بەم شێوەیە بەسەرمایەداری لەوپەڕیدا بەقۆناغی داگیرکاری ئابووری دەگات و چارەنووسی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی جیهانی لە دەستی چەند کەسێکدا دادەنێت. دەبینین کە جەبری سروشتی گەشەی کۆمەڵگە لەسەر بنەمای دژیەکی دیالیکتیکی هەبوولە ناخی کۆمەڵگەی چینایەتی، کۆمەڵگەی لەسەرەتای بێ چین و توێژ لە قۆناغێکدا دەجوڵێنێت بەرەو قۆناغێکی تر تاوەکو ئەوەی کە جارێکی دی کۆمەڵگەش بە قۆناغی بێ چینایەتی سەرەتایی دەگەڕێنێتەوە، بەڵام بەشێوەی بەرزی شارستانیەت لەبەرئەوە مێژوو بریتیە لە کۆمەڵگەی مرۆیی کە لە قۆناغی چینی یەکەم دەست پێدەکات، ئەم جێگە و پلەپلانەش بەجەبری خودی کۆمەڵگە بەهۆی دیالیکتی مێژوو، لەم مەنزڵەوە بۆئەو مەنزڵ ولەو جێگەیەوە بۆ جێگەیەکی تر دەپێوێت تاکو بەو سەری مەنزڵە دەگات کە بە بەڵگەنەویستی ناچارییە ولەوێدا چاوەڕێی گەیشتنی ئەم کاروانەیە، مێژوو بریتیە لەوەی کە چۆن دەجوڵێت؟

لەسەر بنەمای دیالیکتیك، گەشەی قۆناغێك بەشێوەیەك کە دوژمنەکەی خۆی کە لەقۆناغی دواتردا دەبێت، لەدەرونی خۆیدا پەروەردەی دەکات، هەر بەو جۆرەی کە

باوکێك بەو پێوانەیەی کە گەشە دەکات، منداڵەکەشی لە خێزانەکەیدا، لە ژیانیدا گەشە دەکات و گەشەکەشی واتە لاوازی باوکی، بوونی ئەو، مانای نەبوونی باوکە.
منداڵ کاتێك کە دەبێتە لاوێکی تەواو کە ئیدی باوك بەشێوەی باوکێکی پیر ولاوز دەردەکەوێت و پاشتر بە لێدانی کتوپڕی منداڵەکەی لە نێو دەچێت، پاشان قۆناغی دووەم دەگات و ئەم منداڵەش جارێکی دی گەشە دەکات، منداڵێکیش کە دژی هەیە لەدەروونی خۆیدا پەروەردەی دەکات بەو پێوانەیەی کە ئەم دژ (کورەکەی) گەشە دەکات، دژەکە کە باوکیەتی بەرەو پوکانەوە ولەناوچوون دەچێت لەناوی دەبات و گۆڕانیەتی بۆ باوکێك، خانی فەرمانڕەوای دێ دوکانداری لاواز پەروەردە دەکات، تاکو ئەو جێگەیەی کە خان کەوت ولەناو چوو خۆی دەبێتە جێگرەوە و خاوەنی دوکانەکە و دەبێتە کەسێکی خاوەن پارە و خاوەن کارگە و ئەم کارگەیەش هەرچی زیاتر گەورە بێت گەشە بکات، زیاتر کرێکار لەناخ و دەروونیدا گەشە دەکات و زیاتر دەکوژرێت ئەم نموونەیەش پێوانە و پێوەرە.
لەسەر بنەمای ئەم دیالیکتە، قۆناغە جیاوازەکانی مێژوو خۆبەخۆ بۆ یەکتری دەگۆڕدرێن و کاروانی کۆمەڵگەی مرۆیی لەجادەی جەبری مێژوو بە درێژبوونەوەی دیالیکتی ئەم قۆناغە بە جەبری دەیگوزەرێنن، تاکو دەگەنە کۆتایی سەری مەنزڵ جارێکی دی کۆمەڵگەی بێ چین وتوێژ.

## مرۆڤ جەبری ژینگە دروستی دەکات:

دەبینین کە چۆن قۆناغە مێژووییەکان بەجەبری لەسەر بنەمای ئەو یاسا و ڕێسایەی کە لە کۆمەڵگەدا هەن ولەدەستی کەسدا نین، یاسای سروشتی لەبەرچاون، یاسای دانراو و ئیرادەی نیە بەدوای یەکدا دێن و بەپێی یاسای سروشتی کۆمەڵگە گەشە دەکەن و دەبنە ترۆپك دەتەقنەوە و جارێکی دی بە قۆناغی تر...لەسەر بنەمای شێوەی کار، جۆری ئامرازی کار، ئەو هۆکارانەی بۆ بەرهەمهێنانی کار بەکاردێن، ئەو سەرچاوانەی کە تایبەتن بە بەرهەمهێنانەوە، بڕیارەکان؟

پەیوەندی ئابووری و کۆمەڵایەتی یاسایی تایبەتی گونجاوی لەگەڵ پەیدا دەبن لەگەڵ هەموویان "سیستەمی کۆمەڵایەتی" پێکدەهێنن و ئەم شێوە کۆمەڵایەتیەش" ژینگەی کۆمەڵایەتی و قۆناغی کۆمەڵایەتی" تایبەتیش دروست دەکەن. بۆنموونە، کاتێك ئامێری کاری کەشتی و بەلەم و... هتد و سەرچاوەی بەرهەمهێنان دەریا و رووبارەکانە، جۆرێك پەیوەندی دامەزراوەی مافی کۆمەڵایەتی و پاشان سیستەم و شێوەی کۆمەڵایەتی و ژینگەی کۆمەڵایەتی دروست دەکات و پاشان ئامێری کار مانگا و خاکەناز و... دەبێت و سەرچاوەی زەوی و ئاو وباخ.....جۆرێکی دی و کاتێکیش ئامێری کار ئۆتۆمبێل دەبێت، رێکخراوە ئیدارییەکان، پەیوەندی چینایەتی، یاسایی، کۆمەڵایەتی و سیستەم و شێوەی کۆمەڵایەتی دەگۆرێت.

لەلایەکی دیکەوە دەزانین و دەبینین کە مرۆڤ دروستکراوی دەستی خۆی و بەمانای وردتر شێوەی کارەکەیەتی شێوەی کارەکەی جۆری ئەو هۆکارەی کاری پێدەکات، دروستی دەکات، هیچ کەس نیە جیاوازی نێوان تایبەتمەندی ئەخلاقی و رۆحی و فیکری و شێوە و جۆری قاوەچی، شۆفێر و جوتیار و خاوەنی مەڕ و مامۆستا و ئیداری و رۆژنامەنووس و کرێکاری کارخانە و پاسەوان و ژن و پیاو نەزانێت و کەسێکیش نیە کە نەزانێت جیاوازی ئەم (چەند جۆر مرۆڤە) بەهۆی کارەکەیانەوە. بۆ نموونە میوان دۆستی و میوان نەوازی فەزیلەتێکی ئەخلاقی بووە کەکاری سەدەها دامەزراوەی کۆمەڵایەتی مۆدێرنی ئەنجامداوە. ئەمڕۆ جادە هەیە، تەلەفۆن و هۆکاری گواستنەوە و پەیوەندی جۆراوجۆر و خێران بوونیان هەیە، بانك هەیە، ئۆتۆمبێل هەیە...

لەنیوەی رێگا سەیارە تێکدەچێت، پاش چەند کاتژمێرێك چاك دەبێتەوە، هۆکارێکی دیکە هەیە تۆ بە شوێنی مەبەست دەگەیێنێت، کەپارەت لێدەبڕدرێت، کەسێك یان بانکیك هەیە چارەسەری بکەیت و پارەت دەست بکەوێت، بەڵام لەسەردەمی ئێبن بەتوتەدا، بیابانەکانی دەبڕی، لەخێڵ و بیابان نشینەکان تێپەڕ دەبوو، لادێیەکان زۆرجار جگە لەمزگەوت یان پەرستگایەك جێگەیەکی دیکەیان نەبوو، ئەگەر ئاژەڵی نە خۆش بکەوتایە، رووتیان دەکردەوە، نەیدەتوانی لەڕۆشتن بەردەوام بێت، رێگەی ون

دەکرد... ئەگەر سوننەتی ژیانی میوان نەوازی نەبوایە، هەر لە بنەڕەتەوە ئیمکانی ئەو کەسەی کە پێی لە وولاتی دەباتە دەرەوە بوونی نەبوو.

ئەم مەرجە کۆمەڵایەتی و پێویست بوون بە ژیانە کە ئەم غیرەتەی لەبیابانـدا و خاوەندارانی موڵك و نیشتەجێبوون دروست دەکات کە (ئەگەر ناسراوێك یان ڕێبوارێك لەسەر زەمینی ئێمەوە، خێڵی ئێمەوە تێپەڕ ببێت و سەردانی ماڵەوەمان نەکات لەسفرەمان خۆراك نەخوات و مۆڵەت وەرنەگرێت و تێپەڕ ببێت سوکایەتی کردووە و گیانی لەمەترسیدایە.) خێڵەکانی عەرەب شانازییان ئەوە بوو کە شەوان ئاگریان هەڵدەکرد، تاکو ئەو کەسەی ڕێگەی ونکردووە یان غەریب و ڕێبوارێك ماوەتەوە، بزانێت ناونیشانی (پیاوانی خاوەن کەرەم بەخشندە) لەکوێدایە و لەم بیابانەدا هەموو ڕێبوارێك بۆ میوانداری بانگهێشت دەکەن، لەبەرئەوە مرۆڤ تایبەتمەندییەکانی لە سیستەمێکی کۆمەڵایەتییەوە وەردەگرێت و لەبەرئەوە سیستەمە کۆمەڵایەتییەکەی بەو جۆرەی کە بینیمان، لە جەبری بەپێی هاوڕایی یاسا و ڕێسای جوڵە و گۆڕانکاری جەبری کۆمەڵگە لەمێژوودا دروست دەبێت، کەواتە مرۆڤ جەبری ژینگە دروستی دەکات و جەبری گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەگۆردرێت.

## هۆکارەکانی پەیدابوونی زانست پەرستی (سیانتیزم)

لەسەدەی حەڤدەهەمدا ئەو چینەی خوێندنی تەواو کرد لەسەر بنەمای لۆژیك و زانست هاتە بوون، بەتایبەت لەسەدەی نۆزدەهەمدا کەزانستە سروشتیەکان زۆر گەشەیان کرد، هەروەها کیمیا و فیزیا و زیندەوەرزانی هەر ڕۆژێك دۆزینەوەیەکی نوێ موعجیزەیەکی نوێ ڕاگەیێنرا، ئەم تێڕوانینە لە هەموو بەشەکانی زانستە مرۆییەکانیشدا تەنانەت لەفەلسەفەدا، تەنانەت لە مەزهەب و ئەدەبیات و هونەردا گەشەی کرد، زانستە سروشتییەکان و لەگەڵ ئەوەشدا یاساکانی سروشت ناسی بەدەستەواژەیەکی تر ئەو بنەمایانەی کە سروشت لەسەر بنەمای ئەوە کاردەکات و تەواوکاری پەیدا دەکات –سروشتی گیا سروشتی ماددە و سروشتی ئاژەڵ– ئەم بنەمایانە کە بەم هێندەیە درەوشاوەیە و هەر ڕۆژێك واقعیەت و حەقیقەتی ئاشکراتر و درەوشاوەتر دەبێت و ژیان

و توانا و دەسەڵاتی مرۆیی بەسەر سروشدا تاکو ئەم رادەیە بەرەو سەرەوەی بردووە و دەبیات، سەرکەوتنە یەك لەدوای یەك وسەرنج ڕاکێشەکان وداهینەرو بێ پێشینەی زانستە سروشتیەکان، فیزیا، کیمیا، بایلۆژی، ئیمان بەم زانستانەی بەرادەیەك زیادکردکەسەبارەت بەم شتانە دەمارگیری پەیدابوو، ئەم دەمارگیرییە بەرادەیەك فراوان بوو بەتایبەت لەسەدەی نۆزدەهەمدا کەکلود برناد ئەگەر ڕۆح یان خودام لەژێر چەقۆی نەشتەرگەری نەبینی کەواتە بوونی نیە، ئەم ڕستەیە بە تەواوی ڕەسەنێتی زانستە مرۆییەکان لە سەدەی نۆزدەهەمدا دەردەخات کە تاکو چ رادەیەك زانایان باوەڕیان بە سروشتگەرایی واتە (قوتابخانەی زانستی بیناکراو لەسەر ڕەسەنێتی سروشت )بوو. سروشتگەرایی بەشێوەی مەزهەبێك دروستبوو و بوویە ژێرخانی هەموو زانستە مرۆییەکان، یەکێك لە قوتابخانەکانی سروشتگەرایی کە لەسەر زانست و زانست پەرستی "داروین"یزم بوو. باوەڕبوون بە بنەڕەتی گەشە و پەیدابوون و مانەوە، ململانێ لەپێناو مانەوەدا، هەڵبژاردنی چاکترین مەکتەبی "داروین"دا([18])، گۆڕینی جۆری ئاژەڵان وگیاکانی راڤە دەکرد. بۆ نموونە، بەچ جۆرێك تەنها خانەیەك بەچەندەها خانەی دیکە دەگۆردرێت، یان ئێسکدار گۆڕاوە بەئێسکدار، بەمەمکدار و بەمەیمون و دواجار بەمرۆڤ. ئەم تەواوکاریە فسیۆلۆژیەی بوونەوەران بەپێ ی جۆرێك بۆ جۆرێکی دی تەواوکارتر لەسەر بنەمای (شەڕ بۆ ژیان و هاوڕابوون یان بارودۆخی گۆڕاوی ژینگە) ئەمە دارونیزم روونی دەکاتەوە.

لەسەدەی نۆزدەهەمدا کلودبرناد بەگوتەی فەڕەنسییەکان دەروونی مرۆڤەکانی وەکو (نێو گیرفانەکەی ) دەناسی و ئەمەش لەنیوەی سەدەی بیستەمدایە کە هەرساڵێك فسیۆلۆژی، دەروونناسی، ژینگەناسی، نەژاد ناسی، خەڵکناسی، کۆمەڵناسی، مێژووناسی و بەشەکانی دیکەی مرۆڤناسی پێش دەکەون، نەزانراوی بێ شومار کە لەم واقیعییەتە سەرسوڕهێنەرەدا کەناوی مرۆڤە، دەرکەون و زۆرێك لەتاریکیەکان لەدوو

---

[18] – مەکتەبی داروین، گریمان ئەگەر ڕاستیش بوو بێت، تەنها لەفسیۆلۆژی جۆرەکانی زیندەوەرانی زیندوو ڕاست بوو.

تویێی لێکۆڵینەوە بەردەوامەکانی مرۆڤناسی روون دەبنەوە. ئەلکسیس کارل براوەی خەڵاتی نۆبڵ لە فسیۆلۆژی مرۆڤ، مرۆڤ بەناونیشانی"ئەم نەزانراوە" ناو دەبات و دانبەوەدا دەنێت کە زانست لەسەر زەمینی نهێنی ئامێزی دەروونی مرۆڤ هێشتا هەنگاوێکی هەڵنەگرتووە.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا فەیلەسوفەکانی مێژوو بەجۆرێك قسەیان لەبارەی حەقیقەتی مێژوو دەکرد کە تەنانەت ئیحتیمالی ئەوە بوونی هەیە نەزانراوێك (بوونی هەبێت، بوونی نییە و هەموو بابەتە مێژووییەکان ئەم سێ هۆکارە بوونە هۆی پەیدابوونی زانستگەرایی لە سەدەنوێیەکاندا :-

١- ئەو شکستەی کە لە کڵێسا و تێروانینی بەستوی کاسۆلیکی و روحی داڕوخاوی سەدەکانی ناوەراستدا وە ئەو رۆحە سەرکەشەی کە بەهۆی رزگاربوونی نوێی لە زیندانی سیکولاستیکی دەستی کەوتبوو.

٢- دۆزینەوە و داهێنانی سەرسوڕهێنەری کە راستەوخۆ پاش ئازادبوونی لەسەدە نوێیەکانیدا دەرکەوتن ولەناکاو شێوەی ژیان و شارستانییەتی جیهانی پێشکەوتوی گۆڕی.

٣- لەهەمانکاتدا، کاڵی ولاوی زانست(Science) کە هێشتاش سەرکەوتنە درەوشانەوەکانی بەتەواوی و تەواوکاری نەگەیشتبوون کە بتوانێت خۆ بەکەم زانبێت و هێشتا سروشت و نهێنی ناکۆتایی بەو ئەندازەیە دەرنەکەوتبوو و نەزانرابوو کە بتوانێت هەست بەگەورەیی فرەیی بێسنوری (نەزانراوەکانی خۆی بکات.([19])

---

[19]- بە گوتەی "گوریچ" زانست هەرچەندە بەرەو باڵاتر و سەرووتر بڕوات، زیاتر مل کەچ تر دەبێت"، بە هەمان ئەو پێیەی کە کەسێك خوێندنی تەواوکردووە بە سادەیی و دڵنیاییەوە هەموو بابەتەکانی بوون شیکار دەکات و وەڵامی هەر پرسیارێك دەزانێت. کەسانێکی وەکو ئەنیشتاین و ماکس پلانك و کارل کە خوداوەندانی زانستی نوێن لە بەرامبەر " ئەوەی کە نایزانن" توشی حیرەت و بێدەنگی و

کۆمەڵناسـی (١٩٨)یاسـای لـە کۆمەڵگـەدا دۆزیبویـەوە و ئـەمڕۆ گـوریچ دەڵێـت دۆزینەوەکان و سەرکەوتنە بەڵگەنەویستەکانی کۆمەڵناسی نـوێ ئەوەیـە کـە پـەی بـە پوچەڵکردنەوەی هەموو ئەو یاسا و ڕێسایانەی بردووە.

مەزهەبی سروشت پەرستی زانستی بەتایبـەت بـە ڕاگەیانـدنی تیـۆری "داروین"یـزم بەترۆپکی دەسـەڵات و فـەرمانڕەوایی خـۆی گەیـشت، بەشـێوەیەك کەلایـەنگری گشتی بیرۆکەکان لە ڕووی هاوڕایی بنەماکانی (کە تایبـەت بـوو بـەجۆرەکانی بوونـەوەران) لـە زانستە مرۆییەکانـدا وەکـو مەزهـەب و شارسـتانیەت و کۆمەڵگـە و تەنانـەت ئـەدەبیات پێشکەوت. ئەسپنسەری کۆمەڵناس لەسەر ئەو بنەمایە هاوڕاو یەکسانی کـرد و بـرونتیر شـێوازە ئەدەبیـەکانی وەکـو کلاسـیزم و ڕۆمـانیزم... هتـد بەشـێوەی (جۆرەکـانی بوونەوەران) دەربڕی کە بەپێی بنەڕەتی ململانێ بۆ ژیـان و هەڵبـژاردنی شایستەتر لـە تیۆریای "داروین"دا شێوازێك دەگۆڕێن بۆ شێوازێکی تر.

دیڤیدهیوم مێژووی سروشتی ئایینی نووسی. کەسانێکی وەکو دوینتون و سـومرینگ و بلومن باخ زانستی مرۆڤناسـیان (anthropologie)لەگـەڵ بنـەماکانی ژینگەناسـی و فسیۆلۆژی تێکەڵکرد، واتە مرۆڤ هیچ نییە جگە ئەندامێکی زیندووی ئاژەڵی کـە زانـستە سروشـتیەکان دەتـوانن بەسـادەیی شـیبکەنەوە و هۆکـاری زانـستی ولـۆژیکی بـۆ دەهێننەوە. بەڵام لە سەدەی نۆزدەهەم تاکو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم سەرکەشی زانست هەردەمێنێتەوە تاکو ساڵی (١٩٠٠) دەگاتە ترۆپکی خۆی و ئەم سـاڵەش (١٩٠٠) ترۆپکی ئومێدی بورجوازیشە و ناویشی(douceur de vivre)ەواتە شـیرینی ژیـان، بۆچـی؟ چـونکە هەسـت بـەترۆپکی سـەرکەوتنی مـرۆڤ دەکرێـت و زانـست لـە کۆتـایی دەسەلاتیدا هەر ڕۆژێك سەرکەوتنێکی نوێ بەدەست دەهێنێـت و نـوێ و بورجـوازی لـە کۆتایی گەشە و خۆشگوزەرانی ژیان بەسەر دەبات، لەبەرئەوە بە دوای هـیچ شـتێکەوە نییە جگە لە شیرینی و تامی ژیانکردن.

---

سکوت و هەندێ جار نائومێد دوچارن و بە ئاوازێکی پڕ بە فرمێسك و دوودڵـی و بەنـد و ...هتـد قـسە دەکەن.

هەر ئەم شیرینیەی ژیانی ئەمڕۆ گۆڕاوە بە خەم، دڵەڕاوکێ، سەرکەشی، تاڵی.
بەدبینی، کە تایبەتمەندی ڕۆحی سەدەی بیستەمە. ئەم پەرستنەی زانستە مرۆییەکان
گەیشتە جێگەیەك کە نموونەی ئەو (سپنسەر و برونتیر) باوەڕیان وایە کە زانستە
مرۆییەکان — واتە ئەو زانستەی کە قسە لەمانا و ڕۆح و فیکری مرۆڤ دەکەن _ وەکو
کۆمەڵناسی و شارستانیەتناسی لەسەر بنەمای بنەڕەتی گۆڕینی جۆرەکان لە زنجیرەی
تەواوکاری "داروین"ی ڕوون بکەینەوە ولەمەش خۆشتر "برونتر"ە کە دەڵێت:
قوتابخانەی ئەدەبی لەسەر بنەمای گۆڕینی جۆرەکان، بەو جۆرەی کە "داروین" دەڵێت
شیبکەینەوە کە چ جۆرێك، بۆ نموونە کلاسیزم، جۆرێك بوونەوەری زیندووە، پاش
کلاسیزم شێوازی ڕۆمانتیك دروست دەبێت ڕۆمانسیزم بریتیە لە بۆنموونە مرۆڤ کە
نیاندەرتاڵەوە هاتۆتەدەرەوە و پاشان سروشتگەرایی، واقیعیەتگەرایی و پاشان
سوریالیزم، هەستە هونەرییەکان و شیعرییەکان دەبێت لەسەر بنەمای یاسای
"داروین"یزم لە بوونەوەرانی زیندودا ڕوون ببنەوە، بەهۆی زانستەوە، نەك ئەوەی کە
خۆی بابەتێکی تایبەتە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەی دیکە و قوتابخانەی دیکە هەیە.

## مرۆڤ دروستکراوی دەستی خۆیەتی:

لەبەرئەوەی ئەو شتەی کە لە هەموو ئەم قوتابخانانەدا بوونی هەیە ( و ناچار هەموو
ئەوەی کە نەموتووە دەبێت بیڵێم بە کورتی) بە دوو جۆر تێڕوانین و ڕوانگە دەگۆڕێت
سەبارەت بە مرۆڤ و مێژوو: یەکێکیان ئەو زانایانەی کە بینا لەسەر زانست پەرستی و
ڕەسەنێتی زانستی سروشتی کە باوەڕیان وابوو بوونەوەرێکی وەکو مرۆڤ خاوەنی
شتێکی سەربەخۆی تایبەت نیە، بەڵکو وەکو گیاکان و ئاژەڵەکان، شوێنکەوتەی یاسا و
ڕێسای جەبری سروشت و مرۆڤ ناخودئاگا بە هۆی یاسای جەبری کۆمەڵگە و سروشت
دروست دەبێت. ماددیگەری قوتابخانەیەکی لەمجۆرەیە، مرۆڤ لە ئیرادەی تاکە کەسی
خۆی و کاریگەری و جێکەوتی هەبێت بە هۆی هەست، ژیری و عەقل، ئیرادە دەتوانێت

له چارەنووسی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بێبەری دەکات، چونکە ناتوانێت له سروشتدا به ئیرادەی مرۆیی و خودئاگایی مرۆیی قایل بێت.

جۆرێکی دیکه وەکو "سارتەر" رەسەنێتی بە مرۆڤ دەدەن، جگە لە "سارتەر" زانایان و بیرمەندانی لیبراڵی سەدەی هەژدە – کە لە سەدەی نۆزدە و بیستەمیشدا هەن زیاتر هیومانیستەکانن – ئەمانە به پێچەوانەوە باوەڕیان بە رەسەنێتی مرۆڤ هەیە.

"ماکس وێبەر" یەکێك لە ناودارترین بیرمەندانە کە بیروباوەڕ و فیکر بە هۆکاری گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی دەزانێت نەك به پێچەوانەوە، واتە بەو جۆرەی کە "مارکس" باوەڕ وایە. ماکس وێبەر لە کۆمەڵناسی مەزهەبیدا هەماهەنگی چەماوەی کاسۆلیك و دواکەوتنی پیشەسازی( لە لایەك ولە لایەکی دیکەوە هەماهەنگی) سەرمایەداری و پرۆتستانتیسم و پێشکەوتنی پیشەسازی ئابووری بە جوگرافیای مرۆڤی رۆژئاوای پیشانداوە. ئەڵمانیا و ئەمریکا پرۆتستانن و ئیسپانیا و ئیتالیا تەواو کاسۆلیك و وولاتەکانی دیکە بەو رێژەیەی کە پرۆتستانیزم زۆرینەیە لە پێشکەوتنی ماددیەوە لە پێشترن و ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کە کاسۆلیك کە مەزهەبی زوهد و دوورکەوتنەوە لە دونیا و ئاخیرەتگەرایە و پرۆتستان کە بە پێچەوانەوە مەزهەبی بەشداربوون و خاوەن شت بوون و ماددیگەری ولۆژیکی عەقلّی و رەسەنێتی ژیانی ئەم جیهانەیە لە چارەنووسی ماددی و سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگەدا هۆکارە.

مرۆڤ هەر جۆرێك کە هەیە و هەرچی دەکات و هەر بارودۆخێك کە لە رووی کۆمەڵایەتیەوە هەیەتی و هەرئایندەیەکی هەبێت راستەوخۆ دروستکراوی دەستی خواستنی خودی خۆیەتی و هیچ کەس بە هۆی جەبری ژینگە، جەبری مێژوو و کۆمەڵگە و هۆکاری بۆماوەیی بێبەری نیە، هەربەو جۆرەی کە "سارتەر" پـێ ی وایە ئەو کەسانەش کە لە رووی بۆماوەیی شەل یان بە کوێری لە دایکبوون لە دواکەوتن ولاوازیدا خۆیان بە بەرپرس دەزانێت، چونکە لە نێوان ئەمانەدا کەسایەتیەکان و قارەمانان دەرکەوتوون و ئەمانیش دەتوانن خۆیان قارەمان دروست بکەن.

## رەسەنێتی تاك یان كۆمەڵگە؟

قوتابخانەیەكی دیكە قوتابخانەی مێژووی كۆمەڵناسانە، واتە سۆسیۆلۆژیزم كە تاك بە هیچ نازانێت، تاك بریتیە لە كۆزەیەكی خاڵی كە ڕۆحی كۆمەڵگە پڕی دەكات، كەواتە هەر كەس هەرچی هەیە ئەوە كۆمەڵگە پێ ی داوە، گەر تاوانكارێكی نزم و خراپە، ئەوە كۆمەڵگە تاوان و پیسی تێدا چاندوە و ئەگەر خزمەتگوزاری گەورە و پاك و فیداكارە، ئەو هێلانە كۆمەڵگە لەسەر لاپەڕەی سپی ئەو تاكە ن وسیویەتی. لەبەرئەوە تاك نەك تەنها نە ناشیرین و نە جوان و نە چاك و نە خراپە، بەڵكو بەرپرسیش نیە، بەڵكو كۆمەڵگە دروستی دەكات. لەبەرئەوە تاوەن یان خزمەتكردنی هەموو بۆ كۆمەڵگە دەگەڕێتەوە. ئەو بیرمەندانەی باوەڕیان بە رەسەنێتی كۆمەڵگە هەیە و تاك بە هیچ نازانن جگە لە لاپەڕەیەكی سپی كە كۆمەڵگە پڕی دەكاتەوە.

باسی رەسەنێتی كۆمەڵگە و تاك لە سەدەی نۆزدەهەمدا زۆر بڵاو بوو، باسی گەرمی رۆشنبیرانی سەدەی پێشووتر بوو، لە كۆمەڵناسیی نوێدا ئەم باسە بوونی نیە و جێگەی خۆی داوە بە رەسەنێتی كۆمەڵناسی یان رەسەنێتی دەروونناسی. لە شەڕی نێوان ئەم دووانەدا كۆمەڵناسی زاڵە و تەنانەت بە مافێكی بنەڕەتیش بۆ دەروونناسی قایل نیە.

## رەسەنێتی دەروونناسی یان كۆمەڵناسی؟

ئەمڕۆ دەروونناسی هەموو فەرمانڕەوایەكی تایبەتی خۆی لە تاكدا بەسەر كۆمەڵناسیدا زاڵكردووە و تەنها هزر و مێشك و هەڵچوون بە شتانی تایبەتی تاك دەزانێت كە لە كۆمەڵگەوە وەریاننەگرێت، بەڵام كۆمەڵناسی تەنانەت ئەمانەشی پێ نابەخشێت و باوەڕی وایە كە ئەمانەش لە كۆمەڵگەوە وەردەگرێت.

كۆمەڵێك دەروونناس هەن كە بۆماوە بە دروستكەری چۆنیەتی مرۆڤ دەزانن و بۆ بەرگریكردن لە فەرمانڕەوایی خۆیان لە بەرامبەر سنوربەزاندنی كۆمەڵناسی پشت بە بۆماوە دەبەستن، لەبەرئەوە ئەگەر منی مرۆڤ خراپم یان چاكم، گەر جوان یان ناشیرینم، هەربەو جۆرەی كە رەنگی پێستم چ جۆرێكە ئەوە بەرپرسیاری نیم، رەنگی

رۆح و مرۆڤایەتیشم گەر چاکە یان خراپ ئەوە بەرپرساری نیم، ئەوە لە رێگەی بۆماوەوە بۆم گوازراوەتەوە و دروستبوون و ئەوە من نیم. مرۆڤ هەربەو جۆرەی کە لە رووی قەبارە و کێش و ئەندازە و رەنگ و هەست و دروست بووە و گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئەوە لە رووی رۆحی و ئەخلاقی و فیکری و خاوەنی سروشتی "مرۆیی" دیاریکراوە کە جۆری ئەو مرۆڤە دروست دەکات. سروشت یان ویژدانی مرۆیی(Cosciences یان Nature humaine) کە رادیکاڵەکانی سەدەی نۆزدەهەم پشتیان پێ دەبەست و بوونگەرایی نەفی دەکات، بریتییە لە کۆمەڵێك سیفەت و تایبەتمەندی کە لە پایەی جێگیر و هاوبەشی مرۆڤ و ئەمەش خودی تەقدیری ئەو کەسە دروست دەکات، تەقدیرێك کە ئیرادە ناتوانێت بیگۆڕێت، چونکە ئیرادە و ویستیش لە دایکبووی خودی پایە و جۆری سروشتی ئەو کەسەن. لەبەرئەوە تاك بوونەوەرێکی دروستبوو و دیاریکراوە کە ماهیەتی خۆی لە رێگەی بۆماوەوە وەردەگرێت.

## بێ ئیمانی مرۆڤ لەمەڕ خودی خۆی

من ئەوەم کە بۆماوە و خوێن و نەژادم دروستی کردووە" راسیزم، فاشیزم" من ئەوەم کە ویژدانی شاراوە، گرێ دەروونی و کۆششە بنەڕەتی یان غەریزیەکان بە هۆی هۆکاری پەروەردەیی و دەورووبەر و بۆماوە و فێرییەوە دروستم دەکەن"زانستی سایکۆلۆژی" من ئەوەم کە کۆمەڵگەم دروستی کردووم" زانستی کۆمەڵناسی" من ئەوەم کە بارودۆخی سروشتی و واو هەواو دۆخی جوگرافی پەروەردەم دەکات" سروشتگەرایی و جوگرافی گەرایی" من ئەوەم کە لە کۆتایی مێژوودا شێوەم گرتووە و ئاوێنەی تەواوی رابردووی پێش خۆم و بەرجەستەکراوی تاکەکەسی و مرۆیی مێژووم"هیستۆریزم- مێژووگەرایی" من گیایەکم کە لە زەمینی بارهێنەری فەرهەنگم دا رواوم " کولتورگەرایی"(شپنگلەر) من ئەوەم کە شێوەی کارم، جۆری ئامێرم، وەزیفەی چینی ئابووریم، رۆڵی بەرهەمهێنان و مەرجی ئابووریم دروستی کردووە"ئۆکۆنۆمیزم،

جەبری کار، ڕەسەنێتی ئامراز= "مارکس"یزم و...هتد" و دواجار مـن ئـەوەم کـە خـودا دروستیکردووم و خودا ویستویەتی"قەدەر، مەشییەت".

دەبینین کە لە هەموولایەکەوە ڕێگە گیراوە. هـەمووان بـاس لـە "نـەفیکردنی مـرۆڤ" دەکەن، هەر یەکێك و بە زمانێك قسە لە بەنـدەیی خـودی و ناتوانـایی و بەنـدی ڕەهـا و فیتری مرۆڤ دەکەن. هەموو ئەم قوتابخانە جیاوازانە و تەنانەت دژانەش لە بەکم زانین و کەمکردنەوە ولە ناوچوونی مرۆڤ "بوونی مرۆڤ ، خـودی مـرۆڤ، خودگـەرایی دەگمـەن و باڵای مرۆڤ" هاودەست و هاوداستانن، هەمووان بـەناوی خـودا، مـاددە، کـوفر و ئـایین، فەلـسەفە و زانـست، کۆمەڵناسـی و مێـژوو هەوڵـدەدەنتاکو بیروباوەڕێـك و ئیمـانێکی هاوبەش لە مرۆڤدا دروست بکەن و ئەویش بێباوەڕی و بـێ ئیمـانی مرۆڤـە بەرامبـەر بـە خودی خۆی، تاکو هەموو ئازار و نارەحـەتی و شـکۆی مـرۆڤ کـە خـۆی بـە بـەڕێزترینی دروسـتکراوەکان، مەعـشوقی خـودا، نزیـك و دۆسـتی خـودا، پاشـای بـوون، جێنـشینی زەمین وچاو و چرای نازەنین و فەرماندە و گەورە و ئەربابی جیهان دەزانێـت دەگۆڕێـت بە بەو داستانە حەماسیە پێکەنیناویە کە :

مـن ئـەوەم کـە ڕۆسـتەمی پاڵـەوان هـەیبوو. لـە دۆخێکـی لـەمجۆرە ئیـدی بـۆ مـن چ جیاوازییەك دەکات کە ئەم ڕۆستەمە خودا بێت یـان مێـژوو و جوگرافیـا، یـان کۆمەڵگـە یان ئامێری کار یان غەریزەی جنسی یـان ژێرخـانی ئـابووری؟ بڵندگۆیـەك، دەزگایـەکی رادیۆ، یان ڕاڤەی کەسێکی سیاسی وەکو جەنابی بلور یان سەمفۆنیەکی ژمـارە پێنجـی بتهۆڤن، ئایا دەبێتە هۆی دۆزینەوە یان ونبووی بەها؟ جیاوازی دەکات؟ دەمەوێت بڵێم لـە جـەبردا هـەم بـەها و پلـە و جـۆری بـەهاکان بوونیـان هەیـە. موشـەکێك لەگـەڵ کۆلارەیەکـدا خـاوەنی بەهایـەك نـین، لەگـەڵ ئـەوەی کـە کەسـێك هـەردووکیانی دروستکردووە. لێرەدا نەزانراوی و جیاوازی لەمەڕ چەمك و مانـای"بـەها" یـە، گومـانی تێدا نیەکە بەرد و ئاڵتون، فرۆکەی جیت و کـۆلارە، پەرسـتگا و مەتبـەخ خـاوەنی بـەها گەلی جیاوازن، بەڵام لێرەدا بەها بە پێ ی ئەو بەهرەیەی کە بە مرۆڤە دەگـەیێنن دیاری دەکرێت یان بە پێ ی ئەو کارەی لە دروستکردنیاندا ئەنجامـدراوە و بەهـەر حـاڵ ئـەوە

مرۆڤـه کـه بـههایان پـێ دەبەخـشێت، دیاریـیـان دەکـات، شـتومەکی سروشـتی یـان دەستکردهیچکامیان به خودی خۆیان خاوەنی بەهای زیادە نین، بەڵکو بەهایان گۆڕا و ڕێژەیی و ئیعتیبارییه.

## ڕەسەنێتی ئیرادە لە مرۆڤدا:

بەڵام لێرەدا قسه لەبارەی بەهای مرۆییەوە، واتە، ئەوەی لە مرۆڤدا خـودی پێـوەری بەها و دیاریکردنی بەهایە چ شتێکه؟ لە وشەیەکدا ئیرادە! تـەنها و تـەنها. بیرکردنـەوە ئیش نییە، داهێنانیش نییە، چونکە ئەم دووانە بەبێ ئیرادەی کار ژمێرياريیەکی ئـاڵۆزە و کاری کارگەیەکە.

بەڵام دەبێت بنەمايەك بۆ ناونیشانی بنەڕەتی هەر بیروباوەڕ و قوتابخانەیـەك بـوونی هـەبێت و ئـەویش ئەوەیـە کـە هـەموو بوونـەوەران، وەکـو ئـاژەڵ کـە بوونەوەرێکـە هەوڵدەدات خۆی لەگەڵ سروشتدا هاوڕا و یەکسان بکات و هەر ئەم حاڵـەتی هاوڕابوونـە لەگەڵ سروشتدا کە بوونەوەران دەگەیێنێتە تەواوکاری، ئەگەر ئاژەڵێك نـەتوانێت خـۆی لەگەڵ ژینگەدا هاوڕا بکات لەناو دەچێت، هەموو ئـەو جـۆرە ئاژەڵانـەی کـە لەناوچـوون لەبەرئەوە بووە کە ژینگە گۆڕاوە و ئەمانیش نـەیانتوانیوە گۆڕانکـاری بکـەن و خۆیـان لەگـەڵ ژینگـە و بـارودۆخی نوێـدا هـاوڕا بکـەن و ئیـدی لەناوچـوون. بـەڵام مـرۆڤ بەپێچەوانەی ئەو بوونەوەرەوەیە کە پەیامی ئەوەیە ژینگە و دەورووبەر لەسەر بنـەمای نیاز و ئایدیای خۆیان هاوڕا بکەن و بیگۆڕن، کەواتە مرۆڤ توانایەکی ڕێژەییە.

هەر کەسێك کە لەسەر دوو پێی ڕۆشت لەپی دەسـت و تـەوێڵی مـووی نـەبوو، مـرۆڤ نییـە، بـەڵکو ئـاژەڵێکی گۆيايـە، بـەپێی پێناسـەی ئەرسـتۆ "ئـاژەڵی گۆیـا" ڕاسـتە، هەمووان ئاژەڵی گۆیان، بەڵام هەمووان مرۆڤ نـین. مـرۆڤ بـەو پێـوەرەی کـە توانـای لـە هاوڕابوون یان گۆڕانی دەورو بەری لەگەڵ خۆیدا هەیە، مرۆڤ بەو پێـوەرەی کـە هاوڕایـە لەگـەڵ ژینگـەدا و دروسـتبووی ژینگەیـە، بوونەوەرێکـە لەڕەگـەزی سروشـت، گیـا و گیانەوەر. گیانەوەر و گیا چین؟ بوونەوەرێکی ناخود ئاگا و کەلوپـەلی یـاری سروشـت.

بەلاّم  مرۆڤ هێزێکە لەم سروشتەدا هەرچەندە خۆی لەدایکبووی سروشتە، بەپێچەوانەی ڕێڕەوی سروشتیش ڕێڕەوێکی دیکە ببڕێت. مرۆڤ بوونەوەرێکی ("پرومتە") یيە.

## "پرومتە" کێیە؟

لە داستانی ئەفسانەناسی یۆنـان ئەفسانەی ڕۆم و لـە چیرۆکی دروستبوونی مـرۆڤ لەتورات ولەقورئاندا هەیە(ئادەمیزاد) ێك هەیە و ئەمانە ئەوە دەردەخەن کە هـەموویان چەند ڕاستییەك بوون و تاکە شوێنگەیەکیان هەبووە. بەلاّم بەم جۆرە گۆڕانی بەسـەردا هاتووە لە قورئاندا لە هەمووی ڕوونتر و دیاریکراوتر مـرۆڤ ناسـراوە، لـە ئەفـسانەناسی یۆناندا، "پرومتە" یەکێك لەخوداکانی یۆنانە یەکسانە بە جۆری مرۆڤ، "پرومتـە" (واتـە پێشئاگا، پێشبین ) یەکێك لـەخوداکانی یۆنانـە، ئەمـە نـاوی سیفەتێکە، ئامادەگیـەکی مرۆییـە، بـەلاّم ئـەم سـیفەتە بەرجەسـتەی هێمـاداری پەیـدا کـردووە، ئایدیایەکـە کـە کەسایەتی دیاری وەرگرتووە و بەشێوەی خودایـەکی لێهـاتووە لـە جیهـانی خوداکانـدا، لەگەلّ خوداکانی تردا ولە کەناری خوداوەندی خودا کە زێوسە.

زێوس خودای گەورەیە کە فەرمانڕەوایە لەسەر سروشت یـان هێمـای جیهانـە. مـرۆڤ لەسەر ڕووی زەوییە، ئاگری نییە، نووری نییە، گەرمی نییە، ژیانی تاریکـە، شـەو و ڕۆژ هەمووی شەوە و زستانە ولە زیندانی زەویدا ژیان بەسەر دەبات.

"پرومتە" مـرۆڤ دۆسـتە، خودایـەك هێمـا و ڕەمـزی مـرۆڤ لـە بەرانبـەر زیـۆس خـودای نموونـە و هێمـای سروشـت، "پرومتـە" کـە ئـاگر تـوخمێکی ئاسمانیـە و لەبـەر دەست خوداکاندا بووە، شەوێك کە زیۆس و خوداکان هەموویان خەوتون، لە ئاسمان دەدزرێـت و دەیهێنێـت بـۆ زەوی  و بـە مرۆڤـی دەدات، مـرۆڤ دەبێتـە خـاوەنی ئـاگر، زیـۆس و خوداکان تورە دەبن، "پرومتە" لە کێوەکانی قەوقاز کە لـەوێ  ئـەو سـەرزەمینەیە بـە خەیالّی یۆنانیەکان هیچ کەسی تێدا نییە و ئاژەلّی...

تێدایە، لەوێ زنجیر و کۆت و بەندی دەکـەن دەیکەنـە کـرکس دلّ ڕەق ولـە کێوەکـانی قـەوقاز (هێمـای تـەنیایی: ڕەنجـی گـەورەی مـرۆڤ )، ولـە زنجـیری (هێمـای کـۆت و

بەندایەتی: ڕەنجی گەورەی مرۆڤ) گرفتارە، بەڵام خۆزگە تەنهای تەنها بووایە و کرکس کەم کەم جگەری "پرومتە" بە دەنوکی خۆی لێ دەکاتەوە، تاکو جگەری "پرومتە" تەواو دەبێت و جارێکی دی کرکس دەست پێدەکات بە جوینی خواردن و هەمیشە بەردەوام و چەند بارە دەخوات و جگەری دەردێتەوە تاکو جارێکی دی بیخوات، واتە ئەشکەنجەیەکی هەمیشەیی ناکۆتا. ئەم هێما و سومبولە چیە؟

زیۆس، هێمای یاسا ماددیی و سروشتییەکانە، خودا لەئەفسانەناسی یۆناندا جگە لەو خودایەیە لە بیروباوەڕی ئێمەدا بوونی هەیە کە دروستکەر و بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانە، ویژدانی زەوی و ئاسمان و زەوی و بوونە، ئەو ڕەمز و هێمایەیە، پاشای سروشتە، "پرومتە" هێمای پێش ئاگایی، پێشبینی، عەقڵ و ئیرادەی مرۆڤە و ئاگر هێمایی خود ئاگایی و بینایی و دەسەڵاتی سەروو سروشتی مرۆڤە کە سروشت و زەوی ئەوەیان نییە، کۆی گشتی واتە مرۆڤ بوونەوەرێکە کە دەتوانێت ئەوەی لەسروشتدا هەیە دروستی بکات و دەتوانێت ئەوەی لەسروشتدا نییە – ئاگر– خاوەنی بێت و دەتوانێت ئەوەی بە پێچەوانەی ئەوەی کە سروشت داخوازییەتی بەوجۆرەی کە دەیەوێت دروستی بکات و سروشت ببینێت ولێی تێبگات وبیخاتە ژێر دەستی خۆیەوە. ئەم ئاگری خودئاگا و بینایی مرۆڤە (ئاگر و گەرمی – ئیرادە و نوور – بینایی و ئاگایی) کە هەم خوداییە ( واتە ئەو دیو ماددییە ولەپشت ماددییەوەیە، واتە سروشت هەردووکیانی نییە.)

هەروەها هەم مایەی ڕەنج و ئازاری هەمیشە، تەنیایی و زیندانی و دەستەبەری و ئەشکەنجەی هەتاهەتایی مرۆڤە. جێگەی سەرسوڕمانە! چ دروست و ڕاست و چ پڕ شکۆ، ئەمە چ ئاگرێکە کە هەم مایەی شانازی مرۆڤ و هەم مایەی ڕەنج و ئازارییەتی؟ هەم ئاگر خودایی و ئاسمانییە و هەم هۆکاری غوربەت و زنجیری کرکس؟ ئەمە خودی مرۆڤ بوونی مرۆڤە، بینایی ئاگایی ئادەمیزادە. گەرنا هەر کەسێك ئەم مایەی ئاگایی و خودئاگاییەی زیاتری هەیە خۆی لەم سروشتە ماددییەدا بە ئەسیر ولە نێوان توخمە ماددییەکاندا بێگانە ولەم سروشتە بێ ئاگا و بێ هەست تەنها خۆی دەدۆزێتەوە هەمیشە

ڕەنج و ئازار و دوودڵی لە گەڵدایە. ئازارێك زادەی غوربەتییەتی لەم جیهانە و دوودڵییەك زادەی بەرپرسیاریەتی قورسە لەم ژیانەدا، ئەوەی کە بوونگەرایی و ناوی دوو دڵی ودڵەڕاوکێ ی وجودی لێ دەنێت.

ئاژەڵ و گیا کە لەخەمی زەویدا ( بەدەستەواژەی ئەلفێرد دووبینی لە شیعری موسا)دا قەراری گرتووە ولە بەهەشتدا مەسرەف و بەرپرسیاریەتی و ناخود ئاگایی ئاسان وبێ ئازارە، هەر ئەو جێگەیەی کە سەرەتا جێگای ئادەم بوو. لە چیرۆکی ئادەمیشدا ئەو میوە قەدەغەیە هەر ئەم ئاگرەیە وە شەیتان هەر ئەم "پرومتە" و نزمبوونەوە و دابەزینی ئادەم لەبەهەشتەوە بۆ زەوی ولەخۆشبەختی ونیشتەجێبوونەوە بۆ ڕەنج و ئازار و هەوڵدان و دڵەڕاوکێ هەر ئەم گواستنەوەی جۆری مرۆڤە لە ئارامی و ناخود ئاگایی سەردەمی ئاژەڵی بوو بەرەو دڵە ڕاوکێ و ڕەنج و ئازاری تەنیایی سەردەمی خودئاگایی، لە تەوراتدا بەئاشکرا ولە قورئاندا بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ باسیکراوە کە ئەو میوە قەدەغەیە کە ئادەم خواردی بینایییە و پەیوەندی شەیتانە و هەست و ویژدانی روونە.

ئادەمی بێ ویژدان کە بێتاوانە، کە بوونەوەرێك ونبووی ئیرادە و رووبینین، ئاژەڵ وگیا وبێ گیان کە ناتوانن سەرکەشی بکەن، بەندەی رامکراو و ئارامی سروشت و یاریچی بێ ئیرادەی ژینگە و دەورووبەر، دروستبووی جەبر و ناچار، هەر بەو جۆرەی کە ناتوانێت دروست بکات، ناتوانێت ویرانیش بکات، کەسێك کە ناتوانێت بەرێگادا بڕوات هەرگیز ناکەوێت. شەیتان کە گومڕا دەکات لە بەرانبەر بوونەوەری تەمبەڵ وبێ توانا لەجوڵە، بێ توانایە، مرۆڤە ( ئاسوودە و بێ کە موو کورتییەکان )... کە نە بۆ شەیتان بەکاردێت نە بۆ خواش! چەند زیادن. هەموو مادەی خۆراکی و خەزێنەکانی زەوی حەرام دەکەن و خۆشیان حەرام دەبن. لەوەی کە جەنابی "ریس" پێ ی وتون نوقمی چێژ دەبن، چونکە تەنها لەم حاڵە دایە = تەنها لەبەرئەوەی = کە هەست دەکات (بوونی هەیە) ئەمانە دەرهاویشتەی کات و سەردەمن و ڕووداوی سروشت و

پەروەردەی تەواوکاری ژینگە و دەورووبەر، ئەمانە هەمیشە لە خەتا بێبەرین، چونکە کە هەڵەش دەکەن کەموکوڕی خۆیان نییە.

## مرۆڤ نزیکی خودا

مرۆڤ بوونەوەرێکی نیوە خودا و نیوە شەیتانی خود ئاگا و دروستکەرە. نزیکی ولە هەمانکاتدا لەگەڵ خودادا کە لە مەزهەب باسکراوە لێرەدایە. ڕۆحی خودا کە کراوە بەبەریدا واتا هەر ئەمە([20]). ئەم ڕۆحە، واتە خود ئاگایی و جیهان ئاگایی و ئیرادەی تەگبیری و دروستکردن، لەخودا ڕەها ولە مرۆڤ ڕێژەیی، سنووردار بە ڕێسا و یاسای جەبری زانستی ومەرجدار بەمەرجی ژینگە و سروشت دەبێت. بە هەر حاڵ مرۆڤ واتە: ئیرادەی ئاگا و دروستکەر و داهێنەر. بەرپرسیاریەتی مرۆڤیش لێرەوە دەست پێدەکات. کاتێك دەڵێین (بەرپرسیاریەتی) پێشتر وتومانە (ئیرادە) و کاتێك دەڵێین (ئیرادە) پێشتر وتومانە (ئازادی) و یان بە زاراوەی وردتری فەیلەسوفەکانمان توانای هەڵبژاردن (اختیار). لەبەرئەوە ئەم بنەڕەتە بەڵگەنەویستە نابێت لەبیر بچێتەوە کاتێك قوتابخانەیەك باوەڕی بە(جەبر)ە، هەر جۆرە جەبرێك، جەبری ئیلاهی یان جەبری ماددی، جەبری غەیب یان جەبری دیار، ناتوانێت قسە لەبارەی (بەرپرسیاریەتی) بکات، چونکە گومانی تێدا نییە کە تەنها (ئازاد)، (بەرپرسیار)ە. (ئازاد)یش کەسێکە کە خودی شوێنگەی ئیرادە یان خواستی خۆیەتی، واتە هەڵدەبژێرێت و دەتوانێت شتێك هەڵنەبژێرێت، واتە کرداری هۆکاری جەبری هۆکاری ئەو دیو سروشت یان سروشتی لەدەرەوەی خۆی نییە.

---

١- دەبینین قسەی کەسانێك کە دەڵێن مەزهەب مرۆڤ سووك دەکات"fatalisem" تاکو چ رادەیەك پێچەوانەیە: ئەوەی کە مرۆڤ بە ئاژەڵێکی گویا، ئاژەڵی سروشتی، لە سەدا سەد ماددی و سنووردراو بە مەوداو و چوار چێوەکانی سروشت یان بە ئاژەڵێکی ئابووری یان غەریزی و جنسی دەزانن سووکی دەکەن، یاخود ئەوەی کە لەگەڵ خودا، ئیرادە و هەستی ڕەها، نزیك و جێنشینی ئەو لەسەر رووی زەوی دەزانێت؟

## دوو رێگەی ئیرادە و ناچاری:

لێرەدا لەسەر دوو رێگەیەکی دژوار دەوەستین. ئەگەر هەبێت، واتە مرۆڤ و ئیرادەی مرۆڤ بەزادە و پەروەردەی سنووردار بەهۆکاری سروشت، مێژوو وە نەژاد یان ویستی ئیلاهی بزانین، ئەوە بەوەمان داناوە کە ئازادی نییە و خاڵییە لە ئازادی و ئەمەش واتە کەوتنی مرۆڤ، واتە نەفیکردنی هەموو بەها بنەڕەتییەکان لە مرۆڤدا ونەفیکردنی هەر جۆرە بەرپرسیاریەتیەکی و پاشان هەموو شتێك، ناشیرینی و جوانی، خزمەت و خیانەت، خراپ و چاك، نزم و بالآ، دارِوخانو پێشکەوتن، جاسوسی و هەوڵ و تێکۆشان، هەمووی دەبێتە تایبەتمەندی فیزیاوی و کیمیایی  کە ناوی مرۆڤە، واتە هیچ. مرۆڤەکان دەبنە قەیسی، لێرەدا دەڕوێنرین، دانەی کاڵ دەڕوێن ولەشوێنێکی تر دانەی شیرین. "ئەسپارتاکوس" کە دژی بەندایەتی سەرکەشی کرد ئەم (سەرکەشییە) وەکو کوڵانی ئاو لەسەر ئاگر، سیفەتی سروشتی سەرکەشی کرد، چونکە سەرکەش دروست کرابوو و سەرکەشی نەکات، سەرکەشی لەرۆحیدا هەروەك رەپێست  کە چاوی هەبوو، ئاگری دەکردەوە تاکو چێژی لێوەر بگرێت و ئەو کەسە بوزاییە کە ئاگری لەخۆی بەردەدا تاکو شارەکەی لە ئاگر رزگاری بێت، هەردووکیان بەهەمان ئەندازە بەرپرسیاری کاری خۆیان بوون ئەو ئاگرەی کە ئەو شارەی سوتاند یان ئەم مرۆڤە.

دەبینین باوەڕبوون بەجەبر واتە باوەڕنەبوون بە مرۆڤ، واتە بەگوتەی گوریچ جۆرێك بێ غیرەتی و تەمبەڵی و بەگوتەی خۆمان جۆرێك وازهێنان لەخود و نە بە ئیرادەی ئازاد و بەرپرسیاری مرۆیی لە باوەڕبوون بەدروستکردنی چارەنووسی خود بوون، بەڵکو باوەڕبوون (بەوەی کە لە ناو چاواندا پێشتر نووسراوە و تەسلیم بوون پێی) و باسکردن لەوەی کە کە ن وسەری مێژوو بوو یان ئامێری کار یان سروشت و یان جوگرافیا و یان کرام الکاتبین بابەتێکی دواترە و بەهەرحاڵ بێهودە.

لەلایەکی ترەوە، ئەگەر رازیبین بەئیرادەیەکی سەربەخۆ لە ژینگە بۆ مرۆڤ، ئەوا (بەها و رەسەنێتی مرۆڤ) مان پاراستووە، بەڵام باوەڕمان بە جۆرێك لەمیتافیزیك

هێنــاوە. زانــستمان بەهەنــد وەرنــەگرتووە و تەنانــەت واقعییەتــە دیــار و هەســت پێکراوەکانیش چۆن دەتوانین لەم جیهانەی سروشتدا کە هەموو شتێك بەزنجیری هۆکار بەستراوەتەوە و هیچ جوڵەیەك وحاڵەتێك و دیاردەیەك بەشێوەیەکی سەربەخۆ ناتوانێت بوونی هەبێت بەشێوەیەکی ئاراوتە "استثناء"ی شتێکمان بەناوی ئیرادە لـەم زنجیرە گشتییەدا بە ئازادی بزانین و لە هەر جوڵەیەکی و شتەکانی دیکەی سەربەخۆ بژمێرین و بڵێین بڕیار دەدات بەبێ ئەوەی ئەم بڕیاردانە هۆکارێك یان چەند هۆیـەك بێـت، بڕیـاری داوە دڵـی دەخوازێـت و دەیتـوانی بڕیـار نـەدات، دەیتـوانی بڕیـارێکی دیکـە بـدات. لەبەرئەوە ئیرادە دەبێت (هۆکاری یەکەم) بێت، خودی (هـۆی هۆکـار بێـت، هۆکارێکـت کە هۆکاری هیچ هۆیەك پێشتر نییە، واتە باوەڕ بوون بە واقیعییـەت و دۆزینـەوەی ئـەو واقعییەتەی کە لەخودا لە هزرماندایە. بەپێی ئەم تێڕوانینە، مرۆڤ خودی هـی خۆیـەتی، واتە مرۆڤ خودایە، یانی (سەرەتایە).

لەلایەکی دیکەوە دەزانـین کـە مـرۆڤ خـودی دیاردەیـەکی سروشـتییە، زادەی هۆکـاری ماددییە، لەسەر زەوی رواوە و سەدەها بەشی هۆکاری زانستی بەم زەمینەوە هەر بەم سروشـتە ماددییـە پەیوەسـت بـووە، کـەمترین گۆڕانێـك لـە ئـاو و هـەوا و خـۆراك و خواردنەوە، فیکر و حاڵ و ڕەفتاری دەگۆڕێـت، کـەمێك ئـاوی سـارد دەگرێـت، جیهـانی ڕۆشن دەبێتـەوە، پێچێك لەگەدەیـدا دروسـت دەبێـت، دووچـاری نائومێـدی فەلـسەفی دەبێت! بوونەوەرێکی لەم جۆرە ئیرادەی تاك و ئازاد لەزنجیر و سەربەخۆ لـە سروشـت و هۆکاری سەرەتا و سەرەتای هۆکار؟

لە سروشتێکدا کە لێکنانی چاوێك کاریگەری لە جوڵەی ئۆتۆمبێلەکاندا دروست دەکات، ئیرادە چۆن دەتوانێت لە هەموو هۆکار و هۆی سروشـتی دوور بێـت ولـە جیهانێکدا کـە هەموو هۆکارێك خودی هۆیە؛ چۆن ئیرادە دەتوانێت بەدڵی خۆی بـژی؟ وێنایـەکی لـەم جۆرە کاتێك مومکینە ئیرادەی مرۆڤ لە ڕەگەزی ئەم جیهانە نەزانین و هەروەك حەکیم و عاریفـە پێـشینەکان بـەنووری ئیلاهـی و تـوخمی مەلـەکوتی بـژمێرین کـە لـە جیهـانی سەرەوە کەوتۆتە ئەم دونیای هۆ و هۆکار و بەکورتی هەمان وتەی"حافیز" کە دەڵێت :

من ملك بودم و فيردوس برين جايم بود
أدم اورد در ايـــــــن دير خراب ابــادم

واته: (من پاشا بووم و فیردەوسی پـان و بـەرین جێگـام بـوو، ئـادەم مـن هێنایـە ئـەم سەرزەمینی خەراباتە). هەروەها باوەڕیوون بەمە کە (من) واتە هەمان شـوێنگەی ئـازاد و ئەودیو ماددی کە خۆی کار دەکات و هەڵدەبژێرێت و بوکێکی تاك و ئەو دیو سروشتی نادیارە. جگە لەمە چارەیەکی دیکەمان نییە و هەر ئەم پێویستیەیە کـە لەئەپیکۆرەوە تاکو "سارتەر"، تەنانەت ماددیگەڕانیش کە نەیان ویستووە بەها و مـاددی بـە ونکـەری بەرپرسیاریەتی و ئیرادەی بزانن، ناچار دووچاری ئایدیبالیزمی میتـافیزیکی بـوون: هـەر چەندە خۆبەخۆ بەپێـچەوانەی جیهـانبینی مـاددی خۆیـان بـە( ئیـستثنایەکی نامـاددی لـەبارەی مرۆڤـەوە قایـل بـوون ولایـەنێکی ناسروشـتی یـان سروشـتیان بەسـەردا سـەپاندووە. "ئـەپیکۆر" کـە خـۆی بنیاتنـەری "ئـەپیکۆریزم"ە ولـەژێر کاریگـەری "لوسـیب" بـاوەڕی بەرەسـەنێتی گەردیلـە ( ئـەتۆنیزم)ە لەجیهانـدا ئینکـاری رۆح و جیهانەکەی دیکەی کردووە. دەڵێت:( مرۆڤیش ماددەیە و رۆحیش ماددەیە ولەگەردیلـە پێکهاتووە و بەمەرگی جەستە لـەناو ناچێت، بـەڵام مـرۆڤ تاکولـە کۆمەڵـە گەردیلەیـەك پێکهات و گیانی ماددی وەرگرت، رووناکیەك لە ئاسمانـەوە دێت و مـاڵی تێـدا دروست دەکـات و لەگەڵیدایـە و هـەر کـە مـرۆڤ مـرد و رۆحیـشی لـەناو چـوو، ئـەو رووناکیـەش بۆئاسمان دەگەڕێتەوە !.)

رێکەوت نیـە "سـارتەر"یـش کـە گـەورەترین ماددیگـەرا و دیـالیکتیکی هاوچـەرخە و ئینکاری خودا و بان سروشتە، ناچار دەبێت مرۆڤ لە بنەڕەتدا بە شتێکی جیا دەرببڕێت و بڵێت هەموو دیاردەکانی سروشت، چیەتیان(essence) لە پێشترە وەك لـە بوونیـان (Existence) جگـە لـە مـرۆڤ کـە بـە پێـچەوانەیە بـوونی لەچـیەتی"ماهیـەت" لـە پێشترە !

ئەمە خودی جۆری میکافیزیك نیە؟ بەزاراوە "راکردن" لە "هۆکار" نیە؟ نایەوێت مرۆڤ لە زنجیری هۆکار و جەبری سروشت جیابکاتەوە و بۆ مرۆڤ خودێکی نادیار و بان سروشت رازی بێت؟ کاتێك "سارتەر" دەڵێت: (من هەڵدەبژێرم ولە هەڵبژاردنی خۆشم ئازادم.)

(هەرچەندە منی ئەم هەڵبژاردەی ئازادە لە چوار دیواری چوار دۆخ "Situation"سنوردار بێت.) ئەم (من)ە، توخمێکی ئیلاهی لە دەرەوەی سروشت بەدەستەواژەی هۆکاری بێ هۆکار و (لم یولد) ی نەژماردووە؟ بۆچی؟ مرۆڤگەرایی "رەسەنێتی مرۆڤ" ئەگەر لە ئاستی کۆششی غەریزی زیاتر بڕوات ولەو جۆرە خودسەنتەرییە (Egocentrisme) خۆویستانە و بێ بنەمای یۆنانی کۆن و هەندێك لە رادیکاڵە نوێیەکانی کۆتایی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدە، قوڵتر و ریشەدارتر بێت و نە بە خودپەرستی جۆری مرۆیی، بەڵکو بەسەر (بەها) باڵاکان و بەچێژەکانی مرۆڤ بەهێزتر بێت، بەویست یان بێ ویست بە بنەڕەتی مرۆڤ بەرەو "ئاراوتەیەك- استثناء- لە جیهاندا" دەگۆرێت.

ئەم پێویستیەی بیروباوەڕ تەنانەت مرۆڤێکی وەکو جورج پولیتزەر (G.politzer) بوونیادنەری زانکۆی کرێکاری فەرەنسا و نووسەری (بنەماکانی پێشەکی فەلسەفە) کە لە رێبەرانی فیکری ماددیگەری دیالیکتیك و کەسە دیار و بەناوبانگەکانی "مارکس"یزمە وای لێکردووە کە بەم دژایەتیە یان بینینی دژایەتیە لە مرۆڤدا دووچار ببێت کە: (ئێمە "مارکس"یەکان لە کرداردا ماددیگەراین، بەڵام لە ئەخلاقدا ئایدیالین.) ئەمە بەو مانایە نیە کە: (مرۆڤ ماددەیەکی ناماددیە؟) بۆچی پولیتزەر ناچار دەبێت باجی لەم جۆرە بە ئایدیالیزم بدات؟ چونکە دەبینێت کە (مرۆڤ ئاژەڵێکە ژیانی لە پێناو ژیانی ئەوانی تردا بەخت دەکات.) ئەمە دیاردەیەکی سەرسوڕهێنەر و نهێنی ئامێزە کە لە چوارچێوەی هۆکاری ماددی و رەسەنێتی ئابووریدا ناگونجێت.

کەواتە چ شتێك ئەنجام بدرێت؟ واتە دەبێت چۆن بیر بکرێتەوە؟ ئایا مرۆڤ لە هەموو هۆکار و هۆی ئەم جیهانە رووت بکەینەوە و ئازار و سەربەخۆی بزانین و پاشان خۆمان

بدەینە دەست جۆرێك قەزاو قەدەری غەیبی و نادیار و فاتیحەی بەرپرسیاریەتی و ئازادی مرۆڤ کە هەموو مرۆڤایەتیە، بخوێنینەوە و تەنها ئاژەڵێکی ئاڵۆزتر و ئامێری بەنرختری بزانین لە دەستی ئەویتر یان ئەوانی تردا؟ ئەڵقەی ئاڵتونی لە زنجیری هەتاهەتایی هۆ و هۆکار، واتە جەبر؟

ئێستا گەیشتینە خاڵی لوتکەی بابەتەکە، دژواری و ئاڵۆزی باسەکە ئێستا روونترە. ئەگەر دەبینیت تاکو ئێستا شتێك کە لەم کۆنفرانسەدا وەرگرتووە و ئەویش گێژی و نەزانراویە و کێشەدارتربوون ونەزانراوی بوونی بابەت و داوەریتان ئەوەیە کە کێشە یەکێك بوو و ئێستا بوونەتە دە کێشە، من دڵنیا دەبم کە تاکو ئێرە سەرکەوتوو بووم و بابەتەکەم بەو جۆرەکە دەیویست خراوەتە روو و رێرەوی بڕیوە کە تەرحی زانستی و شوێنکەوتنی بێ ڕق و کینەی حەقیقەت داخوازیەتی. چونکە ئێمە هەمیشە عادەتمان وایە کە بابەتێکی زانستی جۆرێك بخەینە روو کە بتوانرێ بەسادەیی شیکار بکرێت و شێوەی بابەتەکە بەجۆرێك بنووسین کە ئەو وەڵامەی دەمانەوێت بە ئاسانی دەستمان بکەوێت.

ئەمە کاری بانگخوازێکە، کەسێك کە پێش داوەری هەیە و پێش لێکۆڵینەوەی بابەتەکان و گەڕان بەدوای حەقیقەت خۆی والێکردووە کە بگاتە ئەو ئەنجامەی هەمووان پەسەندی دەکەن. مرۆڤێکی لەم جۆرە وەکو کەسێك وایە کە لەبەردەم کۆمەڵێکدا و بەهەڵەداوان بەدوای شتێکدا دەگەڕێت کە جێگەکەی دەزانێت، لێرە ولەوێ لەخۆیەوە دەگەڕێت، پشتی ئەم دیوار و ئەو دیوار، ژێری ئەم درەختە و سەربان، زۆر بەجدی و بەپاکی دەگەڕێت ولەناکاو چاوی دەکەوێت بەهەمان ئەو شتەی کەخۆی پێشتر لەهەمان جێگادا شاردبوویەوە، ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە خەڵەتێنەرە، ئەزۆکە، ئەمە کە ئێمە ئەم هەموو زانا ولێکۆڵەرەوەمان هەیە و هەمیشە لێکۆڵینەوەیان بەرێکەوت بەهەمان حەقیقەت دەگات کە هەموان خۆشیان دەوێت، هەمان ئەو شتە پیشان دەدەن کە هەمووان دەیزانن وە یان دەیانویست.

دەبینین هەمیشە زانایان ولێکۆڵەرەوانی مەزهەبی بەئەنجام گەلێك دەگەن کەخەڵکی نەزان چەندین سەدەیە کاری پێ دەکەن. هەمیشە لە پێشبڕکێی دوو گۆرەپانیان بەبێ ئەوەی جورئەتی ئەوەیان هەبێت سەیری راست و چەپیان بکەن دەگەنە کۆتایی ئەو هێڵەی کە تەماشاکەران بەچاوەڕوانی وەستاون و وەرزشکارانیان هان دەدەن. پاڵەوان کەسێکە کە ئەو هێڵەی بۆی دیاریکراوە خێراتر ببڕێت. ئەمەیە کە لە نێوان رێگای دوودڵی و گومان و تێڕامان، جگە لەوەی کە لێکۆڵەر وەرزشکار بخاتە پشت خۆیەوە و ببێتە هۆی نیگەرانی سەیرکەران و ئەندامانی یاریگا، هیچ بەرهەمێکی نیە.

بەرپرسیاریەتی مرۆڤ لێرەوە دەست پێدەکات، ئەو باوەڕەی من بە فەلسەفەی جەبری مێژوو هەمە، ئەو باوەڕەی کە کۆمەڵناسانو قوتابخانەی سۆسیۆلیزم (رەسەنێتی کۆمەڵگە و رەسەنێتی کۆمەڵناسی) هەمە و ئەو باوەڕەی بە ژینگە واتە بەرمەبنای زانستەکان و بە کاریگەری ژینگەی جوگرافی و شێوەی ماددی بەسەر مرۆڤدا هەمە، لەگەڵ ئەوەشدا هاوڕا لەگەڵ سروشتگەرایی، واتە باوەڕبوون بەوەی کە (مرۆڤ لەسروشتدا دەژی ولەژێر کاریگەری سروشتدایە.) هەروەها باوەڕبوون بەرەسەنێتی مێژوو، واتە (مێژوو تەنها مرۆڤ دروست دەکات و مرۆڤ هیچ نیە جگە ئەو مێژووەی کە دروستی کردووە.) تەنانەت ڕەسەنێتی ئابووری و شێوەی کاریشم قبوڵە و باوەڕم وایە مرۆڤ لەژێر کاریگەری شێوەی کارەکەیدا دروست دەبێت و تەنانەت باوەڕم وایە کە ئابووری لە ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤدا، هۆکاری کاریگەر یان کاریگەرترین هۆکارە. ئەمە رووی پەیوەندی من لەگەڵ ئەم قوتابخانانە و تەنانەت قوتابخانەکانی "هیگڵ"یش، کە باوەڕی وایە جیاوازی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا لە ئیرادە و دەسەڵات و دروستکردندایە([21]).

---

١- من (لەناوەڕۆکدا) هاوڕای هیگڵم، جیاوازی (من ئەو تەنها) لەدەربڕیندایە، باوەڕی من لە ئایندەدا ئیرادەی خودا هەرچی زیاتر لەمرۆڤدا دەردەکەوێ وبەباوەڕی ئەو مرۆڤ بەرۆحی رەها دەکات و دەگەڕێتەوە.

بەڵام باسێکی دیکە بوونی هەیە ئەویش ئەوەیە لە هەموو ئەمانەدا لەبەرئەوەی واقیعیەت بەمجۆرەیە، لەبەرئەوەی دەبینین ئەو کۆمەڵگەیەی لەبیابانێکی ئەفریقیادا دەژین، کۆمەڵگەیەك لەهەلومەرج و بارودۆخی جوگرافی سەخت و قورس یان ئاسان دەژین، ئەم کۆمەڵگەیە کوێستانی یان بیابانی بێت لە ڕووی دۆخی شوێنی جوگرافیەکەی، دۆخی ئاوەدانی، دۆخی بەرهەمهێنانی خۆراکی، دۆخی پێستی لەشی، ئەندامەکانی، نەژادی، بۆماوەیی، زمانی – هەموویان گۆڕانیان بەسەردا دێت، لەبەرئەوە نابێت ئینکاری ئەوە بکەین کە هۆکاری سروشت هۆکارێکی کاریگەر نیە لە پێکهاتەی مرۆڤدا. لەگەڵ ئەوەشدا، لەبەرئەوەی دەزانم کە ئەگەر سەر بە مێژووی رابردووی ئێرانی– ئیسلامی نەبوومایە ولە کۆتایی مێژووی یۆنان یان ئەورووپای رۆژئاوادا بووم، ئیدی تێڕوانینێکی تر و هەستێکی ترم هەبوو، ناتوانم ئینکاری ئەوە بکەم کە مێژوو هۆکارێکە لە پێکهاتەی مندا رۆڵی هەبووە و ناتوانم ئینکاری ئەوە بکەم کە جوتیارێك بەخاکەناز کار دەکات، بە تەنهایی کار دەکات لە کێڵگەدا کار دەکات، لەگەڵ کرێکارێکدا کە بە ئۆتۆمبیل کار دەکات، بە پەیوەندی کۆمەڵایەتی تایبەت کار دەکات، لەهەلومەرجی ژیانی نوێ کار دەکات، جیاوازی هەیە و ئەم جیاوازیە لە شێوەی کار و ئامرازی بەرهەمهێنانەوە هاتووە.

لەبەرئەوە من بەم تێڕوانینە بیروباوەڕیەوە لە کۆمەڵناسیدا پەیوەست دەکات و ناتوانم ئینکاری ئەوەبکەم کە کۆمەڵگە بریتیە لە گەورەترین هۆکارێك کەتاك وەك ئاوێنەی وێنا و وێنەگرتن، ئەم بوونەوەرە –کە کۆمەڵگەیە– لە خۆیدا پیشان دەداتەوە و ویژدانی من بریتیە لە ئاوێنەیەك کە کۆمەڵگەکەم و هەموو ئەوکەسانەی پەیوەندیان بەمنەوە هەیە لە خۆیدا پیشانداوە، ئەوەش دەزانم کە زۆرێك لە گۆڕانکارییەکان، لێدان و بەرکەوتنەکان، شەڕەکان، فەلسەفەکان، شۆڕشە مەعنەوییەکان، تەنانەت بە پەیوەندی هۆ و هۆکارییان بە هۆکاری ئابوریەوە هەیە.

باوەڕم بە هەموو ئەمانە هەیە، بەڵام جیاوازی هەیە لە نێوان ئەوەی هەیە – ئەوەی (بەتەواوی و بەشێوە ) تەرح نیە – لەگەڵ ئەوەی دەبێت ببێت. ئەم دوو قۆناغە لە

داستانی دروستبوونی ئادەم لە قورئاندا بە تەواوی روونە و چەند جوانە، مرۆڤ هێما و سومبولی (جۆری مرۆڤ)ە، چیرۆکی ئادەم واتە روونکردنەوەی سیفەتی جۆری مرۆڤ، بەو جۆرەی کە قورئان دەیناسێنێت، لە هەر دارستانێکدا کە لەم چیرۆکەدا هاتووە، روونکردنەوەی چۆنیەتیە کە لەماهیەت وچیەتی ئەم جۆرەی مرۆڤ بەم دیدەوە. بڕۆن سەیری داستانی ئادەم بکەن تاکو ببینن مەزانی و مانای نویێ و وەچ مرۆڤ گەراییەکی سەرسوڕ هێنەر وگەورە وبالأی تێدا شاردراوەتەوە. بوونەوەرێکە کەخوای گەورە لەتوخم دروستی کردوە، سەیریکەن چەند جوانە. (بەجۆرێك) ئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی دیار سەیری بکەین ولێ ی ڕابمێنین، چ شتێکی نادیار دینە دەرەوە و لە بنەڕەتدا ناکرێت مرۆڤ قبولّی بکات و ئەگەر بەشێوەی هەقیقی سەیری بکەین، چەند راست و دروستەو چ شتێکی نادیاروچ کەسێکە کەئێنکاری دەکات؟!

سەرەتا خودای گەورە ویستی جێنشینی لەسەرزەویدا بەشێوەی خۆی دروست بکات (وەك خۆی جێنشینێك لەسەرزەوی دروست بکات) وفریشتەکان هاوار دەکەن.

لەبەرئەوە پەیامی خودایی و وەکو خوایی مرۆڤ، لەم گوتەیەدا خودای گەورە بەتەواوی ئاشکرای دەکات: ﴿وتخلقو باخلاق اللـه﴾ کەدەستوری سەرەکی مرۆڤە ﴿خوو بگرن بەخوی خوداییەوە.﴾ دە چ کەسێك دەتوانێت بەئەخلاقی خودایی، خاوەن ئەخلاق و ئەخلاق خودایی بێت؟ کەسێك کەخاوەنی ئیرادەیەکی لەمجۆرەیە، واتە مرۆڤ بەو پێوەریە تەواوکاریەی کەهەیەتی، دەتوانێت سیفەتی خودایی هەبێت لەسنوری ناخودایدا و ئەو توانامرۆییەی کەهەیەتی، ئەمە مانای تەواوکاریە لە مرۆڤدا.

**بەرپرسیاریەتی مرۆڤ:**

بەرپرسیاریەتی مرۆڤ لێرەدا دروست دەبێت، هەڵبەتە نەك ئەو بەرپرسیاریەتەی کە"سارتەر" ناوی بوون سانس(Bonseus)([22]) ی لێدەنێت، کەهیچ شتێك نیە. ("سارتەر") دەڵێت: تۆبەرپرس ولێپرسراوی.من لێپرسراوی چ کەسێکم؟ "بەرپرسیاری نیەت چاکی (حسن نیت) خۆتی". نیاز چاکی مانای چیە؟ کاتێك پێوەر نەبوو وهیچ شتێك بوونی نەبوو ونەدونیا، نەزەوی ونەئاسمان مانایان نەبوو،هەست وویژدان وئەقڵیان نەبوو و تەنانەت مرۆڤ چۆنیەتیەکی تایبەتی نەبوو و تەنانەت دیارنەبوو کە دەبێت چۆن بێت – واتە دیارو زانراوە کەدیارنیە دەبێت چۆن بێت ! و(مرۆڤ)یش هەرجۆرێك دەیەوێت، دەتوانێت خۆی دروست بکات، ئیدی دەبێت چ کەسێك چاکەو خراپە (حسن وقبح) دیاری بکات؟ خۆم دیاری دەکەم وهەئەم ناوی چاکە (حسن) لێ دەنێم وخۆشت دەڵێ ی مافی ئەوەت نیە رەخنەم لێبگری ! چونکە من بەئازادی خۆم ئەم کردارەم هەڵبژاردووە. بەڵام ("سارتەر") دەڵێت : بەرپرساریەتی لەوێوە دەست پێدەکات کە لە بەرئەوەی خۆت ئەم کارەت ئەنجام دا،مومکینە ئەوانی تر لەکردارەکەی تۆوە سەرمەشقی وەربگرن و لەبەرئەوەی خەڵکانی تریش سەرمەشقیان وەرگرت، تۆ توشی دڵە راوکێ ی و وەسواسی دەبیت تاکو باشترین کار ئەنجام بدەیت، چونکە مرۆڤ حەزدەکات هەمیشە هەمووان باشترین کارەکان ئەنجام بدەن. دەڵێم: بەڵێ، بەڵام من لێرەدا هەرگیز حەزناکەم (هەمووان باشترین کار ئەنجام بدەن). بەڵکو حەز دەکەم کە هەمووان خراپترین کار ئەنجام بدەن! کەواتە بەرپرسیاریەتی (چی دەبێت)؟

کاتێك پێغەمبەران هاتن و بەمرۆڤیان ووت ((خودایەك هەیەولەرەگی بنا گوێتان نزیکترە لەخۆتان، چارەنووسی زانستی لە دەستدایە، سەیری هەموو کردەوەکانتان دەکات پاداشت دەداتەوەو ئاگرێکی لەو جۆرە و بەهەشتێکی لەو جۆرە لەچاوەروانی خراپە یان چاکەی ئێوەیە)) و هەموو خەڵکی باوەریان بەچاودێری خوداو دەسەڵاتی

---

[22]– بەمانای نیەت چاکی "حسن نیت"

هەبوو و باوەڕیان بەپاداشتی چاکەو خراپە هەبوو و بینیمان چۆن بەرپرسیاریەتی خۆیان ئەنجام دەدەن !ئەو کاتە ئەگەر والە مرۆڤ بکەین کە" نەخودا هەیە، نە بەهەشت هەیە، نەپاداشت هەیە، نە لێپرسینەوە هەیە، نەپێوەر هەیەو نە لە بنەڕەتدا ولەو سەرەوە کەسێك هەیە کە دیاری بکات نەئەوانی ترلە بنەڕەتدا پێوەرێکیان هەیەو نەخشەیەکیان دەبێت کە لەسەری بڕۆین و خۆمان دروست بکەین و من دەمێنمەوە و ویستی خۆم وئیدی هیچ، لەدونیایەکدا کەبێ ویژدانی و بێ هەستی ڕەها فەرمان ڕەواییە و بەگوتەی خۆت، هەموو شتێك پوچەو ئاسمان شێە، لێرەدا شێت کەسێکە کەهەست بەپرسیاریەتی دەکات !

من نامەوێت وەکو گوبین و، وەکو پیتری و فەیلەسوفە نەژاد پەرستەکانی سەدەی نۆزدەهەم وبیستەم، نەژادی ئەڵمانیا یان نەژاد ئاریا بەنەژادی گەورەتر بزانم ونە (ناکانم دەڵێم،تاکو ئێستا بەڵێ کان بڵێم، تاکو ئێستا کەهاوڕام، ڕاست و دروستە) وەکو شپینگلەر، فەرهەنگ بەبنەڕەت و بنەمای تەواوکاری وشارستانیەت بزانم و مرۆڤەکان لە قاڵبی فەرهەنگێکدا سنوردار بکەم ونەباوەڕم وایە کە ماددیگەری دەتوانێت هەموو هۆکارە جۆراو جۆرەکان و کۆشش ونیاز و پێداویستیە مرۆییەکان بەدرێژایی مێژوو تاکو ئێستاو بەتایبەت لە ئایندەدا روون بکاتەوەو نەباوەڕیشم وایە کەدڵە ڕاوکێ ودوو دڵی مرۆڤ بەهەبوونی تەواوی پێداویستیەکان بوونی باروودۆخی گونجاوی ژیان ئیدی نامێنێت. باوەڕم وایە کەسادەکردنەوەو گشتگیرکردن وسادەییە کە بڵێین سەرکەشی ودڵە ڕاوکێ ی ئەندێشەی بیرمەندان ولاوانی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا لەچوارچێوەی بابەت و باروودۆخی ئابووریدایە.

باوەڕیشم بەوەنیە ئەگەر بتوانین بۆهەموو چین و توێژەکانی خەڵکی مەرج و باروودۆخی ئابووری فەراهەم بکەین، ئیدی ڕەنج و ئازارمان لە مرۆڤ ودوو دڵی و دڵە ڕاوکێمان لەئەندێشە وەرگرتۆتەوە،هەرچەندە باوەڕم وایە لە کۆمەڵگەیەك ولە کاتێکدا کەبرسیەتی و ئازادی ماددی بوونیان هەیە، هەر ڕۆشنبیرێك کەبیر لەبابەتێکی دیکە دەکاتەوە، ئەوە سەردەم و پەیامی خۆی پشت گوێ خستووە وبرسیەتی یەکەمین

بابەتێکە کە دەبێت چارە سەربکرێت و هۆکاری خراپی ماددی یەکەمین بابەتێکە دەبێت لەنێو ببرێت وە دادپەروەری کۆمەڵایەتی و یەکسانی گشتی ئایدیالی مرۆڤ – ئایدیالی رێژەیی – تەنها هۆکارێکە کە مرۆڤ لەو رێگەیەوە دەبێت رێگەی خۆی (بەرەو تەواوکاری بکاتەوەو فراوانی بکات.)

بەلآم ئەگەر باوەڕم وابێت کە ئەم (یۆتۆپیا)یە، یان کۆمەڵگە بێ توێژو چینە لە ئایندەدا هەیە، هەرچەندە باوەڕم وابێت کەبابەتی جیاوازی و دورکەوتنەوەی چینەکان دەبێت چارەسەربکرێت و بەشداری وخاوەنداری گشتی و یەکسانی هەل و کارەکان دەبێت بۆسوود مەندبوون لە ژیان چارەسەر ببێت و (نەك تەنها دەبێت چارەسەر بکرێت،بەڵکو ئەمە یەکەمین شتە کە دەبێت ببێت ولەپەیامی رۆشنبیریدا لەهەرکۆمەڵگەیەك و هەرکاتێکدا بوونی هەیەو ئەمەش پایەی هەرکردارێکە لەقۆناغی تەواوکاری مێژوو، لە ئایندەدا)، بەلآم (لەهەمان کاتداباوەڕم وایە کە) ئەمەبەناونیشانی کۆتایی وسەری مەنزڵ مەبەستی مرۆڤ نیە، بەڵکو باشتر ژیان، دادپەروەری کۆمەڵایەتی و سوودمەندبوونی گشتی لەسەروەت و توانای مەعنەوی مەرج و یەکەمین پایەی رۆشتنە بۆ ئەو دیو،نەك کۆتایی سەرمەنزڵی ئایدیال و نموونەی کە مرۆڤ ئیدی لەوێدا دەوەستێت، چونکە باوەڕم وایە بەوجۆرەی کەئەزموون پیشانی دەدات تاکی کرێکاریان بێبەش کە بەهۆی کاریگەری گۆڕانی بارودۆخ و ئابووریەکانو کۆمەڵگەیان تاکە وەبەژیانی سوودمەندانە دەگەن، بەلآم لەرووی ئەخلاقیەوە نەك تەنها پێشکەوتنیان بەخۆیانەوە نەبینیوە بەڵکو زۆر داڕوخاون !

ئەو بوژوازە بۆچی ژیانی پارەداری نزم ویەستی هەیەو هونەرو مەعنەویەت و زانست و هەموو شتێکی خۆی داناوە لەپێناو چێژە نزم و غەریزەکانیدا؟ بۆچی هێرش دەکەینە سەر ژیانی بورجوازی؟ ئەگەر ئابووری بەئامانج و مەبەست دابنێین نەك بنەما([22])

---

[22]-منیش قبوڵمە کەبنەڕەتە، بەلآم ئامانج جگە لەبنەڕەت و بنەمایە : بنەما، واتە پایەیەك کەمن لەسەروی ئەو پایەیە. بڕۆمە سەربان، بەلآم ئامانج مانای پشتی سەربانەکە. من (ئابووری)

ئەگەرئابووری بەئامانج بزانین بۆ هەمووان، واتە هەمووان _ کۆمەڵگەکەمان_ پەراپا بورجواز کردووە، واتە توێژێکی پارەدار کەئێستا هێرش دەکەینە سەر ئەخلاقی، خووی، دوونیای و تێروانینی، هەئەم تێروانین و خوودونیاو تێروانینەمان لە ئاستی هەمووان گشتگیر کردووە و ئەمەش ئایدیاڵ نیە، هەرچەندە دەبێت فراوانی بکەین و یەکەمین ئەرك و وەزیفەشمانە.

بەلآم ئەم وەزیفەیە بۆچیە؟ بۆئەوەیە کە لەم رێگەیەوە تەواوکاری مرۆیی درێژ ببێتەوە. کام تەواوکاری مرۆڤ واتە هێزی دەرکەوتنی خودا، هەربەو جۆرەی کە لەدروستبوونی ئادەمدا دەمویست بڵێم. خودای گەورە کاتێك کەویستی مرۆڤ بەشێوەی خۆی وجێنشینی خۆی بەدی بهێنێت چ کارێکی ئەنجام دا؟ لە (حماء مسنون) ماددەکەی هەڵبژارد (حماء مسنون) واتە قوڕی بۆگەن یان گەنیو. دەیەوێت جێنشین بۆخۆی هەڵبژێرێت،ئەمانەتتداری خۆی هەڵبژێرێت دەیەوێت کەسێك بناسێت، بەدی بهێنێت، فریشتەکان دەخاتە کڕنوشەوەبۆی و لەبەردەم مرۆڤدا کڕنوش دەبن، لەنوور ولە ئار دروستی کردوون و پاشان کردیە ئەمانەتدارو جێنشینی خۆی، لەقوڕی گەنیو- حماء مسنون – هەڵدەبژێرێت، ئەم ماددیەی کاتێك تەواو دەبێت ﴿سویته و نفحت فیه من روحی﴾ (پاش ئەوەی ئەم پەیکەرە قوڕینە راست بوویەوە و دروست بوو، لەرۆحی خۆیم کرد بەبەریدا ).

پاشان مرۆڤ دروست بوو، ئەم مرۆڤە مانای چیە؟ واتە بوونەوەرێك کە لەئەو پەڕی کۆتایدا نزمی و گەنین و پیسی کە رەمز و هێماکەی قوڕە – تاکو بەزیادەی بێ کۆتایی گەورەیی و جوانی وجەلال، واتە خوا- رۆحی مرۆڤ – نێوان و ماوەی هەیەولەم ماوەیەشدا، پەیامی مرۆڤ و بەرپرسیاریەتی مرۆڤە. لەم روەوەیە کەدەبینین بەو پێوەرەی کە ئەم قسەیە لێکچونێك لەگەڵ قسەی هیگلدا پەیدا دەکات، باوەڕم پێیەتی

---

بەناونیشانی بنەماو بنەڕەت قبوڵە، بنەمایەك کەدەتوانم لەسەری بگەمە پشتی سەریان، سەربان شتێکی دیکەیە.

نەك بەو جۆرەی کەئەو دیلێت، بەلاَم زمانی هیگل، ئەگەر ئیسلامیزەی بکەین، دروست قسەی ئیسلامە. بەدەستەواژەی کۆمەلَناسی، مرۆڤ بوونەوەرێکە کەئیرادەی خۆی، تواناو دەسەلاَتی دروستکردن و دیاریکردن و هەلَبژاردنی خۆی و بەرپرسیاریەتی خۆی هەیە. بەرپرسیاریەتی لەدایکبووی هەلَبژاردن و ئیرادەی منە، بەوپێوەرەی کە تاك و ئازادی هەیە، توانای هەلَبژاردن و ئیرادەی هەیەولە بەرامبەر سروشتدا لە بەرامبەر دەورو بەرو ژینگەدا، لە بەرامبەر بۆماوە ولە بەرامبەر فێرکردن و پەروەردەدا — لە بەرامبەر هەرشتێك ناخود ئاگا دروستی دەکات — دەتوانێت سەرکەشی بکات، مرۆڤە.

## چوار زیندانی مرۆڤ

ئەم ئازادیەی رۆحە لەکوێدایە؟ لەچوار زیندان ئەوانیش:

١- زیندانی سروشت.

٢- زیندانی مێژوو.

٣- زیندانی کۆمەلگە.

٤- زیندانی خود.

دەبینین کە(یەکەمین زیندان ) واتە سروشت، تاکەکان لەسەر بنەمای مەرج و بارودۆخی خۆی زیندانی دەکات، کەواتە مرۆڤ پابەندە بەیاساو رێسا جەبری یە مەرجە جوگرافیەکان.

مێژوو: بەو جۆرەی کەووتم من وابەستەم بەهەرمێژوو یەك، چۆنیەتی و چیەتیەکەی جیاوازی هەیە، کەواتە لەپێکهاتەی مندا، ئیرادەی من لەزیندانی مێژوودا زیندانیە.

سێیەم، کۆمەلگەیە: بەوپێوەرەی کە کۆمەلگە ناخود ئاگا، بەبێ ئەوەی من بتوانم گۆران و بەشداری تێدا بکەم، دروستم دەکات و منیش ناتوانم کاریگەری و گۆرانێك دروست بکەم، منزیندانی کۆمەلگەم.

زیندانی چوارەم، خود: دەبینین کەسانێك دەتوانن و دەسەلاّتیان هەیە کە لەمێژوو، کۆمەڵگە، چارەنووس و ژیانیان نەك تەنها کاریگەریان هەبێت، بەڵکو دروستی بکەن کە لە چوارەمین زیندان کە بەهێزترین زیندانە، رزگاریان ببێت.

مانای چیە؟ بەچ شێوەیەك دەتوانین لەسێ زیندانی مێژوو و سروشت و کۆمەڵگە بێینە دەرەوە؟ لەزیندانی سروشت دەبینین کەچۆن دێینەدەرەوە. هێزی راکێشان یەکێك لەدیوارەکانی زیندانی سروشت کەهەمیشە بەخۆمانەوە چەسپاندبوونی، ئێمە ئێستا بەهۆی تەکنیکەوە، بەهۆی ناسینی سروشتەوە، دیواری هێزی راکێشانمان لەزەویدا شکاندووە ولەم دیوارەوە دەتوانین ئازاد ببین.

لەباروذۆخی بیاباندا – کەهیچ شتێك بوونی نیە– دەتوانین دەزگای گەورەی پیشەسازی مۆدێرن بەکاربهێنین و شاری گەورە دروست بکەین و هەموو باروذۆخێك کەبیابان – واتە سروشتی بیابان – لە ژیاندا نیەتی یان دژیەتی، دروست بکەین، لەسەرووی ئەوەشەوە سروشت، دەتوانین بەپێچەوانەی ئەوەی کەذۆخی فلاّن گیایان ئاژەڵ داخوازیەتی، رەنگی بگۆرین، جۆری رەگەزەکەی بگۆرین و گۆران لەمیوەکەیدا بکەین و گول ورەنگی و بۆنی گول بگۆرین و تەنانەت پێوەری بەرهەمهێنان کە لەسەر بنەمای یاساو رێسا جەبریەکانی سروشتی دروستکراو ودیاریکراو بگۆرین. بەچ شێوەیەك لەزیندانی سروشت هاتینە دەرەوە و هەر رۆژێك زیاتر دێینە دەرەوە و بەسەر ئەم زیندانەمان و سروشت زاڵ ببین؟ زانست، ناسینی سروشت و زانست و تەکنیك.

بەچ هۆکارێك دەتوانین لەزیندانی مێژوو و کۆمەڵگە بچینە دەرەوە؟ بەو پێوەرەی کەمێژوو دەناسین، یاساو رێسای مێژوو بناسین و بزانین کەجەبری مێژوو مانای چیە ( چونکە ووتم باوەرم بە جەبری مێژوو هەیە )و ئەم شوێنانەی کەمێژوو دیاری کردوون، بناسین، پاشان کەناسیمان دەتوانین رێرەو بگۆرین، دەتوانین لەشوێنێکەوە یان دوو جێگەکە لە بەردەمماندا بروێین، هەڵفرین و بچینە جێگەیەکی تر، چ شتێك بناسین؟

مێژوو، جەبری مێژوو، ڕێڕەوی مێـژوو، ڕێـڕەوی جـەبری کۆمەڵگـەی مرۆیـی بەدرێـژایی مێژوو، ئەمەش بەزانست.

دەتوانین کۆمەڵگەش بخەینـە بـەردەم بڕیـاری خۆمانـەوە، دەشـتەکیەك، بەدروسـتی دروست بووە و دروست بووی ڕۆح کۆمەڵگەی خێڵی خۆیەتی، ناتوانێت تەنها کەمێکیش دژی سەرکەشی بکات. هیچتان بیستووە کەتاکێکی وابەستەبوو بـەخێڵێکی سـەرەتایی دەشتەکی، دژی شـێوەی ژیانیـان، سـوننەتیان، شـێوەی حکومـەت و فـەرمانڕەواییان، بـارودۆخی بەرهـەمهێنانیان سەرکەشـی بکـات، دژی ئـایین و بیروباوەڕیـان سەرکەشـی بکات؟ هـیچ کـات، چـونکە تـاك لەوێـدا دروسـتبووی کوێرو نـاخود ئاگـای کۆمەڵگەیە، ئەم ئەم تاکەی مرۆڤ بەوپێوەرەی کە کۆمەڵگە دەناسێت زانیـاری لـەبارەی کۆمەڵگەو پەیوەندی کۆمەڵایەتی و یاساو ڕێسای کۆمەڵایەتی پەیدا بکات، کۆمەڵگـە زاڵ بێت، ئیدی کۆمەڵگە دروستی ناکات، ئەو کۆمەڵگە دروست دەکات، هەربـەوجۆرەی کـە ئەمڕۆ مرۆڤ دەتوانێت پەیوەندی کۆمەڵایـەتی، قۆنـاغی مێـژووی جـەبری کۆمەڵگەمـەی، شـێوەی ژیـانی، شـێوەی بەرهـەمهێنانی بەزانـست بگۆڕێـت و یاسـاو ڕێـسای زانـستی، پەیوەندی کۆمەڵایـەتی و پەیوەنـدی مـافی کۆمەڵگـە – هـەموویان – بگۆڕێـت. لەسـەر بنەمای زانست سەبارەت بەکۆمەڵگە، ئەمڕۆ دەتـوانین بڕیـار بدەین کەوەچـەی ئاینـدە چۆن دروست بکەین و دەتوانین لەسەر بنەمای ئەوە دروسـتی بکـەین و ئەمـەش ئـەوە پیشان دەدات کەزانـست لەمـەڕ کۆمەڵگەیـە کەئێمـە بەسـەر کۆمەڵگەمانـدا زاڵ بـووین، ئیدی کۆمەڵگە زیندانی ئێمە نیە، ئێمە بەسەر کۆمەڵگەدا زاڵین، کۆمەڵگـە دروسـتکراوی ئێمەیە.

کەواتە مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو و گۆڕانکاریـە مێژووییـەکان، ئـازادی خـۆی لـە زینـدانی سروشت، زیندانی مێژوو و زینـدانی کۆمەڵگـە وردە وردە و قۆنـاغ قۆنـاغ، بـەوپێوەرەی کەزانـستی بەسـەر سروشـت، مێـژوو و کۆمەڵگـە زیـاتر دەبێـت، دەهێنێتـە دەرەوە وە تواناو ئیرادەی کەزیاتر بوو، ئەو پەیام و ویستە ئیلاهیـە کەدروسـتبوونی بوونـەوەرێکی وەك ئەوە دێتە دی.

زینـدانی چـوارەم، خـودە، بەگوتـەی "تـاین بـی"، مێـژوو پیـشانی دەدات کەئـەو پیاوانـەی توانیویانـە بەسـەر خووەکـان، غـەریزەکان، عادەتـەکان، چـێژە خـودی و تاکەکەسیەکان، سەلیقە تاکەکەسیەکان بەسەر و حەزو ئـارەزووە تاکـە کەسـیەکان زاڵ بن و کۆششە تاکەکەسیەکان خۆیان بکوژن ولەجێگەیـدا ئـەو بیروبـاوەڕو ئیمـان بخەنـە جێنشینیان بۆئەوانی ترو کۆمەڵگە، ئەوە توانیویانە سەدەیەك و وەچەیەك و مێژوویـەك بەدی بهێنن، (موسی پێغەمبەری ئیسلام، عیسی، بـوزا)، ( ئەمانـەی گوتـەی تـاین بـی) بن، چ کەسانێکن؟ جیاوازیان لەگەڵ ئەوانی تـردا چـیە؟ جیاوازیـان ئەوەیـە کـە ئەمانـە توانیویانە خۆیان لەزیندانی خودی ماددی و ئاژەڵی خۆیان رزگار بکـەن و خۆیـان ئـازاد بکـەن و هـەر لەبەرئەمەشـە لەسـەرووی خـود بوونـەوە، خـود بـوونێکی دیکـەیان دروستکردووە، خودبوونێك نـە بـاوك و دایـك، نەژینگـەو دەورو بـەر، نەشـار، نەمێـژوو، نەخێزان و نەسروشت دروست بکەن، بەڵکو خۆیان دروستکردووە.

## ڕەنجی فەلسەفی و ڕەنجی ماددی

"ئەمە ئیدی کۆتا ئەنجامگیریە و بەداوای لێبوردنی زۆرەوە." دوو دڵی و دڵـەڕاوکێ و دەردو ڕەنج و ئازادی مرۆییە، دوو جۆر ڕەنج و ئازارە کە نابێت تێکـەڵی یـەکتر بکـرێن: یەکێکیان ڕەنجی ماددی لەنەبوون، نەخواردن و نەپۆشین کەڕەنج و ئازارێکی ئابووریـە، ڕەنجی (نەبوون) خاوەنداریەتی من بۆتێرکردنی غەریزەی سروشتی جەسـتەمە. دەبێـت نان، ئاو، شوێنی نیشتەجێبوون، ژیان و توانای پێشکەوتنم وەکو هەر کەسـێکی دیکـە هەبێت. لەبەرئەوە هەموو قوتابخانە کۆمەڵایەتیەکان کە ڕەسەنێتی ئابووری و یەکسانی گشتی بڵاودەکەنەوە، تەنها دەتوانن وەڵامی ئەم ڕەنجەی مرۆڤ بدەنـەوە و دەبێـت لـەم ڕووەوە ئیمانیان پێ بهێنرێت. لەم ڕووەوە دەبێت هەموو مرۆڤێك هەوڵبدات تـاکو ڕەنجی برسیەتی و هەژاری و بێ بەشبوون لە کۆمەڵگەی مرۆیی کەم بکاتەوە.

بەلاّم ڕەنجی دووەم، ڕەنجی میتافیزیکیە، ڕەنجی فەلسەفی مرۆڤە، هەموو مێژوی مرۆڤایەتی ئەمە دەسەلمێنێت: هەرچین و توێژو تاکێك بەو پێوەرەی کە لە بێ بەشوون، لەدوودلّی و دلّە ڕاوکێ ولەپەرێشانی ماددی بەتالّ دەبێتەوە، پەرێشانی مەعنەوی و فەلسەفی و مرۆیی پردەبێت، بەوپێوەرەی کە ئەم پرسیارانە ( چی بخۆم؟ چ شتێك بپۆشم؟ چی بکەم؟ لەکوێوە پارەم دەست بکەوێت.؟ ) ئیدی ئەمەی بۆ تەرح نیە کە(من چیم؟ بۆچی ژیام؟ بۆچی هاتم؟ ئەم دونیایە چیە؟ خوداکێیە؟ چارەنووس چیە؟ ماناچیە؟ سوودی ژیان چیە؟ دەبێت چۆن بژین؟ ) تەرح دەبن و خۆیان ن ومایان دەکەن. ڕەنجی "سارتەر"و بێگانەیی کامۆ چیە؟ ڕەنجی شەهریار چیە؟ ڕەنجی ئانتیگۆن چیە؟ ڕەنجی "سارتەر" ڕەنجی کێیە؟ ڕەنجی ئوجین یونسکو ڕەنجی کێیە؟ سرینەوەی کافکا بەهۆی چ شتێکەوەیە؟ بۆچی سڕاوەتەوە؟ ڕەنج و دوودلّی مرۆڤی ئەمڕۆ، مرۆڤی بورجوازی ئەمڕۆ، مرۆڤی سەرمایەداری ئەمڕۆ و کۆمەلّگەی سەرمایەداری ئەمڕۆ، ڕەنجی میکافیزیکیە، ڕەنجی پوچیە. ئەگەر "سارتەر"و کامۆ دەلّێن ( من کەوتوومەتە ترسەوە ) لەچ شتێکەوەیە؟ "سارتەر" لەوەی کەبرسیەتی ولەوەی کەژیانی نیە، کەوتۆتە ترسەوە؟!

فەرەنساولاوی فەرەنسا کەئەو هەمووە بەدوای دوو دلّی و دلّە ڕاوکێ و ئانگواسی "سارتەر"یدا دەگەڕێت و هەموو پەرێشا نیە خەرج دەکەن، لەبەر خاتری کەمی و ناتەواوی ماددیە؟ سەرکەشی دژی ماددیە کە (دەبێتە هۆی ئەوەی ) ئەو کە هەموو شتێکی هەیە، ڕابکات و دواتر لە ژیانێکی هیپیدا ژیان بەسەر بەرێت، ئەولە بەرامبەر مەسرەفی بورجوازی و بارودۆخی ژیانی بوجوازی و تەنانەت سەرمایەداری، سەرکەشی دەکات، چ ڕەنجێك ئەوی سەرکەش کردووە؟

ڕەنجی میتا فیزیکی، مانای ژیان، مانای مرۆڤ و مانای بوون. بەلاّم کامۆ بە پوچی دەگات و ڕەنج دەبات، "سارتەر"یش بە پوچی دەگات و ڕەنج دەبات، بەلاّم "سارتەر" دەیەوێت مانایەکی لە خۆوە، خۆی دروست بکات. دەلّێت مرۆڤ پوچە، مێژوو پوچە،

مرۆڤ پوچە، هەموو شتێك بێمانایە، بەڵام دەبێت ئێمە لە خۆمان مانایەکی پێ ببەخشین، تۆ لە کوێوە دەیهێنیت بیهێنە؟!

ژان ئێزولە دەڵێت باوەڕبوون بە عەدالەت و مانا بە هۆی فەیلەسوفێکی بەدبین کە باوەڕی وایە جیهان لەسەر بنەمای هەست و عەدالەت و مانا بەدینەهێنراوە وەکو وەرگرتنی کاسەیەك ئاوی شیرین و سازگارە لە ئۆقیان وسێك لە ژەهر. راستە، مرۆڤ گەر خۆی مانای نیە و پوچە، خاوەنی لێپرسراویش نیە و پوچە. جیهان گەر مانایەکی نیە، مرۆڤیش مانایەکی نیە بە گوتەی دیستۆفیسکی، ئەگەر مانای جیهان واتە خودا لە بوون لا بەرین، هەموو شتێك رێگە پێدراوە و ئەمەش قسەیەکە کە "سارتەر" باوەڕی پێ ی هەیە.

لەبەرئەوە لە هەمانکاتدا کە باوەڕم وایە مێژوو و کۆمەڵگە و سروشت رەسەنێتیان هەی و هۆکاری گەورەن لە پێکهاتەی مرۆڤدا، باوەڕم وایە کە ئەم ئەنجامگیریە دەستەواژەیەك زیاتر نیە، ئەویش ئەوەیە: رەنجی مرۆڤ لەسەرتاوە تاکو ئێستا بە دوو جۆرە بووە، رەنجی ماددی و بۆ بەرکەوتن و دەستکەوتنی هەرچی زیاتر و دابینکردنی عەدالەت و رەنجی فەلسەفی و میتافیزیکی بۆ پەیبردن بە حەقیقەت و مانایەك لەم جیانە و مانای ژیان و چارەنووسی مرۆیی." دونیا پوچە یان نا؟ ئێمە بۆ شتێکین یان نا؟" – ئەم پرسیارانە – رەنجی فەلسەفی و مەعنەوی پیشان دەدەن. دەتوانین رەنجی ئابووری لە مرۆڤدا بە باوەڕبوون بە یەکسانی و عەدالەتی کۆمەڵایەتی و نەبوونی چینایەتی لە نێو بەرین و نەهێڵین، بەڵام رەنجی فەلسەفی دەبێت بە باوەڕبوون بە بە بنەمایەکی مەعنەوی لە بووندا لابەرین تاکو بە پوچی فەلسەفی نەگەین و بۆ بوون بە رۆح، هەست، ئیرادە، هەستکردن و حیسابێك قایل بین تاکو هەست بە بەرپرسیاریەتی بەرامبەر بە خۆمان بکەین و بەرپرس بە پووچی ناگات، مرۆڤی پەیمان بەستوو هەست بە پووچی و بێهودەیی ناگات.

## ئایینی یان زانستی، هۆکاری رزگاری لە زیندانی خود

هەر بەو جۆرەی کە وترا، ئازادی و ئیرادەی مرۆڤ، واتە توانای بەشداری مرۆڤ لە چارەنووسیدا دەتوانرێت بە هێزی زانست- هەرچی زیاتر تەواوکاری دەکات و چوار زیندانەی کە تیایاندا گرفتارە- رزگار بکات و ئیرادەی خۆی کە هۆکار و بەندەیی سروشت و مێژوو و کۆمەڵگە بووە، ئێستا بە هۆی فیکر و تەکنیکەوە بەسەر سروشت و کۆمەڵگە و مێژوودا زاڵ بێت.

بەڵام خود لە چوارەمین زیندان - زیندانی خود- نەك بە زانست - کە بە گوتەی "بیکن" بەسەر سروشتدا توانا پەیدا دەکات- بەڵکو بە باوەڕبوون بە ئایینێکی بان زانستی کە بە گوتەی "تاین بی"، لەسەرووی من و جوڵێنەری تەواوکاری مرۆڤەوەیە دەتوانین رزگار بکەین( تاین بی ئەم قسەیە بە جۆرێکی دی دەکات.)

لەبەرئەوە هەربەو جۆرەی کە من دوو دوودڵی و دڵە راوکێ و نیاز و دەردو ئازاری مرۆڤم باسکرد کە بریتین لەماددی و فەلسەفی و چوار زیندانیشم ژمارد کە سیانیان بە زانست لە ناو دەچن و نامێنن و ئەوی دیکەیان بە ئایین، واتە هەمان ئەو هۆکارەی کە لە زیندانی چوارەم رزگار دەکات و دوودڵی و دڵەراوکێ مان لادەبات و نیازی دووەمینمان دەهێنێتە دی.

**بلێسەی ئیلاهی:**

لە کۆتاییدا رستەیەك لە "تاین بی"([24]) یەوە دەگوازمەوە، مرۆڤ بەم تەواوکاریە بە جێگەیەك دەگات کە بە گوتەی"تاین بی" بلێسەی خودایی هەڵدەکات، نەك هەر مرۆڤێك بەڵکو مرۆڤ هەمیشە لەسەر بنەمای ئەم رێرەوی تەواوکاری پەیدا دەکات و بە تەواوکاری دەگات. مرۆڤی واقیعیش کەسێکە کە هەر هەدوو دووداڵی و دڵەراوکێ - فەلسەفی و ئابووری- وەلآم دابێتەوەو هەم بە ئارامشی ماددی و هەم بە ئارامشی مەعنەوی گەیشتبێت ولە چوار زیندانی خود، مێژوو، کۆمەڵگە و سروشت رزگاری بووبێت. ئیدی ئەو مرۆڤە هاتۆتە دی و ئێمی خەریکی مرۆڤبوونین و ئەمەش مانای مێژووە.

بلێسەی خودایی، هێزی داهێنان و دروستکردنە، واتە نەك ئەوەی کە دروست ببین، بەڵکو دروستبکەین. بەو پێوەرەی کە دروست نابین، دەتوانین دروست بکەین. مرۆڤ تەواوکاری پەیدا دەکات، بلێسەی خودایی هێزی فیتری داهێنانکاری ئیرادەیە لە خودی خۆماندا و ئەگەر ئەو بلێسەیە داگیرسێنین - بەو شێوەیەی کە گوتم- ئیدی جەبرێکی دیکە بوونی نیە، ئیدی بۆ ئەم مرۆڤە جەبرێکی دیکە بوونی نیە، ئەو مرۆڤەی دروستبووی جەبری کۆمەڵگە، جەبری مێژوو و سروشتە وەکو میوەیەك وایە لە تاران دەیچینین بێتام دەردەچێت لەمەشهەد دەیچێنین تامدار و شیرینە.( بلێسە و شوعلەی خودایی هێزی فیتری داهێنانکاری مرۆڤە لە خودی خۆماندا و ئەگەر رۆشنی بکەینەوە

---

[24] - جوان وردببنەوە ئەو گەورەترین مێژوونووسی ئەمڕۆیە، گەرچی هیچ بەڵگەیەك نیە لەمەڕ ئەوەی ئەو باوەڕی بە هەر شتێك هەبێت منیش باوەڕم پێ ی بێت! زۆرێك باوەڕیان وایە کە لە مێژوودا مێژوونوسێك وەکو ئەو نەهاتووە، کتێبێکی بەناوی "لێکۆڵینەوەی مێژوو" هەیە کە لە (١٣) سیانزە بەرگ پێکهاتووە و (٢٧) جۆر شارستانیەتی لە مێژوودا کەشفکردووە، هەندێك باوەڕیان وایە کە پاش ئیبن خەلدوون مێژوونوسێکی گەورەتری وەکو تاین بی بوونی نیە، هەرچەندە لەبارەی هەندێ شتیەوە لەگەڵیدا هاوڕانین.

تەنانەت ئەستێرەکانیش ناتوانن کۆشش و هەوڵمان بۆ گەیشتن بە ئامانجی تەواوکاری مرۆیی رابگرن.)

"یوشع" پێغەمبەر رابەری نەتەوەکەی خۆی بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن رێبەری ئەسیرەکانی میسری گرتبوو وە بۆ گەڕانەوە و دەستکەوتنی بیت المقدس ئامادە کردبوو، بە سەربازەکانی خۆی وت: "پێش ئەوەی خۆرئاوا ببێت شار فەتح دەکەین"بەلآم خۆر بە ئێوارە گەیشتبوو و هێشتاش سەربازەکانی شەڕیان دەکرد و هیچ هەواڵێك لەسەرکەوتن نەبوو. "یوشیع" فەرمانی دا بە خۆر "بوەستە" خۆریش وەستا بە فەرمانی ئەم رابەرە تاکو شار بە دەستی تێکۆشەران رزگاری بوو، پاشان خۆر ئاوا بوو.

هاوشێوەی ئەم گوتەیە "ترۆتسکی" وتویەتی: ئەگەر خۆر بە پێ ی ویست و مەبەستی ئێمە نەسوڕێت، ئەوا خۆر دەخەینە ژێرەوە([25])

مێژوو جەبری خۆی هەیە، بەلآم تۆ ئەی مرۆڤ لە نێوان ئەم جەبرەدا بەرپرسیاریەتی دروستکردنی چارەنووسی خۆت هەیە، چونکە هەر کەس لە کۆمەڵی دەستکەوتی خۆیەتی و چارەنووسی کۆتایی ئەو رۆژێکە کە مرۆڤ ئەو شتەی کە بە دوو دەستەکانی خۆی دروستیکردووە بە دوو چاوی خۆی دەیبینێت.

## بوونگەرایی "ئیگزیستانسیالیزم"

قسەکردن لەبارەی "سارتەر" و ناسینی ئەو قوتابخانەیەی کە لەسەدەی بیستەمدا رایگەیاند و بەهەق یان ناهەق کاریگەرییەکی قوڵ و گەورەی لە رۆژهەلآت و رۆژئاوادا و بە تایبەت لە وەچەی نوێدا داناوە، شتێکی ئاسان نیە، چونکە یەکێك لە

---

[25] - هاوشێوەی ئەو قسەیەی سەرەوە لە م.ا.١٧٠، ص ٢٥٢ لە گوتەی هیتلەر هاتووە کە لە هەمان جێگەدا ئەم گوتەیە بەم شێوەیە هاتووە: ( گەر خۆر بە پێ مەرامی ئێمە نە سوڕێتەوە، بە چۆکیدا دەهێنین.)

تایبەتمەندییەکانی "سارتەر" چەند لایەنبوونی قوتابخانەکەی و چەند لایەنی کەسێتی خودی "سارتەر"ە.

"سارتەر" هەم فەیلەسوف و هەم کۆمەڵناسێك و هەم پیاوێکی شانۆنووس و ئەدیب و نووسەرە. لەبەرئەوە دەبینین کە ناسین و ناساندنی لەم سێ بوارەدا لە دانیشتنێکدا کارێکی ئاسان نیە، کەسایەتی شانۆیی و هونەری "سارتەر" لەگەڵ کەسایەتی فەلسەفی ئەو بە تەواوی جیان، گەرچی هەردوکیان خاوەن رێگەیەك و ئاراستەیەکن.

هەر بەو جۆرەی کە ووتویانە بوونگەرایی قوتابخانەیەکی زۆر دیار و پڕ لە لایەنگرە لە جیهانی ئەمڕۆدا و رەنگە بوترێت کە نوێترین و دیارترین قوتابخانەیەکە کە لە سەدەی(١٩) و(٢٠) دا راگەێنراوە و ئەگەر نەڵێین هەموو قوتابخانە فەلسەفیەکانی سەدەی سەدەی (١٩) ی خستۆتە لاوە. بەلایەنی کەمەوە دەبێت بوترێ کە لە بەرامبەریاندا وەستاوە و بەرامبەرکێ دەکات. ناسینی "سارتەر" زیاتر لە رووی فەلسەفی و مرۆڤناسیەوە و بەتایبەت گرنگترین لایەنی لە هەر قوتابخانەیەکی فەلسەفیدا ([26]) واتە ئەخلاق (ئیدارەی ژیانی مرۆڤ، ماناداران بە ژیانی مرۆڤ و بە خودی مرۆڤ وابەستەیە و منیش زیاتر پشت بەم لایەنە دەبەستم.

## لێڵی لە ناسینی مەکتەبی "سارتەر"

لە ووڵاتی ئێمەدا ناسینی قوتابخانەی "سارتەر" وەکو هەر قوتابخانەیەك و تیۆریایەکی دیکە کە لە ئەورووپادا – لە هەر رەنگ ولایەنێك – رادەگەێنرێت و باس دەکرێت، رووکەشی و گشتی ولێڵ و نادیارە([27]) چونکە تەواوی ناسینی ئێمە پشت بە وەرگێرانەکان دەبەستێت و ئەم وەرگێرانانەش زۆرجار لە لایەن کەسانێکەوە ئەنجام

---

[26]– بە تایبەت قوتابخانەکانی پاش رێنیسانس، کە دەیانەوێت پەیامی مەزبیشیان لە ئەستۆدا بێت.

[27]– هەڵبەتە ئەم گوتانە بۆ دونیای رۆشنبیری کوردی ئێمەش راستن."و.کوردی"

دەدرێن کە تەنها زمانێکی بێگانە دەزانن و وادەزانن کە زانینی زمان بۆ وەرگێڕانی هەر بەرهەمێك بۆ زمانی دایك ئیدی بەسە، لە کاتێکدا کە ناسینی قوتابخانەیەکی فەلسەفی زیاتر لە ناسینی زمانە و هەر کەسێك عەرەبی دەزانێت ناتوانێت ئیبن سینا بناسێت و هەر کەسێك فارسی بزانێت ناتوانێت هەموو ئاستێکی خوێندن بخوێنێت و هەموو کتێبێك و نووسینێك بزانێت! هەر ئەم وەرگێڕانانە کەهەم زۆرجار ناتەواو و هەم زۆرجار لە لایەن کەسانێکەوە ئەنجام دەدرێن کە لەو بەشەدا پسپۆڕییان نیە- تەنها لەبەرئەوەی لەبازاڕدا مۆدێلن!- ئەوە پیشاندەدات کە لە نێوان بەرهەمە جۆراوجۆرەکاندا کە لە قوتابخانەیەکدا بوونیان هەیە، بەرهەمی گشتیتر، سادەتر و نزمتری بۆ وەرگێڕان هەڵدەبژێردرێن. ئەمەیە کە ناسینی قوتابخانە فەلسەفیە گەورەکان کە پێویست بە لێکۆڵینەوەو پشکنین و توێژینەوەی هەمولایەنەکانە، لە کۆمەڵگەی رۆشنبیری ئێمەدا بە داخەوە زۆرجار ناتەواو یان گۆڕدراون ولە هەمووی زیاتر تیۆریای "سارتەر" لە زەمینەی جیهان و مرۆڤ و ئەخلاقدا بەمجۆرەیە. لەبەرئەوەی کە لە بنەڕەتدا فەلسەفەیەکی زۆر لێڵ ونادیار و پرکێشە و ئاڵۆزە.

ئەم جیاوازی و پەرێشانیە کە لە کۆمەڵگەی رۆشنبیری ئێمەدا لەمەڕ بوونگەرایی هەیە، لە هەموو دونیاشدا بوونی هەیە، بە جۆرێك هیچ قوتابخانەیەك لە دونیادا بە ئەندازەی قوتابخانەی "سارتەر" پێویستی بەوە نەبووە کە هەمیشە بوونیاتنەرەکەی لە سەنگەری بەرگری و پاکانە یان بە درۆخستنەوە بێت. زۆرجار بەرهەمەکانی "سارتەر"- بەرهەمە گشتیەکانی "سارتەر"- لە روونکردنەوەی بەرهەمەکانی خۆیدا وله راستکردنەوەی بۆچوونی ئەوانی تر لەسەر بەرهەمەکانی ئەوانی تر ئەنجامدراون! ئەو هەمیشە هاواری ئەوەی کردووە کە "بوونگەرایی من، بوونگەرایی کافە و قاوەخانەکان نیە، بوونگەرایی ئەو کەسانە نیە کە دەیانەوێت رابکەن ، کەسانێك کە دەیانەوێت بەرپرسیاریەتی لە کۆڵ خۆیان لابەرن، نابێت پەنا بۆ ئەم قوتابخانەیە بەرن، بە پێچەوانەوە قوتابخانەی کار و بەرپرسیاریەتی و تایبەت بە دروستکردن و داهێنکاریەوە"!

بەهەرحاڵ "سارتەر" چ مافە ئەوەی هەبێت یان ئەو مافەی نەبێت، زەمان و تەرزی بیرکردنەوەی قوتابخانەکەی پێویست دەکات کە لە بنەڕەتدا وەچەی رۆشنبیری دونیا و تەنانەت وەچەی رۆشنبیری ئەورووپی کە لە رووی فەرهەنگ و زمانەوە لە وولاتە نائەورووپیەکان باڵاترن بە چاکی لە قوتابخانەی بوونگەرایی تێنەگەن و "سارتەر" باش نەناسنو قوتابخانەیەك کە بەگوتەی "سارتەر" دەبێت مرۆڤ دروست بکات و هەر بەو جۆرەی کە خۆی بانگەشەی دەکات، مرۆڤگەراترین قوتابخانەی فەلسەفی دونیایە، ئەمرۆ لە دونیادا شوێنکەوتووانی بە جۆرێك ناسێنراون کە لەووڵاتە ئەورووپیەکان و جگە لە ئەورووپیەکانیشدا لە هەواڵەکاندا بوونگەراکان لە ریزی ئەو کەسانە دادەنێن کە ماددەی سڕکەر بەکاردەهێنن!

کاتێك کە قوتابخانەیەکی وەکو "سارتەر"یزم و بوونگەرایی لە وەچەی هاوکاتی "سارتەر" ولەوەچەیەکدا کە لە رووی فەرهەنگیەوە گەشەی کردووە و باڵاتر بیردەکاتەوە، بەو جۆرە دەردەبڕێت و کاریگەرییەکی کۆمەڵایەتی بەم جۆرە بە جێ دەهێڵێت، ئەوکات دەبێت سەبارەت بە نووسەران یان ئەو رۆشنبیرانەی کە لە کۆمەڵگەی وەکو کۆمەڵگەی ئێمە شوێن قوتابخانەی "سارتەر" دەکەون و بڵاوی دەکەنەوە دەبێت بە گلەیی بین. لەبەرئەوە دەبێت رۆشنبیرن پێش هەر کارێك کاریگەری کۆمەڵایەتی ئەو کارە هەڵبسەنگێنن. لەمکاتەدا ئایا قوتابخانەیەك کە بە گوتەی چەند جارەی "سارتەر" زیانی بۆ ئەورووپا هەبووە و ئەورووپا دەرکی نەکردووە ولاوەکان نەیانتوانیوە بەچاکی دەرکی بکەن، لە وولاتە رۆژهەڵاتیەکاندا ولە کۆمەڵگەکانی وەکو کۆمەڵگەی ئێمە کاریگەرییەکی سوودبەخشی هەیە؟ وە ئایا رۆشنبیرانی ئێمە باشتر لە رۆشنبیرانی ئەوان دەزانن کە بوونگەرایی قوتابخانەیەکی دروستکەرە و دەبێت هەمووان بیر لە "سارتەر" بکەنەوە؟

**بنەمای بنەڕەتی بوونگەرایی(لەپێشتربوونی بوون بەسەر ماهیەتدا)**

پێش ئەوەی بچمە نێو بنەڕەتی بابەتەکەوە و ڕۆحی قسەی "سارتەر" تەرح بکەم، ناچارم لێرەدا چەند ووشەیەك کە زاراوە بنەڕەتی قوتابخانەی "سارتەر"ن ڕوونبکەمەوە. لەبەرئەوەی باسەکەش باسێکی ووشك و ماندووکەر دەبێت، داوای لێبوردنتان لێ دەکەم چونکە تێگەیشتنی فەلسەفی قوڵ و دروستی قوتابخانەی "سارتەر" دەگەڕێتەوە بۆ ناسینی ئەو زاراوە بنەڕەتیانەی کە ئەم قوتابخانەیە لەسەر ئەو پایانە وەستاوە. زۆرجار کەسانێك کە نەیانتوانیوە دروست دەرکی ڕۆحی بکەن. لەبەرئەوە ژێرخانی فەلسەفی تەواو دروست و ڕاستیان بۆ دەرککردنی ئەم قوتابخانە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیەیان نەبووە.

وشەی بوونگەرایی"ئیگزیستانسیالیزم" بە "ڕەسەنێتی بوون" ڕاڤە کراوە و وەرگێڕدراوە "ئەگزیستانس"، بە مانای"بوون"ە. زۆرجار تەنانەت زانایان و کەسانێکیش کە چوونەتە ناو فەلسەفەوە ئەم هەڵەیە دەکەن و ئەم "ڕەسەنێتی بوون"ە کە "سارتەر" دەیڵێت لەگەڵ ئەو بوونەی کە ئەرستۆ دەیڵێت یان ئەو ڕەسەنێتی بوونەی کە "ئەبو عەلی سینا" و حەکیمەکانمان( کە هەندێکیان ڕەسەنێتی بوون و هەندێکیان ڕەسەنێتی ماهیەتی بوون) دەڵێن، بەیەك شتیان دەزانن و وەکو یەك وەریان دەگرن، لە کاتێکدا جگە لە ووتندا هیچ لێکچوونێك لە نێوانیاندا بوونی نیە.

قوتابخانەی "سارتەر" لەسەر ئەم بنەما گشتیە وەستاوە( ئەگەر ئەمەمان قبوڵ کرد، دەتوانین بە دوای قسەکانی "سارتەر"دا بڕۆین) ئەویش ئەوەیە: هەموو شتەکانی سروشت و جیهانی بوون، ماهیەت و ناوەڕۆکیان لە پێشترە وەك لە بوونیان، تەنها مرۆڤ نەبێت کە لەگەڵ هەموو شتەکانی بووندا دژ و پێچەوانەیە، واتە ماهیەتی پاش بوونیەتی( بوونی پێشترە تاکو ماهیەتی).

لەبەرئەوە بوونگەرایی واتە ئەوەی کە تەنها مرۆڤ بە پێچەوانەی هەموو بوونەوەران و زیندەوەرانی بوون، بوونی پێش ماهیەتیەتی و بە دەستەواژەیەکی دیکە خودی مرۆڤ

"بوونگەرایە" لە کاتێکدا هەموو هەبووەکانی بوون، (ماهیەتیان لە پێشترە لە بوونیـان) بنەڕەتگەران.

ئەمە مانای چیە و بە چ مانایەك دێت؟

وێنەکێشێك لەبەرچاو بگرن کە دەیەوێت تابلۆیەك بکێشێت تـاکو ئـەو جێگەیـەی کـە لەکـەناری تـابلۆ سـپیەکەیدا دانیـشتووە و ڕەنـگ و قەڵـەم و ئامرازەکـانی بەردەسـتی ئامادەکردوون، تابلۆی هونەری ئەوکەسە بـوونی نیـە، بـەڵام تابلۆیـەکی هونـەری پـێش ئەوەی کە لەسەر رووی پەردەی وێ،ەکێشانەکە بوونی هەبێت، لـە ئەندێـشە و هەسـتی وێنەکێشدا بوونی هەیە، ئەو شتە چیە کە پێش ئەوە بـوونی هـەبووە، ئـەوە بریتیـە لـە "هەبوو"؟

ئەوەی کە دەڵێین هەبوو، جگە لە " هـەبووی بـوون"ە، تـابلۆی وێنەکێـشێك هێـشتا بوونی پەیدا نـەکردووە و هێـشتا واقیعیـەتی بـوونی نیـە، بـەڵام ماهیـەتی هەیـە یـاخود دارتاشێك بە چەند ئامێرێك دەیەوێت کورسـیەك دروست بکـات، ڕەنگـی دار، شـێوەی، جۆری تەختەکە و ژمارەی تەختەکان لەمێشکیدا بوونیان هەیە، لەبەرئەوە کورسـیەك و ئامرازەکانی کە هێشتا بوونی دەرەکیان پەیدا نەکردووە لەمێـشکی دارتاشـەکەدا هـەن، ئەمانە ماهیەتی ئەو کورسیەن بەڵام کە درتاشەکە دروستی کرد، ئیدی شتێك دەهێنێتە بوون. کەواتە ئێـستا کورسـیەکە هـەم ماهیـەتی هەیـە و هـەم بـوون، بـەڵام کاتێـك کـە دروست نەبوو بوو، ماهیەتی هەبوو بەڵام بوونی نەبوو.

لەبەرئەوە بوونی هەرشتێك بریتیە لە حەقیقەت و سیفەتی زاتـی و تایبەتمەنـدی ئـەو شتە، چ بوونی دەرەکی هەبێت و چ بوونی دەرەکـی نـەبێت، مرۆڤێـك کـە پێـنج سـەری هەیە و مرۆڤێك کە سەرێکی هەیە، هەردووکیان خاوەن ماهیەتن و تەنها جیاوازییـان لـە "بوون" دایە، کە یەکێکیان بوونی هەیە و ئەویتریان بوونی نیە. لە پێناسـەی ماهیـەتی مرۆڤی"پێنج سەر" دەتوانین بڵێین مرۆڤی (پێنج سەر ئەو مرۆڤەیە کە لەسەر شانەکانی

پێنج سەر وەکو ئەو سەرانەی ئێمە بوونیان هەیە. پاشان کە پرسیار دەکەن"ئایا هەیە"؟ دەڵێن"نیە". پرسیاری دووەم لەبارەی بوونەوەیە([28])

دەڵێن "هوما" چیە؟ دەڵێن: (باڵندەیەکە کە لە ئاگردا لە دایك دەبێت، لە ئاگردا هێلکە دادەنێت و ئاگر خۆرە.) پاشان دەپرسین هەیە؟ دەڵێن "نیە"؟

شتەکانی سروشت، ماهیەتیان پێش بوونیانە. هەمیشە پیشەوەران کاتێك هەر شتێکیان دروستکردووە، سەرەتا ماهیەتی ئەو شتەیان لەمێشکیاندا دروستکردووە یان تەواو کردووە، پرسیاریان لە کەسێك کردووە و فێربوون و پاشان بوونی دەرەکیان بەو ماهیەتەی مێشك بەخشیوە.

(قوتابخانەی بوونگەرایی) دەڵێت: خودای گەورە- بە گوتەی مارسل-"یان سروشت" - بە گوتەی "سارتەر"- کاتێك ویستویەتی بوون دروست بکات، پێشتر ماهیەتێك لە بوونی، لە کێو، دەریا، درەخت، بەردەکان، ئاسمان، ئەستێرەکان و...هتد لەمێشکیدا بووە، واتە هەر بەو جۆرەی کە ئەندازیارێك ماهیەتی بینایەك لەمێشکیدا بووە و پاشان بوونی پێدەبەخشێت، خودای گەورەش سەرەتا لە هزرو مێشکیدا لەمەڕ بوون، زەوی و ئاسمان و هەموو دیاردەکان و توخمەکان زانیویەتی لە رووی ماهیەتەوە چین و پاشان لەسەر بنەمای ئەو ماهیەتە دەستی بە دروستکردن کردووە. کەواتە هەموو جیهان و هەموو شتەکان، چ ئەو شتە دەستکردانەی کە ئێمە دروستیان دەکەین و چ شتە سروشتیەکان کە خودا یان سروشت - خود ئاگا یان ناخود ئاگا- دروستی کردوون، ماهیەتیان پێش بوونیانە. بەڵام مرۆڤ بە پێچەوانەوە، واتە خودا یان سروشت "ماهیەت"ی ئەو شتەی دروستنەکردووە، بەڵکو مرۆڤ سەرەتاریە شێوەی پەیکەرێك و بوونێك بە بێ هیچ سیفەتێك، بە بێ هیچ تایبەتمەندیەك و بە بێ ئەوەی بتوانین بڵێین

---

[28] - لە فارسیدا کاتێك دەڵێین ئەمە چیە؟ قسە لەبارەی ماهیەتەوە دەکەین و کاتێك دەڵێین هەیە یان نیە؟ پرسیار لە بوون"وجود" دەکەین.

چیه، بوونی پەیدا کردووە، تەنها دەتوانین بڵێین هەیە، دروست وەکو پەیکەرێك شێوە مرۆڤ یان ئاژەڵێك کە هیچ جۆرە سیفەتی مرۆیی نیە.

مرۆڤ پێشتر ماهیەتی نەبووە( ماهیەتی پێش بوونی بوونی هەبووە) واتە خودای گەورە مرۆڤی دروستکرد، بە بێ ئەوەی کە مرۆڤ بێت، واتە شێوەی بوو بێت، شەڕانگێزی بوو بێت، خۆشەویستی بووبێت، رق و کینەی لە دڵدا بوو بێت... ئەو سیفەتانەی کە ئێمە بە ناوی سیفەتی مرۆیی ناویان دەبەین و ناوی"مرۆڤ"ی لێ دەنێین، خاوەنی هیچیان نەبووە.

کاتێك کە دەڵێین مرۆڤ ( بریتیە لە بوونێك کە خاوەن عیشق، کینە، فیداکاری، گەورەیی، هۆش، لۆژیك، زانست، هەست و بەدیهێنانی خوداییە) بەشێك و هەندێك لە سیفەتەکانیم وتووە. بوونی پێشتر دروست بووە بە بێ ئەوەی سیفەتی هەبێت (نە لەمێشکی خودا و نە لە جێگەیەکی دیکە). پاشان خودی ئەم بوونە پاش ئەوەی بوونی، بوونی پەیداکردبێت، ئەم سیفەتانە دروست دەکات، ئەمە کتومت وەکو ئەو چێشتلێنەرە وایە کە نەزانێت دەیەوێت چی دروست بکات و مادده خۆراکیەکانیش – هەرچی بن– تێکەڵ بەیەکیان بکات ولێیان بنێت! بەم شێوەیە ئەم خۆراکە تەنها بوونی هەیە، بەڵام ماهیەتی نیە، چونکە نازانێت چ شتێك دروست دەبێت، پاشان هەر کاتژمێرێك کەسەری بەرز دەکاتەوە و سەیری دەکات، تێدەگات کە چی دروستکردووە. ئەمە یەکەمین جارە کە دروستکەری ئەم خۆراکە پێش ئەوەی ئەم خۆراکەی دروستکردبێت ماهیەتەکەی لەمێشکیدا نەبووە. بە پێچەوانەی هەموو دروستبوونەکان و بەدیهێنانە هونەرییەکان کە بوونیان هەیە و بە "پێچەوانەی" هەموو پیشەسازان کە سەرەتا دەزانن دەیانەوێت چی دروست بکەن و تەرحی ئەو شتەیان لایە و پاشتر دروستی دەکەن، خودا یان سروشت سەرەتا بوونی مرۆڤی دروستکرد و پاشان مرۆڤە کە مرۆڤبوونی و سیفەتی مرۆیی خۆی بە ئیرادە، هەڵبژاردن، سەلیقە و پەسەندی خۆی دروست دەکات.

لەبەرئەوە مرۆڤ دروستکەری خۆیەتی و بە گوتەی یەکێك لە نووسەرەکان (مرۆڤ ئایندەی خۆیەتی) واتە پێشتر تەنانەت لەمێشکی دروستکراویدا پێشبینی ئەوە نەکراوە کە ئایندەی چ شتێك دەبێت، بەڵکو خودی ئەم بوونەی مرۆڤ ئایندەی دروست دەکات. لەبەرئەوە لە پێشتر بوونی بوون بەسەر ماهیەتدا لە مرۆڤدا بە ئاراوتەیی– استثناء– بەم مانایە دێت. لێرەدا لە هەمانکاتدا گەورەترین ئیمتیاز بە مرۆڤ دەبەخشین– چ باوەڕمان بە خودا هەبێت یان نەبێت–([٢٩]) وە ئەو سیفەتەش هێنانەدی مرۆڤە.

لەبەرئەوە لە نێوان هەموو قوتابخانە فەلسەفیەکانی دونیا، لە بوونگەراییدایە کە گەورەیی پەیام و گەورەترین ستایش پەرشبوونی مرۆڤ دەبێت:( بوونت خودا یان سروشت دروستی کردووە، بەڵام گەورەییەکان، جوانیەکان، چاکەکان و شتە مرۆییەکانت دروستکراوی خۆت دەبن.)

## بەرپرسیاری و ئازادی مرۆڤ لە بوونگەراییدا

بەڵام ئەوەی کە مرۆڤ بیر دەکاتەوە کە خۆی دەبێت دروستکەری مرۆڤبوونی خۆی بێت، دوو هەستی بۆ دروست دەبێت. یەکێکیان بەرپرسیاریەتیەکی توند و ئەوی دیکەیان دڵەراوکێیەکی توند و بەهێز. ئەم دوو ووشەیەش لە پیرۆزترین و بەربڵاوترین زاراوەکانی بوونگەراین. بۆچی بەرپرسیاریەتی؟ چونکە گەورەترین کار کە دروستکردنی خودی خۆی و ئاینده و چارەنووسی بێت، خراوەتە ئەستۆی خودی مرۆڤ. لەبەرئەوە بەرپرسیاریەتی گەورە و مەزنە، کاتێکیش قسە لەبارەی بەرپرسیارەیەتە کە دانمان بەوەدا نابێت ئەوکەسەی کە کردارێك یان ئەرکێکمان بەسەرداداوە دەبێت ئازاد بێت، چونکە ئەوکەسەی باوەڕی بە جەبری مرۆیی هەیە، بەرپرسیاریەتی نیە و

---

١- بوونگەراکان دوو دەستەن: هەندێکیان وەکو یاسپەرس، باوەڕیان بە خودا هەیە و مەزهەبین"کاسۆلیکن" و هەندێکی تریان وەکو سارتەر، بێ خودان، بەڵام تەنانەت ئەوانەشی کە باوەڕیان بە خودا هەیە، بەم مانایە بوونگەرایی وەردەگرن.

(ناچار هەگیز بەرپرس نیە.) ئەگەر کەسێك بەردێکمان تێ بگرێ، بەردەکە ناکەینە بەرپرسیاری شکاندنی سەرمان، ئەگەرچی لە واقیعدا ئەم بەردە سەری شکاندووین، بەڵام ئەوکەسەی بەردەکەی وەشاندووە، بەرپرسیارە.

لەبەرئەوە یەکێك لە فەزیلەتەکانی بوونگەرایی داننانە بە ئازادی مرۆڤ، بە پێچەوانەی ماددیگەری لەسەدەی(١٩)دا، ماددیگەرا دیالیکتیکەکان یان ماددیگەرا ڕەهاکان مرۆڤ یان بە ناچاری جەبری مێژوویی یان جەبری سروشتی یان جەبری غەریزەییان دەزانی. سروشتگەراکان باوەڕیان بە جەبری سروشتی هەیە، مرۆڤ شتێك یان گیایەکە کە سروشت بەو جۆرەی کە دەخوازێت دروستی دەکات. ماددیگەرە دیالیکتیکەکان باوەڕیان وایە کە مرۆڤ یاریچی دەستی یاسای کۆمەڵگە و مێژووە. بەڵام بوونگەراکان دەڵێن مرۆڤ یاریچی دەستی خۆیەتی و خۆی دەتوانێت لەگەڵ چارەنووسیی خۆیدا بە هەموو جۆرێك یاری بکات. لەبەرئەوە گەورەترین بەرپرسیارتی لە مرۆڤدا، بەرپرسیاریەتی دروستکردنی مرۆڤ بوونی خۆی، واتە ماهیەتی خودی خۆیەتی کە بەدانپیانان بە ئازادبوونی مرۆڤ دەبێت.

لەبەرئەوە تاکو ئێستا زاراوەکانی بوونگەرایی بریتین لە:

١- لە پێشتربوونی بوون"وجود" بەسەر ماهیەتدا.

٢- بەرپرسیاریەتی مرۆڤ لە دروستبوونی مرۆڤ و ئازادی ڕەها و ناکۆتای مرۆڤ، چونکە پەیامێکی گەورەی لەم جۆرە بۆ هەبوونی ئازادییەکی گەورە دەگەڕێتەوە.

٣- دڵەڕاوکێ و دوودڵی کە ناسراوترین زاراوەی جیهانی بوونگەراییە لە هەموو بەرهەمەکانی سارەتەر و نووسەرانی بوونگەراییدا بوونی هەیە.

دڵەڕاوکێ و دوودڵی لە قوتابخانەی بوونگەراییدا

دڵەڕاوکێ تایبەتمەندی مرۆڤێکی پەرێشانە کە هیچ ئارامی و ئوقرەیەکی نیە، ئەم دڵەڕاوکێیەی بەرهەمی زۆر دژیەکی لە دونیای ئەمڕۆدا بۆ وەچەی نوێ دڵەڕاوکێ ی بەم مانایە وەرگرتووە کە( دوودڵی و دڵەڕاوکێمان هەیە، دڵتەنگین، ئازاراوین، ئارامیمان

نیە، چونکە نازانین دەبێ چی بکەین، چونکە خودامان نیە، چونکە سوننەتمان نیە؛ چونکە باوەڕمان بە سوننەتی کۆن نیە.) بوونگەرایی ئەمانەی رەفز کردووە لەبەرئەوە هەموو ئەو پەیوەندییانەی کە لە رابردوودا ئێمەیان بە بوون و بە ژیانەوە پەیوەست دەکرد و ئێمەیان دەکردە مرۆڤ، بڕدراون و پەیوەست بوون و پەیوەندیە زەمینیەکان؛ وەکو سوننەتە ئەخلاقی و سوننەتە میللیەکان. پەیوەندیە ئاسمانیەکان، وەکو پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ مەعنەویەتە گەورەکانیدا عیشق و خودا و...هتدکە مرۆڤ دەکەن مرۆڤ، پچڕاون و نەماون، لەبەرئەوە مرۆڤ کە لە هەموو پەیوەستی و پەیوەندیەکان پچڕا، ئەمرۆ بە هەڵواسراوی لە هەوادایە.

لەبەرئەوە دوودڵی و دڵە راوکێ بەمانایەیە. بەلأم خودی "سارتەر" هەمیشە جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئەو دڵەراوکێیەی من لەگەڵیدام بەم مانایە نیە، بەڵکو دڵەراوکێیەکە کە نەك مرۆڤێکی بێ ئەرك، بەڵکو مرۆڤێك ئەرکی هەیە خاوەنی ئەو دڵە راوکێیەیە، مرۆڤی بەرپرس چۆن دڵەراوکێیەی هەیە؟ دوودڵی و دڵەراوکێ پێویستی بەرپرسیاریەتیە. کەسێ: کە باری قورسی پەیامێکی هەستیاری وەکو مرۆڤیبوونی خود، ئایندەی خود و تەنانەت ئایندەی خەڵکانی تریشی لە ئەستۆدایە و تەنها خۆی بەرپرسیاری چاکە و خراپەیە، لادان ولانەدانی خۆیەتی ولە بوونگەراییدا ناتوانرێت ئەوە بخرێتە ئەستۆی تەقدیر، ئەستۆی جەبری سروشت و ئەستۆی ویستی ئیلاهی دوودڵی و دڵە راوکێ ی هەیە. دڵەراوکێ ئەوەی کە"من دەبێت باشترین رێگە بۆ ئەنجامدانی ئەم بەرپرسیاریەتە هەڵبژێرم، چۆن هەڵبژێرم؟"

کەسێك کە بەرپرسیاریەتی گەورەی هەیە، هەمیشە لە بەرامبەر ئەم پرسیارەدایە کە(باشترین رێگە بۆ ئەنجامدانی ئەم پەیامە هەستیار و گەورەیە کامەیە؟) "سارتەر" دەڵێت: دڵەراوکێ و دوودڵی ئەو کەسەی کە نازنێت چ کارێ: دەکات و ئەرکی چیە، دڵە راوکێیەکی نەفیکراو و نزمە. من دوودڵی و دڵە راوکێ ی کەسێك رادەگەیێنك کە چارەنووسی میللەتێك، کۆمەڵێك، ژمارەك و خێزانێکی لە ئەستۆدایە و دەبینیت مە بڕیار و کاری ئەولە چارەنووسیاندا و خودی خۆشی کاریگەری تەواو رەهای هەیە.

لەبەرئەوە هەمیشە دڵەراوکێ باشترین ڕێگەی هەیە، دڵە ڕاوکێ ی ئەوەی هەیە کە هەڵە نەکات. لەبەرئەوە ئەو دڵە ڕاوکێیەی کە من دەیڵێم دروستکەری مرۆڤی بەرپرسیارە، مرۆڤێك کە هەمیشە دڵتەنگی باشترین و ڕێگە و باشترین کارە بەڵام ئەم دڵەراوکێیە زیاتر لەمانەوەیە، چونکە ئەو بەرپرسیاریەتیەی کە "سارتەر" دەیڵێت زیاتر لەمانەیە.

## بنەمای ئەخلاق لە دیدگای "سارتەر"ەوە

لەم کاتەدا "سارتەر" جوانترین قسەی لە ڕووی مەعنەوی و ئەخلاقیەوە دەکات، ئەو دەڵێت: من ئەو ئەخلاقەم قبوڵ نیە کە لەسەر پایەی مەزهەب، سوننەت، بڕیار و چەمکە ئەبستراکتەکان بینا بووە. من هەمان ئەو ئەخلاقەم قبوڵە کە خۆم دەیڵێم و مرۆڤ هەڵی دەبژێرێت. مرۆڤ کاتێك کە هەر پیرۆزییەکی بەناونیشانی پیرۆز هەڵبژارد من بە پایەی ئەخلاقی دەزانم.

بەڵام لێرەدا شتێك زیاتر لەسەر ئەم بەرپرسیاریەتیەدا کە ئێمە باسی دەکەین زیاد دەکات ئەویش ئەوەیە بەرپرسیاریەتی مرۆڤ ناکۆتا بە جوان، دەوڵەمەند و قورس دەکات، ئەویش ئەوەیە کە "چ شتێك ئەخلاقیە؟" ئەگەر ڕازیبوون یان تورەیی خودا ئەخلاقی ئێمە دیاری ناکات، ئەگەر باوەڕمان بە چاکە و خراپەی ڕەها نیە کە لەسەر ئەو بنەمایە ئەخلاقمان بوونیاد بنێت و بەمجۆرە ئەگەر باوەڕمان بە ویجدانی مرۆیی و ویژدانی ئەخلاقی نەبێت و ئەخلاقیش لەسەر بنەمای ویژدانی مرۆڤ نەفی بکەین، کەواتە دەبێت ئەخلاق لەسەر چ پایە و بنەماگەلێك بوەستێت؟

لێرەدا "سارتەر" دەڵێت من تەنها ڕێز لە هەستێك دەگرم و ئەو کردارەی کە بەم هەستەوە سەردەردەهێنێت و هەڵبژاردنێك کە ئەم ئامانجەوە بە هۆی مرۆڤەوە ئەنجام دەدرێت بە کردارێك ئەخلاقی دەزانم، کام هەست؟ هەستێك کە لەکاتی بیرکردنەوەلە هەڵبژاردنی ڕێگە بڕیار و کردار لە مرۆڤدا دێتە دی پێوەریش ئەوەیە کە لەم حاڵەدا ئەگەر بیرمان کردەوە و حەزمان لێبوو کە ئەو کردارەی ئەنجامی دەدەین- سوود بەخش یان زیانبەخش، چاکە یان خراپە- ببێتە یاساو ڕێسایەکی بەربڵاو هەووان ئەوە

ئەنجام بدەن و کرداری تاکە کەسیمان ببێت یاسا و ڕێسایەکی گشت ئەوا ئەم کردارە خێری ڕەها و ئەخلاقیە، ئەگەریش دڵمان دەیەوێت تەنها خۆمان ئەم کارە ئەنجام بدەین و هیچ کەس ئاگادرای نەبێت و ئەنجامی نەدات و ڕازی نین بەوەی خەڵکانی تر ئەنجامی بدەن و ببێت یاسایەکی بەربڵاو فراوان، ئەوا ئەو کردارە شەڕی ڕەها و نائەخلاقیە.

هەر کەسێك لە هەر شوێنێکدا کە هەرکارێك ئەنجام دەدات و هەر ڕێگە و پیشەیەك دروست دەکات و دادەمێنێت، هەرچەندە پەیوەندی بە چارەنووسی دیاریکراوی خۆیەوە بێت(بۆ نموونە دەیەوێت خۆراك بخوات، دەیەوێت خۆراك دروست بکات، دەیەوێت هاوسەرگیری ئەنجام بدات، خانوو دروست بکات و ئەم کارانە بە تەواوی دیاریکراون کە کۆمەلآیەتی نین) هەر لەم شوێنەدا هەمیشە دەبێت خۆی و ئەم کردارەی بخاتە ژێر داوەریکردنەوە کە ئایا دەڵی دەیەوێت و دەخوازێت ئەم کردارە ببێتە سەرمەشقی گشت و یاسای گشتی و هەموو خەڵکی پەیڕەوی ئەم یاساو ڕێساسایە بکەن یان نەیکەن، ئەمە تەنها زیرەکیەکە کە خۆی ئەنجامی داوە دڵی نایەوێت بەدوای ئەم کارەوە بن!

لەم کاتەدا هیچ کەسێك نیە هەست بەوە بکات لە کۆمەڵگەدا کردارێکی تاکەکەسی ئەنجام دەدات، بەڵکو هەمووان هەست بەوە دەکەن کە کاتێك کردارێك تەنانەت کەسێك — ئەنجام دەدات، دەبێت پێشەنگ و سەرمەشقێکی سەراپاگیر و گشتی بێت. لە ئەنجامدا هەموو کەسێك لە هەر قۆناغێکی ژیانیدا تاك نیە بەڵك بەرپرسی گشتە.

بەرپرسیاری کام گشتە؟ بەرپرسی هەموو مرۆڤەکان چونکە لەو شوێنی کە کرداری چاك ئەنجام دەدات دڵی دەیەوێت کە مرۆڤەکان هەموویان ئەو کردارە ئەنجام دەدەن. لەبەرئەوە هەر کەسێك لە ژیاندا، تەنانەت لە ژیانی تایبەتی خۆیدا لەو ڕێگەیەی کە هەڵی دەبژێرێت ڕێگا و شێوازەکانی ڕۆژانە— لەو هەستەی کە هەیەتی کردارێکی تاکەکەسی پاداشت وەرگر لە مرۆڤ و کۆمەڵگە ئەنجام نادات، بەڵکو مرۆڤ هەمیشە لە

ژیانـدا نموونەسـاز و سەرمەشـق و دروسـتکەر و یاسـادانەری هـەموو مرۆڤەکانـە، هـەر کەسێك پێشەوا و پێشەنگی هەموو مرۆڤەکانە.

لەبەرئـەوە دوو دڵـی و دڵـەراوکێ لـەم سـنورەدا دەرژێتـە گیـانی هـەر تاکێـك لـە مرۆڤەکانەوە کـە ئـەو نـەك تـەنها بەرپرسـیاری چارەنووسـی خۆیـەتی( دوو دڵـی و دڵـە راوکـێ ی تـەنها بـە هـۆی چـارەنووس و بەرپرسـیاری ژیـانی خـۆی نیـە) بەڵکولـە هـەر کردارێکدا کە رۆژانە و تەنانەت کرداری تایبـەتی کـە ئـەنجام دەدات خـۆی بەرپرسـیاری چارەنووسی هەموو مرۆڤەکان دەزانێت. لێرەدا رۆحێکی گشتی گەورەی مرۆیی دەبینین کە لە هەر تاکێکی مرۆڤدا بوونی هەیە و هەر مرۆڤێك تەنانـەت لـە تایبـەتیترین و هـەرە گرنگترین حاڵەتی رۆحی و کرداری تاکەکەسیدا بەرپرسیاری چارەنووسی مرۆڤایەتی لـە ئەستۆدایە.

کەسێك کە بەرپرسیاریەتی مرۆڤی لە ئەستۆدایە و کەسێك کـە بـاوەڕی وایـە کـرداری سەرمەشقی هەموانە و هەموان بە دوایدا دەچن، هەمیشە لە هەرهەنگاوێکدا کە هـەڵی دەگرێت، ئەم دوو دڵی و دڵە راوکێیەی هەیە کە ئایا ئەمە باشترین هەنگاو بوو؟

## بەخۆسپاردنی مرۆڤ

بابەتێکی تر بابەتی بە خۆسـپاردنە، مـرۆڤ لـە سروشـتدا دلسە"Delaisse" و بـە خۆسـپێرراوە و خـۆی هەیـە و خـۆی، هـەم لەسـەر روی زەویـدا بـە خـۆی سـپێراوە – چـونکە بـە پێـچەوانەی هـەموو بوونـەوەران دروسـت بـووە– و هـەم لـە ئاسمانـدا بـە خۆسـپێراوە، هەرچـەندە باوەڕمـان وابێـت کـە خـودا هەیـە، چـونکە دەبیـنین کـە بەرپرسیاریەتی خۆمـان پـاش هاتنـە بوونمـان خراوەتـە ئەسـتۆی خۆمـان ، لەبەرئـەوە خودای گەورە – کە دروستی کردوین – تەنها پەیکەر و بوونی مرۆڤـی دروسـتکردووە و سیفەت و رەنگـە مرۆییـەکانی دەبێـت خۆمـاَن بـەم بوونـەوەرە بـێ سـیفەت و بێڕەنگـە بدەین. لەم کاتەدا ئێمە لە لایەن خودا بـە خۆمـان سـپێراوین، واتـە خۆمـان خراوینەتـە ئەستۆی خۆمـان. واتـە چـارەنووسمان لـە ئەسـتۆی خۆماندایـە و هەربـەو جـۆرەی کـە

خودای گەورە هەقی بەسەر کارەکانمانەوە نیە، هەر بەو جۆرەی کە ئێمە لە رێنمونی خودا بێبەشین. کەواتە گریمان باوەڕیشمان بە خودا هەبێت ئەو ئێمەی رەها و ئازاد و سەربەخۆ کردووە.

لەبەرئەوە دەبینین کە سەربەخۆیی گەورەترین دوودڵی و دڵە راوکێ ی بۆ مرۆڤ دروستکردووە، بێ سەرپەرشتی، بێ دڵسۆزی لە جیهاندا، نەبوونی خۆشەویستی خودایی، نەبوونی رێنمونی هێزێکی گەورە، ئەمەیە کە بە خۆسپاردنگی لە مرۆڤدا دەهێنێتە بوون. لەبەرئەوە مرۆڤ بوونەوەرێکە خودی خۆی سپێرراوە لە بووندا.

## تەنیایی و نائومێدی مرۆڤ :

بابەتی تەنیایی زیاتر لەوەی کە لە بەرهەمی "سارتەر"دا دەبینین لە بەرهەمی کامۆدا دەیبینین. کامۆ زیاتر لە "سارتەر" حیرەتی لە تەنیایی هەیە و رەنج دەبات. رۆمانی بێگانە"Etranger" نوێنەری مرۆڤێکە کە لەگەڵ سروشت، لەگەڵ خودا و لەگەڵ ئاسمان و لەگەڵ هەرچی هەیە بێگانەیە.

بۆچی مرۆڤ تەنیایە؟ چونکە لە رەگەزی سروشت نیە. لەمادیگەریدا مرۆڤ تەنیا نیە، چونکە لە رەگەزی سروشتە، دواجار بوونەوەرێکی تەواوترە. بەڵام لە "بوونگەراییدا" مرۆڤ غەریبێکە لە رەگەزی دیکە، رەها بووە لەو سەحرایەی کە نە لە رەگەزی ئەوە و نە بۆ ئەویش دروستکراوە.

کاتێك کە هەر کەس بەرپرسی خۆی بوو، کاتێك کە یاسا بوونی نەبوو( یاسا بۆ خۆمان دروست دەکەین) کاتێك کە بنەڕەتێك کە باوەڕمان پێ ی بوو، بوونی نەبوو، کاتێك کە مرۆڤ شوێنکەوتەی رێڕەوی مێژوو یان سروشت یان ئیرادەی خودا نەبوو، لەوەی کە خودا دەستگیرمان بێت نائومێدین، لەوەی کە سروشت چارەنووسمان دروست بکات یان لە پێکهاتەی مەعنەوی مرۆییمان هاوبەشی بکات و بێتە ناوەوە نائومێدین و تەنانەت لە مرۆڤیش نائومێدین!.

لێرەدا تاڵترین و ژەهراویترین بەرهەمەکانی "سارتەر" دەن وسرێن زۆر رەشی لە بەرهەمەکانی "سارتەر"دا دەبینرێن کە رەنگدانەوەی رۆحی مرۆڤی ئەوروپی پاش جەنگە.

لە هەمانکاتدا کە "سارتەر" نموونەی مرۆڤی پاش جەنگی ئەوروپایە، دەیەوێت گەشبین بێت، بەڵام نازانێت ئەم گەشبینیەی خۆی لەم جیهانەدا لەسەر چ پایەیەك بونیاد بنێت، چونکە مەزهەب رۆیشتووە، زانست شکستی خواردووە، هەموو قوتابخانە ئەخلاقیەکان لە بۆچوونیدا لە بەها کەوتوون، فەلسەفەکان هەموویان بە پۆچی گەیشتتون ولە ترۆپکی شارستانیەتدا، ئەوروپای ناوەراست و ئەوروپای رۆژئاوایی بە جۆرێك لە شەرێکی سەرسوڕهێنەر و بە کوشتنی سەرتاسەری گەیشتووە کە خۆی دروست دەکات و خۆی تێکدەدات.

"سارتەر" دەیەوێت نائومێد نەبێت، دەیەوێت ئارامگر بێت و دەیەوێت مرۆڤ بمێنێتەوە، بەڵام نازانێت چۆن و لەسەر چ پایەیەك خۆشبین و گەشبین بێت. ئەم شتەیە کە لە بەرهەمی "سارتەر"دا رۆحێکی سەرسوڕهێنەر دەخوێنرێتەوە کە رقت بار ، رۆحی مرۆڤێك کە دەیەوێت لەسەر بنەمای مەعنەویەتێکی ئەخلاقی قوتابخانەیەك لە دونیادا بخاتە روو، بەڵام هەموو بەڵگەمانیان لێوەرگرتووە و ناتوانێت پشت بە هیچ شتێك ببەستێت!

لە جێگەیەکدا کە بابەتی مرۆڤ و ئەخلاق دەخرێتە روو، ئەم رووە ژەهراوی و بەدبینانەی بەرهەمەکانی "سارتەر" بەتەواوی ن ومایان دەبێت و دەردەکەوێت. ئەو دەڵێت دەبێت تەنانەت لە مرۆڤیش نا ئومێد بین. ئەمە مانای چیە؟

واتە ئەوەی من کردار و وەزیفەم ئەنجام دەدەم و بەو جۆرەی کە دەمەوێت باشترین رێگە کە خۆشم دەوێت، سەرمەشقی خەڵکانی تریش بێت هەڵدەبژێرم، بەڵام ئومێدەوار نیم بەوەی کە هاورێکانم، هاودەردەکانم و هاوبیرەکانم شوێنم بکەون و یارمەتیم بدەن، ئومێدەوار نیم کە وەچەکان و کۆمەڵگەکانی دی کە بە ویستی من نین بە دڵنیاییەوە

ئەم بنەڕەتی عەدالەتە یان فیکرە چاکە یان ئەم فیداکارییەی کە من ئەنجامم داوە پشتگیری لێ بکەن و بەرامبەرم وەفادار بن.

بۆ نموونە من ئەمڕۆ رەنگە رێگەی خزمەتکردن بە فەرەنسا و خەڵکی فەرەنسا هەڵبژێرم، بە جۆرێك زانستیان زیاد بکەم ، یان هەوڵ بدەم هەموو تەمەنم لەوەدا سەرف بکەم کە ئاستی هەست و عەقڵی خەڵکی فەرەنسا بەرەو بالا بکشێت. بۆچی ئەم کارە دەکەم؟ تەنها لەبەرخاتری ئەوەی کە دڵم دەیەوێت هەموو فەرەنسیەکان ئەم کارە بکەن. کەواتە کرداری من کردارێکی ئەخلاقیە، کەواتە ئەمە ئەرك و وەزیفەی منە. ئەم کارەی کە ئەنجامی دەدەم ئومێدەوارنیم کە هەموو فەرەنسیەکان پشتگیریم لێ بکەن. ئەگەر لەم رێگەیەدا ژیانم بەخت کرد و ژیانم سەخاوەتمەندانە لەبەرخاتری خەڵکەکەم بەخشی ، هەرگیز ئومێدەوار نیم کە وەچەی داهاتوو ستایشم بکەن. چونکە یاسا و رێسایەکی گشتی بۆ مرۆڤ بوونی نیە کە هەمیشە ئەو یاسا و رێسایانە بە پیرۆز بژمێرێت، پێوەرێکی ئەخلاقی بوونی نیە کە هەموو مرۆڤەکان باوەڕیان بەو پێوەرە هەبێت. من ئەمڕۆ فیداکاریم بۆ خەڵکی یان بەرزکردنەوەی ئاستی بیرکردنەوەی خەڵکی بە کردارێکی خۆم بزانم و بە کردارێکی ئەخلاقی ناو برد، بەلام وەچەیەکی دیکە رەنگە ئەم کردارە پەسەند نەکەن، بە خزمەتگوزارم نەزانن و رێگەیەکی دیکە هەڵبژێرن. من باوەڕم بە داوەری وەچەی ئایندە نیە، چونکە هەر تاکێك بەو جۆرەی کە خۆی دەیەوێت هەڵدەبژێرێت و هەڵبژاردنیشی لەسەر بنەڕەتی بنەمای مرۆیی گشتی نیە. بۆچی؟ چونکە مرۆڤێکی گشتی نیە، کەواتە بنەمای مرۆیی گشتی نیە.

## ونبوونی پێوەر و نموونەی ئەخلاقی لە بوونگەراییدا

لێرەدا گرنگترین و بنەڕەتیترین بابەتی بوونگەرایی تەرح دەکرێت و ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ هیچ نیە جگە لەوەی کە خۆی دروستی دەکات. واتە لە پلەی یەکەمدا هەڵبژاردن ولە پلەی دووەمدا کردار.

هەڵبژاردن یانی چی و مانای چیە؟ ئێمە کە دەبێت خۆمان ماهیەتمان دروست بکەین، لەسەر بنەمای چ نموونەیەك دروستی بکەین؟ ئێمە کە بە ناونیشانی مرۆڤ لە بۆچوونی بوونگەراییدا نە خودا ماهیەتی مرۆییمانی پێشتر دیاریکردووە و دروستی کردووە نە هیچ مەزهەبێك و قوتابخانەیەکی ئەخلاقی لە دەستماندا هەیە، چۆن و لەسەر چ بنەمایەك باشترین مرۆڤ دروست بکەین؟!

لێرەدا لاوازترین بەشی قوتابخانەی بوونگەرایی دەرکەوتووە، دەبینین کە تاکو ئەم جێگەیە بەتەواوی لۆژیکی، ورد، دروست، گەورە و پڕ شکۆ هاتووە ولێرەدا پلەیەك کەوتووە و ئەمەش کەوتنی جەبریە. واتە دەبێت کەسێکی گەورە و بلیمەتی وەکو "سارتەر" بە جەبری خۆی بەدەست ئەم کەوتنەوە بدات، چونکە پێشتر لە بوونگەراییی خۆیدا لە هەموو پێوەرە باڵا و رەهاکان چەکی لە خۆی داڕنیوە.

تاکو ئێستا چەند نموونەیەك بوونیان هەبووە کە لەسەر بنەمای ئەوانە دەمانزانی دەبێت چی بکەین، شەڕ چیە و خێر کامەیە و مرۆڤی باڵا کێیە و بۆچی زیندووین و رێگەی تەواوکاری کامایە؟ ئەم شتانەمان لەسەر بنەڕەتی جیاوازیەکان و پێوەرە دیاریکراوەکان دەزانی.

یەکێك لەم پێوەرانە خودا و بنەمای ئایینی و مەزهەبی بوو کە بەدرێژایی مێژوو بە پێ ی سەردەمەکان و فەرهەنگەکان خراوەتە روو، ئەم بنەمایە پێمان دەڵێت کە دەبێت مرۆڤ هەمیشە لە خاکەوە بۆ لای خودا ولە نزمی ماددیەوە بۆ باڵایی مەعنەوی ولە کەوتنەوە بۆ کۆتا لەتکەی توانای تەواوکاری مەعنەوی مرۆیی بڕوات ولە جێگەی هەستە غەریزیە ئاژەڵیەکان پەرستشی عاشیقانە بکات جێنشینیان.

رێگەکان و بنەما ئەخلاقیەکان دیار و زانراوبوون، پێوەری خێر و شەڕ خودا بوو و شتێکی زانرا و دیار بوو کە ئەم دونیایە حیساب و کیتاب و دادوەری گەورەی هەیە و کردارەکانی منی مرۆڤ لە بنەمای یاسا و رێسای دیاریکراو و جێگیر لە هەموو سەردەم و قۆناغەکانیدا لێکۆڵینەوەیان لەسەر دەکرێت و من لە بەرامبەر خودادا بەرپرسیاری کردارەکانی خۆم و بەرپرسی هەڵە و تاوانەکانی خۆمم.

نموونەی دووەم سروشتگەراکان خستیانە روو[٣٠] سروشتگەراکان خودایان قبوڵ نەبوو، بەڵام دەیان ووت ئێمە دەتوانین ئەخلاقێکی مەعنەویمان هەبێت بە بێ ئەوەی خودامان هەبێت. لەو ساڵی (١٩٠٠) دا "ئەم ژمارە زۆر مێژووییە" لە فەرەنسادا کە پێشرەوی ئەم کارە بوو ئەوەیان راگەیاند کە دەبێت ئێمە لە قوتابخانەکاندا فێرکاری ئەخلاقی و مرۆیی کە لەسەر فێرکاری ئایینی بوو، بگۆڕین و خودا لە بەرنامەی قوتابخانەکاندا لابەرین و هیچ لە بارەی خوداوە نەڵێین. بەڵام فیداکاری و چاکبوون بنەمای ئەخلاقی چۆن بپارێزین؟! پاشان رایانگەیان کە بنەمای ئەخلاقی لە دیکارت، ڤۆلتێر...هتد وەرگرین کە گوتویانە دەتوانین چاك و میهرەبان بین، سازش لەگەڵ ئەوانی تردا بکەین، سوودەکانی خۆمان بکەینە قوربانی سوودەکانی کۆمەڵگەکەمان، ئازاری کەس نەدەین، لە ژنانمان نەدەین و توندوتیژییان بەرامبەر بەکارنەهێنین و...هتد! (ئەمە راگەیاندنی گشتیە.) بە بێ ئەوەی باوەڕمان بە خودا هەبێت و بە بێ ئەوەی باوەڕمان بە دادوەرێك یان بەرپرسێك هەبێت لە بەرامبەر کردەوەکانمان، چونکە خودای گەورە بوونی نیە، بەڵام دادوەرێکی دیکە هەیە کە رێنموونیمان دەکات ئەویش ویژدانی مرۆییە.

ویژدانی مرۆیی چیە؟ ویژدانی مرۆیی بریتیە لە هێزێکی هاوبەش کە لە هەموو تاکەکاندا بە درێژایی مێژوو ولە پانتایی جوگرافیادا هاوبەشە و خاوەن سیفەت و تایبەتمەندی هاوبەشە و ئەو سیفەتانەش لە مرۆڤی دەشتەکی یان شارستانی، لە مرۆڤی سور و رەش و سپی رۆژهەڵاتیدا یەکێکە و ئەویش ویژدانی سروشتی و گشتی مرۆییە کە هەر کەسێك لە هەر شتێك و رەنگێك بێت بەشێکی لەوە هەیە. ئەو دەتوانێت پێمان بڵێت کە چ کارێك چاکە و چ کارێك خراپە. ئەو هەیە کاتێك کارێکی چاك یان خراپ ئەنجام دەدەین، هەستی کرانەوە و ئاسانبوون و رازیبوون یان سەرزەنشتمان بە دەستمانەوە دەدات. لەبەرئەوە خودا لابەرین ولە جێگەکەیدا پێوەری ئەخلاقی و زامنی

---

[٣٠]- واپێدەچێت مەبەستی رادیکالیستەکان بێت.

جێبەجێکردنی ئەخلاقیاتی مەعنەوی – کە ویژدانی گشتی مرۆڤ ولە هەموو مرۆڤەکاندا هاوبەشە– بریار بدەین.

بەلاّم "سارتەر" بە ویژدانی گشتی مرۆیی یان بنەمای هاوبەشی هەموو مرۆڤەکان رازی نیە، ئەو دەلّێت: "مرۆڤ" بوونی نیە، مرۆڤ بریتیە لەو سیفەتەی کە دەبێت لە ئایندەدا دروستی بکەین و بمانەوێت دروستی بکەین. لەبەرئەوە مرۆڤ نەبووە و هێشتاش نیە، ئێمە لە حالّەتی مرۆڤبووندانین و بە دەستەواژەیەکی تر ئێمە لە حالّەتی دروستکردنی مرۆڤ یان لە حالّەتی دروستکردنی پێکهاتەی مرۆیی خۆمانین، لەبەرئەوە ویژدان هاوبەشی مرۆییە کە لە هەموو مرۆڤەکاندا بوونی هەیە و هەمووان لەو سفەتەدا هاوبەشن شتێکی لەم جۆرە بوونی نیە و وهمە، بەلّکو بوون" وجود" لە هەموونـدا هاوبەشە.

سیفەتەکان بریتین لە رەنگەکان و ئەو دیاردانەی کە خۆمان دەبێت بیانرێژین و دیارییان بکەین و بە درێژایی مێژووش رێژراون. کەواتە مرۆڤێك کە ئازاد و بەرپرسە و کرداری دەبێت سەرمەشقی هەموو مرۆڤەکان بێت لەسەر بنەمای چ پێوەرێك کردارێك هەلّبژێرێت؟

لێرەدا "سارتەر" نموونەیەکی زۆر هەستیار دەهێنێتەوە و دەلّێت یەکێك لە قوتابییەکانم هات و ووتی: ( من دووچاری ئیشکالیەتێکی ئەخلاقی گەورە بووم، دایکم جگە لەمن کسی تری نیە ولە لایەکەوە باوەرم وایە کە برۆم بۆ بەریتانیا و هاوکاری هاوبیرەکانم بکەم و خۆم فیدا بکەم لە پێناویاندا. ئێستا نازانم دەبێت دایکی نەخۆشم هەلّبژێرم یان دۆستان و هاوبیرانم؟ لێرەدا ولەلای دیکم بمێنمەوە یان برۆم بۆ بەریتانیە؟)

لێرەدا نەمەسیح و نەکانت – هیچکامیان – وەلاّمێکیان بۆی نیە. مەسیح دەلّێت: ( یەکترتان خۆش بوێت و خزمەتی یەکتر بکەن.) و کانتیش وەلاّمی ئەم پرسیارەی کە دەلّێت :" وەزیفەی ئەخلاقی من چیە؟" دەداتەوە بەوەی ( هەر کردارێك ئەگەر بۆ خودی ئەو کردارە ئەنجامدرا، ئەوە کردارێکی ئەخلاقیە و ئەگەریش بویە هۆکار بۆ

ئامانجێكی دیكە ئەوە ئەخلاقی نیە.) بۆ نموونە:(( ئەگەر تۆ پارە بە پیاوێكی هەژار بدەیت تاكو نزات بۆ بكات، یان خودا پاداشتت بداتەوە، ئەمە كردارێكی ئەخلاقی نیە، بەڵكو مامەڵەیەكە كە ئەنجامت داوە" ئەگەر ئەم كردارە چاكە ببێتە هۆكار ئیدی ئەخلاقی نیە هەرچەندە باشیش بێت" بەلاَم ئەگەر ئەم كردارە لەبەرخاتری خودی كارەكەت ئەنجامدا بێت، لەبەرئەوەی لە رووكەشدا ئەم كردارە چاكە، بۆیە ئەخلاقیە.))
ئەمە رێن ومایی جەنابی كانتە.!

لەسەر ئەم بنەمایە ئەگەر دایكی هەڵبژێرێت و نەڕوات، ئەم كردارە بە "رووكەش" ئەخلاقیە، واتە دایكی هەڵبژاردووە، تەنها لەبەرئەوەی كە دایكی هەڵبژێرێت! ئامانجێكی دیكە لەم نێوەندەدا نیە. بەلاَم لە هەمانكاتدا ئەولە لای هاوكارەكانی كە باوەڕی وایە دەیانەوێت خەبات بكەن، نەرۆیشتووە و بۆتە هۆی ئەوەی كە ئەوانی كردووە بە هۆكار بەوەی بڵێت " ئێوە كاربكەن و پاشان كە بە ئامانج گەیشتن منیش دەبمە هاوبەشتان! " كەواتە لێرەدا كارێكە نائەخلاقی ئەنجامدراوە. بەلاَم ئەگەر وە لەبەرئەوەی هەناسەی ئەم كردارە ئەخلاقیە بۆ ئەو شوێنە بڕوات، ئەوا دیكی كردۆتە قوربانی و هۆكاری گەیشتن بە ئامانجەكەی پیشانداوە لەو كاتەدا ئەم كردارەش نائەخلاقیە! كەواتە كام قوتابخانەیە كە بە شاگردەكانی بڵێت باشترین كردار كامەیە؟

"سارتەر" دەڵێت: پێم وت وەلاَمی قوتابخانەی بوونگەرایی ئەوەیە: كە تۆ لەبەرئەوەی ئازادیت، هەركامیانت دەوێ هەڵیبژێرە، واتە دروستی بكە، بۆ دڵی خۆت بگەڕێرەوە!

واتە جارێكی دی "سارتەر"یش وەلاَم ناداتەوە كە كرداری ئەخلاقی كامەیە؟ ناڵێت دایكتە یان هاوبیرەكانت، خەڵكی باشترن یان هەستی دایكایەتی؟ مرۆڤێك كە تاكو ئەم رادەیە لۆژیكی و زانستیە لێرەدا دەڵێت: ( بۆ دڵی خۆت بگەڕێرەوە، هەركامیان بوونە ئیلهام بۆت هەمان ئەو شتە هەڵبژێرە، واتە ئەگەر دایكت زۆر خۆش دەوێت و ئەوانت كردە قوربانی وەیان بە پێچەوانەوە تۆ لە هەرحاڵەتێكدا كردارێكی ئەخلاقیت

ئەنجامداوە)! کامیان ئەخلاقیە؟ ( هەر ئەوەی کە ئەنجامت دا) !لەسەر چ پێوەرێك؟ (لەسەر ئەو بنەمایەی کە هەڵتبژاردووە)! بە چ پێوەرێك دەتوانین هەڵسەنگاندنی بۆ بکەین کە ئەمە باشترین ئەخلاقە؟ " لە ئەخلاقدا پێوەر نیە، پێوەر لە دوای کردار دروست دەکەین، ئەگەر دایکت هەڵبژارد، ئەوە پێوەرێکی ئەخلاقیت هێناوەتە بوون و ئەویش ئەوەیە کە دەبێت دایك زاڵ بکەین بەسەر هەر پەیامێکی ئەخلاقی دیکەدا و بۆی بگەڕێیتەوە و ئەگەریش هاوبیرەکانت هەڵبژاردووە ئەوە پێوەرێکی دیکەت هێناوەتە بوون"!

"سارتەر" دەڵێت: بۆیە سبەینێ لێم پرسی چیت کرد؟ ووتی: دایکم بە بێ من ناتوانێ بژی و زیندوو بێت، دایکم هەڵبژارد. ووتم تۆ کردارێکی ئەخلاقیت هێناوەتە بوون!

ئەمە یەکێ: لە ئاڵۆزترین خاڵی ئەم قوتابخانەیە، چونکە بە پێچەوانەی ئەو وێنایەیە کە ئێستا لە هزر و مێشکماندایە، کێشەداربوونی تێگەیشتنی بابەتەکە لەبەرئەوەیە کە زۆرجار کاتێك دەمانەوێت کردارێك ئەنجام بدەین، سەرەتا چاکی و خراپی ئەو کردارە لەگەڵ ئەو بنەڕەتەی پیرۆزەی کە خۆمان هەڵی دەبژێرین، دەپێوین و پاشان کە پرسیارمان لێ دەکەن بۆچی ئەم کارەت ئەنجامدا؟ دەڵێین: لەبەرخاتری ئەوەی کە ئەم بنەمایە باشترە، لەبەرخاتری ئەوەی کە ئەم کردارە لە کرداری دیکە باشترە. ئەگەر من خزم و نزیکەکانم کردە قوربانی هاوەڵەکانم، لەبەرخاتری ئەوەیە کە دەڵێم خزم و نزیکەکانم کردە قوربانی هاوەڵەکانم، لەبەرئەوەیە کە دەڵێم خزم و نزیك پەرستی کردارێکی پەست و نزمە و دەبێت خەڵکیمان خۆشبوێت. بەڵام لە بوونگەراییدا نە پێوەری تاکی زیهنی کە خودای گەورە دایناوە و هەڵی بژاردووە بوونی هەیە و نەویژدان، نەویژدانە و نە خودا.

لەبەرئەوە کاتێك کە نە ویژدانێك بوونی هەبێت کە خێر و شەڕ ئیلهام بکات و بنەما ئەخلاقیەکانمان لە بەرامبەردا دابنێت و نە خودا بنەمایەك بنێرێت، هەر کەسێك هەر

کارێك کە ئەنجام دەدات بەو مەرجەی کە لەو کردارەدا نیەت چاکە بوونی ببێت، ئەوا کردارێکی ئەخلاقی ئەنجامداوە.

رەخنەی و توێژینەوەی ئەخلاقی بوونگەرایی

لێرەدا بابەتکێکی دیکە دێتە پێشەوە کە دەبێت پرسیار لە "سارتەر" بکەین ئەویش ئەوەیە: ئەم لاوە کە لە بەرامبەر مانەوەی لە لای دایکی و هەم لە بەرامبەر رۆیشتن بلۆ لای هاوبیرەکانی دوو دڵ بوو و دەبوو یەکێکیان هەڵبژێرێت، هەرکامێکیشیانی هەڵبژارد بە گوتەی ئێوە کردارێکی ئەخلاقی بوو، بەلأم ئەگەر رێگەی سێیەمی هەڵبژاردایە واتە هەم دایکی و هەم هاوبیرەکانی – هەردووکیانی – کردبوویە قوربانی و بۆ گەڕان و خۆشی و باشتر ژیانکردن رۆیشتبوو، ئەوا بەمەحکومی بزانین؟ ئێمە ئەو پێوەرمان نیە!

لێرەدایە بە گوتەی دیستۆفسکی: ئەگەر خودا لە سروشت لابەرین، هەموو کردارێك رێگە پێدراوە! و بەگوتەی ژید: ئەگەر لە جیهاندا پێوەرێك بوونی نەبێت بۆ ئەوەی کردارەکانی مرۆڤ یان بەها بالآ مەعنەویە مرۆییەکان لەگەڵ ئەو بەها رەها و بالأیانە هەڵسەنگێنرێن، هەموو کارێك پووچ و بێهوودەیە([31])

ئەگەر پێوەرێکی رەها لە دەرەوەی کرداری تاکەکەسی ئێمەوە بوونی نەبێت، کرداری چاك یان خراپ، خزمەت یان خیانەت، شەڕ یان خێر، جوانی یان ناشیرینی و...هتد هەموویان لە تاکدایەکسانن، هەرکردارێك هەر کەسێك هەڵی بژێرێت، هەڵبژێردراوە و شایەنی رەخنەگرتن نیە، چونکە کاتێك کردارێك شایەنی رەخنە لێگرتنە کە بنەمایەکمان هەبێت و بەو بنەمایە و بەو دەزگا بەخایی و ئەخلاقی و مەعنەوییانە

---

[31]- لە ژید دەپرسن بێهودە چیە؟ دەڵێت: " بێهودەیی ئەوەیە کە بوونی ببێت، بەلأم بە هیچ جۆرێك شایەنی روونکردنەوە نەبێت" وەکو ئەوەی کە لە شەقامدا لەگەڵ کەسێکدا کە نایناسم و هیچ کارێکی پێم نیە، هەوڵپرسی بکەم، پاشان ئەویش بە بێ پێشینەیەك لە بناگوێم بدات و پاشتر کارتێکی پیرۆزباییم بۆ بنێرێت! ئەمە کرداری بێهودەیە.

هەڵسەنگێنین و پاشان لەگەڵ هەرکامێکیان پێچەوانە بوو بەمەحکومی بزانین و لەگەڵ هەرکامیان هاوڕاو و یەکسان بوو بە قیولکراوی بزانین.

ئەگەر لە جیهاندا هیچ شتێك بوونی نەبێت، ئەگەر لە جیهاندا هەموو سیفەت و هەموو مرۆڤایەتی لەسەر بنەمای مەعنەویەتێکی تاك و تەنها کە هەموومان باوەڕمان پێ ی هەبێت، هەڵنەسەنگێنین، ئەگەر هەموو تاکەکانی مرۆڤایەتی نەزانن کە مرۆڤی باڵا کێیە، چاك یان خراپ کێیە و باڵاترین سیفەتی مرۆیی کامەیە و تەنها هەر کەسێك هەر کردارێکی ئەنجامدا – چ چاك یان خراپ – بڵێین کە پێوەرێکی ئەخلاقی ئەنجامداوە( چونکە خراپی و چاکی رەها، کە هەموویان باوەڕمان پێ ی هەبێت بوونی نیە، لەبەرئەوە ناتوانین بڵێین خراپە یان چاك) لەم کاتەدا ناتوانین مافی خۆمانە لە جەنابی "سارتەر" و هەموولاوەکانی دونیا کە بە بلیمەتێکی گەورەی دەزانن مافی ئەوەمان هەیە بپرسین کە:

لە نێوان کەسێکدا کە لەبەرخاتری خەڵکی ، لەبەرخاتری رێگە و بیروباوەڕی یان لەبەرخاتری زانست و زانینی مرۆیی دایکی، هەستی منداڵیەتی و نزیکی، عیشق و پارە و سەروەت و سامانی دەبەخشێت وەیان گیانی خۆی داخاتە مەترسیەوە وەیان لەبەرخاتری چێژی تایبەتی خۆی شەڕ دەکات و لەبەرخاتری سوودی خۆی کۆمەڵێك لەناو دەبات، من چۆن بتوانم یەکێك تاوانبار بکەم و یەکێکی دیکە بە باڵا و بەرز بزانم و ستایشی بکەم؟ ( لە نێوان دوو کەسدا) کە یەکێ: خۆی دەسوتێنێت تاکو مرۆڤایەتی و خەڵکی لە ئاگری نەزانین و گەندەڵی و داروخان رزگارییان ببێت و یەکێکی تر کەسێکی دیکە دەسوتێنێت تاکو خۆی سوود وەرگرێت، بە چ پێوەرێك دەتوانین یەکێکیان بە تاوانبار و مەحکوم بزانین و ئەوی دیکەیان ستایش بکەین؟

دەڵێت: پێوەری کرداری چاك ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی بزانێت کە کرداری چاکە و بیەوێت کردارەکەی ببێتە یاساکی گشتی!

عەرەبەکانی سەدەکانی ناوەراست کچەکانیان زیندە بەچاڵ دەکردن و دڵیان ئەوەی دەخواست کە ئەم کردارە ببێتە کردارێکی گشتی، واتە عەرەبەکانی دیکەش ئەم کارە

ئەنجام بدەن و کەسێکیش کە ئەم کارەی نەدەکرد بە بێ غیرەتیان دەزانی. لەبەرئەوە "کردار"ی مرۆڤ لە کۆمەڵگەیەکدا کە بە گشتی کچەکانیان زیندەبەچاڵ دەکەن — وە ئەم مرۆڤە کە لە هەمانکاتدا کە بڕیاریداوە کچەکەی زیندەبەچاڵ بکات، دڵی دەیەوێت کە ئەمە ببێتە پێوەرێکی گشتی و هەمووان کارێکی لەمجۆرە بکەن– لە دیدی بوونگەراییدا بنەمایەکی ئەخلاقی هەیە([32]).

بە پێچەوانەوە لە هەمان جێگەدا کەسێك لەبەرچاو بگرن کە ئەم کردارە ئەنجام نادات وە ( ئارەزووی ئەوەش دەکات کە هەمووان ئەم کارە ئەنجام نەدەن). ( ئەم حاڵەتەش لەبەرچاو بگرن) کە لە هەمان کۆمەڵگەدا خەڵکی لەو سوننەتە گەڕاونەتەوە و ئەم کردارەیان فەرامۆش کردووە و ئەنجامی نادەن، بەڵام یەکێك لەوێ هەیە کە بە پەنهانی کچەکەی زیندەبەگۆڕ دەکات ولەو کاتەدا دەیەوێت کە خۆزگە خەڵکیش ئەم کردارەی ئەمیان بکردایەتە سەرمەشق! " واتە ئەم تاکە کە بە پێچەوانەی دابوونەریتی خەڵکیەوە تاوانێکی لەمجۆرە ئەنجام دەدات، بەداخە کە بۆچی سوننەتێ:ی لەم جۆرەیان خستۆتە لاوە و فەرامۆشیان کردووە". لێرەدا لە نێوان کەسێکدا کە ئەم کردار تاوانکارییەی ئەنجامداوە و حەز دەکات کە ببێتە یاسای گشتی و تاکێکیش کە ئەم کارە ئەنجام نادات ( کچەکەی لەماڵەوە بە زیندوویی دەپارێزێت) و ئارەزووی ئەوەش دەکات کە خەڵکانی تریش ئەو تاوانە ئەنجام نەدەن، لە بۆچوونی پێوەری ئەخلاقی بوونگەرایی هیچ جیاوازییەك بوونی نیە، چونکە هەردووکیان لەبەرئەوەی لە شوێنێکدا کە کردارەکەیان هەڵبژاردووە و ویستویانە سەرمەشقی هەموان بن، کرداری ئەخلاقیان ئەنجامداوە!

---

[32]– خەیاڵی نارەحەتە لەوە کە هەمیشە بەدوای ناموسیەوە بن، بە هەستێکی لەمجۆرە تاوانێکی لەمجۆرە ئەنجام دەدات. هەمان ئەو جێگەیەی کە دڵی دەیەوێت خەڵکانی تریش ئەم کارە ئەنجام بدەن، لەبەرئەوەی هیچ پێوەرێکی دیکەش جگە لە پەسەندکردنی هەستی ئەو بوونی نیە، ئەم کردارە کردارێکی ئەخلاقیە!

ئەم شوێنە لاوازترین خاڵ ولایەنی قوتابخانەی "سارتەر"ە ولێرەدایە کە وەچەی لاو و نوێ کە بە توندی لە ژێر کاریگەری ئەم فەلسەفەیە کە لە لایەنی جیاوازەوە زۆر پێشکەوتوو و شایەنی ئەوەیە سەرنجی لێ بدرێت وەستاون، لەو روەوە لەگەڵ هیچ پێوەرێکدا بۆ پەیوەندیکرنیان – واتە پەیوەندی مەعنەوییان– و لەگەڵ هیچ سەرمەشقێکی پێشتر دروستکراودا پەیوەندییەکی نیە، لە ئەنجامدا لەسەراسیمەیی و ئاوارەیی و ئەو دڵەراوکێ خراپ و نزمەی کە خودی "سارتەر" دەیڵێت گرفتار بوون.

"سارتەر" لە ساڵی (١٩٣٧) ەوە تاکو ئێستا زیاتر لە چواردە جار لە قاوەخانەکاندا ولە ریستۆرانتەکان و زانکۆ جیاوازەکاندا خەڵکی گرتووە و ئەوەی گوتوە کە دوودڵی و دڵە راوکێ بەو مانایە نیە کە دەڵێن! ئەنجامی کرداری ئەوەیە کە دەبینین، واتە ئەگەر ئێمە پێوەرێکی ئەخلاقی بەرز و باڵامان نەبێت کە هەموان ئارەزووی گەیشتن بەو بەها باڵایانە بکەین، ئەگەر وێنایەك لە مرۆڤی گەورە و ئەخلاقی شەرەفمەندانە و باڵامان نەبێت کە ئارەزووی گەیشتنی بکەین، بۆچی بەرپرسیاریەتیەکی سەختی لەمجۆرە کە "سارتەر" دەیڵێت قبوڵ بکەین؟

مرۆڤایەتی بە درێژایی مێژوو باوەڕی بە خودا هەبووە، لە دۆزەخ ترساوە و ئارەزووی بەهەشتی کردووە و خۆی لە بەرامبەر خوادا بە بەرپرسیار زانیوە، بەڵام جارێکی دی ئەو پێغەمبەرانەی کە ئەخلاق و قوتابخانەی ئەخلاقیان لەسەربنەمای بەهەشت و جەهەنەم و خودا و بەرپرسیاربوونی مرۆڤ لە بەرامبەر هێزێ:ی لەم جۆرە بوونیاد ناوە، سەرکەوتوو نەبوون کە لە راستیدا ئەخلاقی مرۆیی پاك بکەنەوە و لەگەڵ لادانەدا لە کۆمەڵگەدا خەبات بکەن؟

پرسیار لە "سارتەر" دەکەن: تۆ کە رازیت بە هەموو بەرپرسیاریەتیەك بەرامبەر مرۆڤ و مرۆڤ لە بەرامبەر هەموو بەرپرسیاریەتیەك دەزانی بڵێ کە لە بەرامبەر چ شتێك و بە پێوەرێك بەرپرسیارە؟

لێرەدا "سارتەر" بێدەنگە: مرۆڤ لە بەرامبەر خۆیدا بەرپرسیارە و پێوەرێکیشی نیە!

"سارتەر" دەڵێت: لە بەرامبەر مرۆڤدا هەموو نیشانەکان و هێماکان لە نێو چوون، واتە لە بیابانێکدا دەژی کە هەر لایەنێك هەڵبژێرێت هەمان ئەولایەنە رێگەیە.

بەو قوتابخانە ئەخلاقیەی کە تیایدا بەرپرسیاریەتی تەنها و تەنها ئەوەیە کە جەنابی "سارتەر" دەیڵێت" دەبێت ئەم کارە ئەنجام بدەیت، بەم جۆرە هەست بکەیت، نیەت چاکیت هەبێت، باوەڕت بە هیچ پێوەرێك و بابەتێك نەبێت، دونیا مانای نیە، ژیانی مرۆڤ ئامانجێکی نیە و مرۆڤ دەبێت خۆی مانا و ئامانج بە ژیان و جیهان ببەخشێت" لەسەربنەمای قوتابخانەیەکی لەمجۆرە کە تیایدا مرۆڤ نە زامنێکی هەیە نە لە بەرامبەر کەسێکدا بەرپرسیارە و نە نموونەیەك بۆ چۆنیەتی دروستبوون بوونی هەیە، تەنها لەسەر ئامۆژگارییەکانی جەنابی "سارتەر" وەستاوە، ئایا ئیمکانی ئەوە هەیە مرۆڤایەتی و ئەویش وەچەیەکی سەرکەشی ئەمڕۆ بۆ رێگەیەك رێنوێنی بکرێت؟ ئەنجامەکەی ئەوەیە کە ئەمڕۆ دەیبینین.

**ئەنجامگیری:**

کۆتایی رستەکانی من کە لە هەمانکاتدا حوکمدانێکی گشتیشە ئەمەیە کە: بوونگەرایی لە بەرامبەر ماددیگەری دیالیکتیك کە مرۆڤ بە بوونەوەرێك دەزانێت کە یاریچی جەبری مێژووە ولە بەرامبەردا سروشتگەرایی کە مرۆڤ بە شتێکی سروشتی دەناسێنێت ولە بەرامبەر جەبردا کە مرۆڤ بە یاریچی دەستی ئەو رێسا و یاسایانەی کە لە دەستی ئەودا نین دەناسێنێت ولە بەرامبەردا "مارکس"یزم کە وادەزانێت تەنها بە چارەسەربوونی سیستەمی ئابووری تەواوی رەنجە مرۆییەکان چارەسەر دەبن و هەموو ئومێد و ئاواتەکانی مرۆڤایەتی دێنە دی ولە بەرامبەردا قوتابخانە پوچگەراکان و بەدبینەکان کە لەسەر پوچی رەهای جیهان – ئەو قوتابخانانەی کە لەسەدەی (١٩) و (٢٠) دا بۆ مرۆڤایەتی دەخەنە روو – بالآترین قوتابخانەکانە.

بینیمان کە زانست پاش ئەوەی کە مەزهەبی لە کۆمەڵگەکاندا لابرد و پەیامی رێبەرایەتی مرۆڤیی کردە ناونیشانی خۆی، جەنگە گەورە جیهانیەکانی خستە رێ و پاشان گۆڕا بە دەزگایەکی ئیدارەی بەرهەمهێنان و بەکارهێنانی کالآ ئابووریەکان و

بوویه تۆکەری پیشەسازی نەك تۆکەری حەقیقەت. بە گوتەی برشت " زانست ترسناکتر و ریسواتر لە کڵێسای سەدەکانی ناوەراست شکستی هێنا". لە ساڵی (١٩٣٣) دا زانست بەمجۆری لێهاتبوو، مەزهەبیش بەو شێوەیە لە کۆمەڵگە ئەوروپیەکاندا بەستبووی ولە جوڵە کەوتبوو وە لە هەمووی گرنگتر مرۆڤ گرفتاری ژیانێك بوو کە دواجار ( فیداکردنی ئاسایش بۆ دروستکردنی هۆکاری ئاسایش) تەواو دەبێت.

بۆ مرۆڤێك کە دوچاری گرفتارییەکی لەم جۆرە بووە ولە دۆخێکی وەهادا ولە ژینگەیەکی نەخۆش ئامێزی نامرۆییدا کە مرۆڤ گرفتاریەتی ولە بەرامبەر قوتابخانەکانی سەدەی(١٩) کە لە مرۆڤ ئەمرۆ تێناگەن ( چونکە ئەو وەچەیەی کە پاش جەنگ پەیدا بوو، پێویستیی بە قوتابخانەکی دیکە و پەیامێکی دیکەیە). بوونگەرایی گەورەترین بەهای زانستی و مرۆیی ئەوەیە کە – بە پێچەوانەی "مارکس"یزم، ماددیگەری و سروستگەرایی– مرۆڤ بە بوونەوەرێکی ئازاد رابگەیێنێت وە بەبەرپرسیار خۆی و دروستکەری خۆی و پەروەردەکەری چیەتی و ماهیەتی خۆی دەناسێنێت.

تاکو ئەم جێگەیە زیاتر لە هەموو قوتابخانەکان باشتر وەڵامی نیاز و پێداویستیەکانی مرۆڤی بێچارەی ئەمرۆ دەداتەوە، بەڵام لەو جێگەیەی کە لە بەرامبەر مرۆڤی باڵا و هەروەها بۆ رزگارکردنی مرۆڤ لەم کۆبوونەوە شێتانە سرینەوەی – بودایی پیشەسازی هیچ رێگەیەك و هیچ بەرپرسیاریەتیەك و هیچ نموونەیەکی رەها ناخاتە روو کە هەموو مرۆڤەکان ئیمانیان پێ ی هەبێت ولە بەرامبەریدا هەست بە بەرپرسیاریەتیەکی گرنگ و جدی بکەن، بۆیە بەم هۆیەوە قوتابخانەیەکی لاوازە.

## تەنیایی

تەنیایی – بەو جۆرەی کە لە "مرۆڤ، خودا رەنگێك لە دوورخراوەییدا" وتومە و بەو جۆرەی کە لەسەراسەری "کویر" دا هەستی پێ دەکەیت– تایبەتمەندییەکی دەرکەوتووی "دۆخی مرۆیی" (Situation humaine) یە و مەزهەب و عیشق و هونەر جیلوە هەمیشەییەکانی ئەم رۆحە غەریبەن. ئەم " نەی بڕدراوە لە قامیشەڵان کە هەمیشە لە جیایی و شەوقەوە دەناڵێنت" مرۆڤ([33]) جەوهەری ناماددی "خود ئاگا و خاوەن توانای هەڵبژاردن و بەنموونە دیهێننان و ئەفراندن" – کە لە جۆرە ئادەمیزاددا گەشە دەکات و تەواوکاری بەدەستهاتووی مرۆڤ دروست دەکات– ی خود بێگانەیی ئەو لەگەڵ سروشت و توخم و یاسا و رێسای بیابان و جەبری بێ هەست و نائاگایی کە دەوریان داوە و لەگەڵ هەموو ئەو بوونەوەرانەی کە هاوماڵی ئەون و نایناسن، سەرنج دەدات.

تەنیایی – وە بەو مانایەی باشتر وایە بڵێین "جیایی یان غوربەت" بەو جۆرەی کە من لێ ی تێدەگەم – بە پێچەوانەی داوەریکردنی قاڵبی واقیعگەراکان لەگەڵ ئایدیاڵیزمی عیرفانی رۆژهەڵاتی" لە لائوتزو تاکو مەلا صەدرا" و ئایدیالیزمی فەلسەفی رۆژئاوایی" لە ئەفلاتۆنەوە تاکو برکلی و هیگل و بە دەستەواژەی هایدگەر و یاسپەرس" یەکێك نیە، هەربەو جۆرەی کە لە واقیعگەرایی ئاڵو گۆڕ کە دوژمنی دیالیکتیکە ! زۆر دوورە. ئەویش جۆرێك دڵزەدەیی بورژوازی و وەهمی ئازاراوی "دڵە بێ

[33]– "ئادەمیزاد" بە ناوی "ئاژەڵی گۆیا– حیوان ناطق" و ناوی "مرۆڤ" یش بە سیفەتی تایبەتی ئەو تاکانەی کە دەستیان بە تەواوکاری گەیشتووە و لەو جۆرەی کە بە خود ئاگایی و ئازادی رێژەیی گەیشتوون.

دەردەکان" و ئازاری و خەوی"مرۆڤە خۆشگوزەرانەکان"ە([٣٤])، خـودی خۆشـگوزەرانی جۆرێـك روتکردنەوەیـە لـە راسـتیە زانـستیەکان، چـونکە ئـەوانی تـر بـاری قورسـی بەرهەمهێنان دەخەنە سەرشـانیان و لەگـەڵ رەنـج و ئازارەکـانی ژیانـدا روو بـەروون وە ئەویش خاڵی لەوە تەنها دەخوات. بەتاڵی و کاتی بێکاری لە کاتێکدا کە هێـشتا ژیـانی مرۆڤایەتی لێ ی بێ بەشە، خودی"بێئاگایی"ەکە و بێگایی"نـەزانی". دەخـوات بـە بـێ ئەوەی کار بکات و لەبەرئـەوە بـەکارهێنان ئـەنجامی جـەبری ولـۆژیکی بەرهەمهێنانـە و بەرهەمهێنانیش هێشتا لەگەڵ "رەنج و ئازار و کارکردندایە، لە رووی لۆژیکیەوە کەسێك کە بەکاردەهێنێت، بە بێ ئەوەی ئەم دووانـە بناسـێت، بوونـەوەرێکی نامرۆییـە کـە لـە هەل ومەرجی موعجیزە ئاسا ژیان بەسەر دەبات، ئەمەیە کە بە واقیعی دەتوانرێت ئەوە بوترێـت "بێکـاری"، "لـەخۆی نـامۆ"ی کـردووە ولـە شـێوەی مرۆڤێکـی راسـتەقینەو حـەقیقی واتـە کەسـێك کـە بـە کـاری عـەقڵی و ئەنـدامی خـۆی بـەکاری بەرهـەمهێنان هەڵدەستێت تاکو بەکاربهێنێت، بـە شـێوەی بوونـەوەرێکی وەهمـاوی دەرکـەوتووە کـە تەنها بەکاردەهێنێت. مرۆڤێکی لە خۆنامۆبوو کێیە؟ کەسێکە کە هەست دەکات و پێی وایە خۆی وەك" وەك رۆستەمی مەرد"ە.

بێکاری و بەرخورداری بە جۆرێك دروستی دەکـەن کـە "کـاتی فـەراغی — کـە بوەتـە هەموو بووونی ئەو— وە کاتەکانی بێکاری و پشوو — کە سەراسەری تەمەنی ئەو — بـە شـێوەی"بێمانـا" بیـەکی بـەردەوام و "ئـارامش"ێکـی مـەگبار لەسـەرەپای جیهـان و سەرانسەری ژیاندا ولە قوڵایی بـوونی خۆیـدا هەسـتی پـێ دەکـات و لەبەرئـەوە نیـاز و ئاگایی و جووڵە و بەرپرسیاریەتی و مەترسی و رەنج و بەرگری و سەرکەوتن و شـکان و تەدبیر و هەوڵدان، واتە "کار"، کە بوون دەکاتە "ئامـانج" و "مانـا" بـە ژیـان دەدات و

---

١- لە سیمای (محمد"ص") "ئیسلامناسیدا" ئەوەم دەرخستووە کە مەزهەبە ئاخیرەتگەراکان و لـە دونیا راکردووە شێوە سۆفیەکان پەروەردەی ئەشرافیەت و پێغەمبەرانیان هەموویان گەورە و(چین و هیند و ئێران) وە مەزهەبە جیهانگەرا و واقیعیەتگەراکان لە چینی مەحرووم وپێغەمبەرانیان هەموویان شوان و هەندێجار کرێکار و هونەرمەند ( موسی، نوح، داود، عیسی، و..پێغەمبەری ئیسلام.)

ئەویش لە هەموو ئەم شتانە "خاڵی"یە ولە هەمانکاتـدا هـەموو شـتێکی لـە جیهـان ولـە ژیاندا هەیە ولە هیچ بێبەش نیە !

ناچـار شـیرینیەکان لـە دڵیـدا نـامێنن و جوانیـەکان لـە بەرامبـەر چـاوەکانیدا ناشـیرین دەنوێنن و بەخششەکان سووک سەیردەکات و ولە دنیـای مـاددی بێـزار دەبێـت و ژیـان یەك جۆر، بوون بە "بێهودە" و سروشت بە"پوچ" و ئاسمان بە "شـێت" و مـرۆڤ "بـێ بەرپرس و بەرەڵڵاکراو" و خاڵی" لە هەموو شتێك و بێ ئەرك" و بێمانا و بێ سەرەنجام و ژیان بە بێهودەیەکی یەك جۆر و یەك رەنگ و پەژارە هێنەر دەبینێت. لەبەرئەوە یـان هـەروەك بـوزا بـە بـوون کـەنار دەگرێـت تاکولـەم "ژەهـرە تامدارانـە" دووربێـت و یـان هـەروەك رۆسـۆ"قارەمـانی کـامۆ" بـەدەم دەولەمنـدی نائومێدکـەری ئەپیکۆریـەوە دەکـەوێت یـان هـەروەك کـامۆ بـە بێهـودەیی دەگـات وەیـان وەکـو "ژیـدە" پـەنا بـۆ خۆخەڵتانـدن و بەهەشـتی بـەرزەخ دەبـات و یـان وەکـو "بێکـت" بـە هـەموو ئیمانێـك پێدەکەنێت و هەموو چاوەڕوانیەك بە "چاوەڕوانی وەهمـاوی گۆدۆ" دەژمێرێـت و یـان وەك "سارتەر" بوون بە "پوچ" دەبینێت و مرۆڤ بە پوچ دەزانێت و یان وەك تەسـەوف دەچێتە شوێنێکەوە تاکولە خەڵوەت رابکات و ئاگری عیشق مەبەستێك دادەگیرسێنێت تاکو ساردی ژیانی یەك جۆر و یەك رەنگ و بێ تـەکان و ترپـە گـەرم بکـات ولـە هـەوای پەرستراوی، بێهودەیی و پوچی ئازاراوی بوونی خۆی نەفی دەکات تاکولەودا بمێنێتەوە و مانای بەدەستەوە بدات یان بە دەروی بازنەیەکدا تەواف دەکات تـاکو خولگەیـەك بـە بـێ ئـەرکی و جیـایی بـوونی هەوڵـدەر و کۆشـشکەری خـۆی و فرەیـی پـەرش و بـڵاو و سەرسامهێنەری بوون خۆی بدات یان هەروەك سەرکەشی وەچەی دونیای خۆشگوزەران کـە لـە سـنوری تەسـك و تـاریکی"دەسـەڵات " تـۆوی خنکێنـەری"دابینکـردن و دامەزراندن" تەنگی چنراوە و دڵی لە خەمهێنەری تێری و ئارامشی کـاتی تێریکـات ولـە ژیـانی رێکخـراو و دیـار و ئامـادەکراو تێـر بـووە و روولـە "شـتە سەرسـوڕهێنەرکان و دەگمەنەکان" دەکات و بە سوریالیزم و رازاندنەوەی فۆرمالیزم و رەسەنێتی تـەکنیکی هونـەری! ولـە ئیمپرشـیۆنیز و تەنانـەت لـە جنۆکـە گـرتن و ئامـادەگی رۆحـەکان و

گیاخۆری و موزدایزم و رۆژهەڵات زەدەگی لادانی و رۆحانیەت سازی درۆزن هەڵدەچێت و دەورووژێت.

هەموو ئەمانەش بەرهەمی جەبری و ئەو هۆکارە پێویستیانەن کە پڕ کەر و ئاراستەکرەی جیهان و ژیان و خۆ خاڵیکردن و ناشیاو ئاراستە و ڕێرەوی مرۆڤە خاڵیەکانە. جوانکاری و رازاندنەوە، خەیاڵکردن، سڕبوون و وروژان و هەڵچوون!

ئەمەیە کە مرۆڤ بەهاکان لە جیهان ولە ژیاندا دروست دەکات. ئەم گوتەیە نەك بە مانای خود سەنتەری" اگوسانتریزم"، بەمانای مرۆڤپەرستان"هیومانیستەکان"ە و نەك بەمانای وەستان و رووکەشی بەرژەوەندی گشتگەرانە، مرۆڤ نەك لە "بوون"یدا بەڵکولە "کردن"یدا.

واقیعیەتی مرۆڤ ، لە برینە جیاوازەکاندا، خاوەنی حەقیقەتی جیاوازە. لە هەریەك لە "لایەن و بوارەکانی بوونی"دا جیلوەیەکی هەیە ولایەنێك کە لە "زیهنیەت و دوور لە واقیعیەتی کۆمەڵایەتی و کاتی" خۆیدا تەجەللا دەکات و هەروەها دەتوانێت "واقیعیەتێکی راستەقینە و دەگمەن" بێت. لە هەمانکاتدا کە مرۆڤێك بەشێکی دانەبڕاوەی"گشتێکی کۆمەڵایەتی"یە و "ویژدانی گشتی" لە خۆیدا بوونی هەیە، لە جیهانبینیەکی گەورە و خود ئاگاییدا گەشە دەکات و هەستیار پەی بە "خۆی" دەبات و سروشت و چارەنووسی خۆی بە سەرسوڕمانی و سەرزەمینی ئاشنایی لە بەرامبەر خۆیدا دەدۆزێتەوە و پەلەکردن و ژیان و تێپەڕین بە شێوەی سێ پرسیار لە ئەندێشە و بیریدا و سێ سەرچاوەی لە دایکبووی دوودڵی و دڵەراوکێ و ترس و سەرسوڕمانی لە هەستیدا تەرح دەبن و ئەمەیە کە دوودڵی واقیعیەتی بینراو و دەرەکیە کە تاکو هەرجێگەیەك کە رۆح لە دوودڵی ژیانکردن دووردەکەوێتەوە ولە "خود ئاگایی کۆمەڵایەتی بە خودئاگایی وجودی" دەڕوات و ترساوتر و زیاتر توشی دڵەراوکێ دەبێت.

لە دەبڕین و پیشاندانێکی لەمجۆرەدا مرۆڤ نەك خزاوەتە بۆشایی شوێنێکی چۆڵەوە کە لە تۆفانی ژیان و جوڵە پچڕاوە و ولە "فەزای بێ جووڵەی" سۆفیانەدایە و نە لە

"خـود چـۆتە دەرەوە" کـە دەرگـیر بێـت و بکەوێتـە داوی ڕۆژانـەوە و وون ببێـت لـە "ئاستی ئەوەی کە هەیە" بمێنێتەوە ولەسەربانی کورتی سروشتەوە سەرووتر نەفرێت.

مرۆڤ لە سروشتدا، نە"بوون"ە نە "پیشاندان"، بەڵکو "کردن"ە، سەرمایەی جیهانی بەس نیە، ئاوی هەموو ئۆقیانووسەکان تـین وویـەتی ناشـکێنن، بـوون بـۆ ئەندامـەکانی تەسك و تەنگە. لە نێو بوونەوەرانی دەگمەن، برسی، دوودڵ، نارازی و سەرکەشە. مرۆڤ لەم دونیایەدا ڕۆحێکی کۆچەرە، خودا ڕەنگێکە لە دوورخراوەدا.

سەرێك کە ئازار و ڕەنج و پەیماندان و ئامانجی نیە، بەرەو سـەرگەرمی دەڕوات تـاکو سەری"بەند" دەبێت، ئەندێشەیەك کە لەگەڵ حەقیقەتدا پەیوەستی و پەیوەندی نیـە و ناچار نایناسێت و کێش و تام و ڕەنج و هەست بە پڕبـوونی ناکـات، بـە خاڵیبوونـەوە و پوچی و بێهودەیی دەگات و هـەموو شـتێك: خـود، ژیـان و جیهـان بـە بێهـودە، خـاڵی، نەزانراو و هیچ لە هیچدا دەبینێت([٣٥]).

## فەلسەفەی بەدیهێنانی مرۆڤ

باڵ ی ناسراوی (مەلندن) لەلایەن تیپێکی فەرەنسیەوە جارێکی دیکـە پیـشانیاندا بەکەمێك گۆڕانکاریەوە، کـەمێك گۆڕانکـاری، بـەڵام کـەمێك کـە گـەلێك زۆر بـوو، زۆرێـك لەشتەکان کەمن، زیادن، هەموو شتێکن.

لەندەنی پێشان دەداکە دەمە خۆرئاوابوون بوو، گڵۆپەکانیان داگیرساندبوو، بـەڵام بەتەواوی نەدەبینران، چەند پەڵەیەکی پـیس هـەبوون لەچـەند گۆشـەیەکەوە لـە نێـوان تەمی لێڵـی شـار. باڵەخانـە گـەورەکان هـەروەك تارمـایی نـەزانراو ونکراولەتەمـدا نـوقم دەبـوون، هـیچ جووڵەیـەك بـوونی نـەبوو، شـار وەسـتابوو وهـیچ دەنگێـك بـەرگوێ

---

[٣٥]- ئەگەر چی ئەمانە خودی بەرهەمی هەمان "دوودڵی و دڵەراوکێن" کە مرۆڤـی بـاڵا هەیـەتی. پـشت بەستنی من بەم "نیشانە" شێوەنەخۆشانە، خاڵی لە پشتگیری ئەوانە نیە. لـە کۆمەڵناسـی شۆڕشـدا، بەرزبوونەوەیەکی ناسروشـتی چـەماوەی تـاوان و لادانـی پرچـەکانە و مـرۆڤ کوشـتنە تاکەکـسیەکان نیشانەی ئەوەیە.ی.

نەدەکەوت، بێدەنگیەکی قورس‌و درێژخایەن بوو، تەنها کاتژمێرێك چرکە چرکە دەکرد و ئەوەی پێشاندەدا لەهەرحاڵەتێکدا، هەر پێشهاتێك، زەمان کاری خۆی دەکات، تێدەپەڕێت، بۆ هیچ شتێك ناوەستێت، هەر شتێك بێتە پێشەوە یاتێك ناوەستێت سەیر بکات.

لەناکاولەقوڵێیی تەمدا سێبەرێك رەنگی دەگرت‌و زیاتر دەردەکەوت، لەژوورێکی گەرم‌و رووناك کەرووناکی گڵۆپەکانی ودەنگی مۆسیقایەکی نەرم کە لە پشت شووشە داخراوەو بەستراوەکانیدا، بەرەو دەرەوە دەهات، هاتەدەرەوە، لەبەردەم ماڵەکەدا کەمێك وەستا، سێبەری مرۆڤێك بوو، مرۆڤێك بوو، کەمێك وەستا، کە بەرێ کەوت، لەشاری تەمو مژاوی لەندەن باڵندە باڵی لێك نەدەدا. هیچ کەسێك نەیدەزانی چ حاڵێکی هەیە، بیرلە چی دەکاتەوە، ژ شتێکی دەکرد، بەرەو کوێ دەرۆیشت؟ کەوتەڕێ.... لە نێوان تەمدا هەنگاوی دەهاوێشت ولە کۆڵان وشەقامەکانی شار تێپەڕدەبوو و پاشان لەدڵی تەمدا وونبوو و پاشان هەرچەندە بینەر دڵتەنگ وچاوەڕوان دەمایەوە بۆ ئەوەی بزانێت چی دەبێت، هیچ هەواڵێك نەبوو و پاشان جارێکی دی شاری لەندەن بوو کە لە تەمدا وونبوو بوو وسکوتی کردبوو.

تەنها هەمان ئەو کاتژمێرە کاری خۆی دەکرد.

دەیەوێت بڵێت هەر کەسێك بیردەکاتەوە، ئەم پیاوە، ئەم بوونەوەرە مرۆییە دەناسێت، ناسراوە، هەر کەسێك دەربڕینێك‌و راڤەیەکی بۆ دەکات، یەکێك دەڵێت پیاوێکی سەرگەردانە، یەکێك دەڵێت لەماڵی خۆی رایکردووەو رقی لێکەوتووە، یەکێك دەڵێت ژیان پیشاندەدات کەچەند بێجووڵەو تەماوی‌و لێڵ‌و بێدەنگەو پیاولە ژیان بێزار رادەکات، یەکێك دەڵێت شارستانیەتی مرۆیی پیشان دەدات کە تیایدا مرۆڤیش سەراسیمەو دوودڵ وخەمۆکەو رەنج دەبات وپیاولەشارستانیەت رادەکات ودەیخاتە پشتی سەری. یەکێك دەڵێت مرۆڤ پیشان دەدات کە ئەمڕۆ تەنانەت لەشارێکی (١٢) دوانزە ملیۆنیدا تەنهایە. بەڵێ، هەر کەسێك شتێك دەڵێت، هەر کەسێك تەفسیرو راڤەی دەکات‌و دڵنیایەکە ئەو پیاوە دەناسێت بەلام تەنها کەسێکە کەهیچ ناڵێت، چونکە هیچ

نازانێت، نازانێت کەئەو پیاوە لەچ حاڵێکدایە، بیرلەچی دەکاتەوە؟ بۆ کوێ دەڕوات؟ چی دەوێت، ئەویش خودی ئەوپیاوەیە.

ئای چەندەها کەنیە لەم داستانی سەرسوڕهێنەری بەدیهێنانی ئادەمو موعجیزەی سەرسوڕهێنەری خودا! هەرچی بخوازینو بمانەوێت هەرچی بڵێین لەودا هەیەو ئەوەش کەئێستا دەیڵێم، بەڵام هەرچی هەوڵدەدەم جارێکی دی دەبینم ووشەکان نایکێشن، توانای هەڵگرتنی ئەم مانایەیان نیە، چەند لەلاوازیو سستیو پوچی وەە ژاری ونزمی ووشەکان رەنج دەبەم! ئەم گیانەوەرە زمان بەستراو بێچارانەش مافیان هەیە، چی بکەن؟ هەر ئەم ووشە بەدبەختانە وزەبوونانە دەڵێم.

چ کەمتەر خەمیەکیان کردووە؟ هەموو تەمەنیان شاگردو دەلاڵێ ئەم مرۆڤ گەلانە بوون، کاسبەکان، نووسەرەکان، بازرگانەکان، هەژارەکان، گەدا هەژارەکان یان دەوڵەمەندەکان، پرقسەکان، رۆژنامە نووسەکان، مامۆستاکان، شاعیرەکان، کتێب رەشکەرەوەکان، تەعزیە خوێنەکان، قسەکەرەکان، غەیبەتکەرەکان، سیاسیەکان، "ئاە خۆشەویستە"کانو....

ووشەکان لەدەزگای ئەمانەدا دەیان ویست ببن بەچی کەنەبوون؟ ئەم ئەربابە مێشك پوچانەو روونکردنەوەی ئەم بێچارانە مەگەر بۆچ کارێك دەیانسپاردن کە ئەمانە شتێك فێربن؟ ئەمانە هەموو تەمەنیان لەبەیانیەوە تاکو شەو ولە شەوەوە تاکو نیوە شەو چیان دەکردووو چی دەکەن؟ شەو ورۆژ ئەوانیان لەریزە بێ شوماری دوو سێ کەسی یان پێنج شەش، حەوت کەسی لەباوەش بۆن ناخۆشو تەرو بێ هەناسەو تاریکی دەمەکان بەدوای پێچو ناوپێچو تەسکو وتاریکو چەوروليتچو پالاوتەی گوێ (پیایی) پرتاودەکەن، لەکوێوەدێن؟ بۆ کوێ دەڕۆن؟ بۆچ کارێك دێن و دەڕۆن؟ لەراستیدا (خەندە هێنەرو زیاتر شەرمەزار هێنەرتر!

لەکوێ دروست دەبن وریزدەبن؟ لەدەمدا! دەم لەکوێدایە؟ دەم؟ دەم کە دیارە، پێش ئەوەی سك دەست پێ بکات! بەمجۆرەنیە؟ لەرێرەوی گەدە! بێگومان ئەوە بوترێت کەووشەکان، ئەم مندالانەی کە لەم حالەدا، لەسەرە رێگەی گەدەو گەرودا

پەروەردە دەبن ودەست بەکاردەکەن، بۆچی دەدەن، رۆح ورۆحیەتیان چیە، ووشەکان، ئەم منداڵانەی سەر رێگە ئەویش نەك سەر رێگەی مزگەوت.

سەرە رێگەی گەدە! ئەمانەن کە لەو سەرەتایەدا ولەم شوێنی لەدایکبوون و پەروەردەکردنە دروست دەبن وگەشەدەکەن وگەورەدەبن و پاشان تاکۆتایی تەمەن دەست بەخزمەتکردن دەکەن لەم دەزگایەداو وئێستا وەرەو سەیری من بکەو فرمێسك بەسەر پەشیمانی و تیاماویمدا برێژە کە لە گەڵ ئەم منداڵانەی بەسەررێگەی گەدە دووپیّ ی بەدنەژادو پیس و نۆکەر سیفەت وشێتدا کە هەروەك کرمەکان لەسەر رووی خاکدا هەموو تەمەنیان سوڕبەخۆن ودەمەوێت لەبارەی نیازو مەبەستی سەرسورهێنەری خودا بدوێم و ئەوعشقەی کە لەودا شوعلەی کشاولە ئاستانەی بەرەبەیاندا لەدڵەوە دەست بەپڕشکۆترین موعجیزەی گەورەی خۆم بکەم و بەقەڵەمی دروستکردنی ئەفرێنەری بەرزترین قەسیدەی خۆم لەسەر پارچەی خاکی تاریك و لێڵدا بن وسم و بەهێزی شوشەی موعجیزەگەری خەیاڵی ئاهورایی، پەیکەری نزیکی تەنها و تەنها نزیکی خۆی لەمەرمەڕی رۆحی خۆی بتاشم وفریشتەکانیش لەپای ئەم غەزەلە دەگمەنەی خودا، تەنها غەزەلی عاشیقانەی خودا بەسەرخاکدا بدەم.

چۆن دەبێت؟ چۆن دەتونرێت؟ لەگەڵ باڵندە قەڵەو وتەمبەڵ و پڕخۆرو نەخۆش باڵ شکاوی ماڵ، بەرەو ترۆپکی ئاسمانەکان فڕین وتاکو بارەگای عەرشی کیبریایی بەرەو میعراج رۆیشتن! مەگەر دەتوانرێت؟ مەگەر دەبێت؟

من هەر کاتێك ئەبو عەلی سینام دەهێنایەوە یادی خۆم کەرۆح، ئەم موعجیزە نهێنی ئامێزو سەرسوڕهێنەرەی بەم سیفەت و وەسفە پیشانداوە کەرۆح جەستەیکە، شێوە هەڵم "پێدەکەنیم وئێستا لەبەرخۆمەوە پیدەکەنم کەئەو ووشانەی ئەم لاپەرانە، ئەم شەوانەو ئەم رۆژانە هەڵەداوان وسەراسیمە و بەشەوقە رەش دەکەنەوە، لە بەرامبەر ئەو مانا وسۆزانەی کە هەروەك پێکەنینی فریشتەکان" "ئاوازی پەرەکانی جوبرئیل" لەو شەوە بێدەنگو پڕشکۆی کوێستانەداو هەندێجار وەکو گریەی گریان لە گەرووی ئەو راهیبەی پەرستگای زەردەشت، ئەوەی کە لە گەرووی خۆیدا دەگری،

لەخەڵوەتـدا دڵـی نـوقم دەکـات وهـاوار دەکـات.... ئـاه، ووشـەکان دەیانـەوێت لەگـەڵ ئەمانەدا چ شتێك بکەن؟ چ جێگەی بەگە نەگرتنە ئامادەگی ئەوانە لێرەدا!

چ ناشیرینە رێگەدان بەم چاو ساغە نـزم وپـیسو بـەد گـەو هـەرو دەم ناپاکانـە بـەرەو ئاسـتانەی ڕۆشـنایی خـودایترین خۆشویـستینەکان، عـەتر ئـامێزترین نائومێـدی خۆشترین یادەوەریەکان.... مەلەی ماسی رەنگ جوانو نەرم یـادی نزیـك لەئەسـتێڵكی بلورین رۆحی نزیك، سەمای وێنـای دوو تـەنها لەفـەزای خـەیاڵی یەکترولێدانـەکان وچـی دەڵێم؟ نابینیت ووشەکان نایەن؟ هەرچی دەکەم سوودی نیە، هەموویان ریزدەکەم؟ لە نێوان هەزاران وسەدهەزاران جەستەی ئاهەنگ خۆشـترین وجـوانترینو نـەژاد چاکترینو بەرزە فرینترینیان بەوردی هەڵدەبژێرم وتاکو بەرێ بکەم، چەند هـەنگاوێك نەڕۆیـشتووم تەنها دەبمەوە، تاکو کە مێك لـە ئاسـتی رووی سـەربانی ماڵـەوە بـەرزتر بفـرم، دەنگـی کەوتنی یەك بەیەکیان لەدوو توێی کۆڵانو سەرشەقامو ماڵو جۆگەو حـەوزو زبڵخانـەو چاڵە پیسەکان دەبیستم وناچار بێدەنگ دەبم، ساتێكو ساتەکانی کاتـژمێرێكو چـەندین کاتژمێر هەروەك بێچارەو حەیرەت زەدە هەر لەوێدا دەوەستم ودەمێنمەوە ونازانم چـی بکەم؟ هەندێجار تەنها دەڕۆم، بێ ووشە، چەند چاك وچ ئاسانو سووك بارو سووك باڵ، تـاکو هەرجێگەیـەك کەبمـەوێت، تـاکو خـوداولای دەرگـای خـودا.... لەهـەمان ئـەو سەفەرانەی کە دەڵێن پێغەمبەر (ص) شەوێك رۆیشت، شەوی ئیسراء (سەفەر لەشەودا) و لە هەمان ئەو سەفەرانەی کەئومێد وتویەتی:

لەگەڵ تۆدا دوێنێ شەو تاکوێ رۆیشتم

تاکو خوداولای دەرگای خودا رۆیشتم

من ناڵێم فریشتەکان باڵیان لەباڵمدا مەلەیان کرد

من ناڵێم کەبارانی ئاڵتون هات

بەڵام لەگەڵ تۆدا تاکولای خوا رۆیشتم

وە لە کۆتایدا دەڵێت مەپرسە چۆن و بۆچی رۆیشتی چونکە "من لەگەڵ تۆدا تاکو بـێ بۆچـی رۆیـشتم" و یـان مانـدوو قـورسو نائومێـد بەلێوانێکـەوە کـەتاڵترین

ئەفسوسەکانیان لێ دەبارێت، جارێکی دی ناگەڕێمەوە وبێدەنگ وغەمگین دەخزێمە کونجی ژوورەکەمەوەو ئیدی هیچ شتێك نایێتەوە یادم وئیدی بەبیرمدا نایەتەوە کە لەم ساتانەی کە بە نائومێدی گەڕاومەتەوە چ حاڵێکم هەیە، چۆن بیردەکەمەوە، بیردەکەمەوە یان بیرناکەمەوە، نازانم بەڵام دەزانم کە هەر لەم جێگایانەدایە کە لە دوو توێی وێنەکانو نووسینەکانم لەناکاو بێدەنگ دەبم‌و لەمەوەیەکە دەست بەهەرشتێك دەکەم، ناتەواو دەمێنێتەوە و لێرەدایە کەدێڕی سپی دەست پێدەکات، رستەی بێدەنگ دەست پێدەکات بەڵام.... چ چاوێك دێڕی سپی دەخوێنێتەوە؟ بەڵام.... چ کەسێك رستەی بێدەنگ دەبیستێت؟

ئایا ئەوەی کە لە نێوان ژاوەژاوی هەمیشەیی دەریایی کەهەمیشە دەنگی دێت، بێدەنگی دەریا دەبینێت ئەگەر نەتوانێت؟

بەڵام نەهێز، یەکێك لەگەورەترین ئەو بەخششانەی کەخودای گەورەبە گوێکان وچاوەکانی بەخشیوە ئەوەیەکە زۆرێك لەدەنگەکان، ئەو دەنگانەی کەخوار پلەی بیستنەوەن وئەوانەش کە لەسەرووی پلەی بیستنەوەن نابیستێت وەزۆرێك لەڕەنگەکان ناتوانێت ببینێت، ئەگەر دەیانتوانی دەمردن یان شێت دەبوو. مرۆڤ توانای بەرگەگرتنی هەستکردنی ئەوانەی نیە. شیرازەی دەماری بەهاوارێك پچڕپچڕ دەبێت، من ئومێدەوارم کەچاوێك ئەم نووسینە سپیانە، ئەم دێرانەی کە بەبێ ووشە دەن وسم، نەخوێنێتەوە و گوێیەك کە ئەم ووتراوە بێدەنگانە، ئەم رستانەی کەبێ دەربڕین دەریان دەبڕم، نەبیستێت. نامەوێت خوێنێ کەس بگرمە گەردنی خۆم، کەسێك بەرەو شێتی بەرم.

من هەمیشە بۆ سەلامەتی و خۆشی نزیکانم، دۆستانو ئاشنایانم وە خوێنەرانو بیسەرانم نزا دەکەم و هەمیشە ئارەزوومەندم ئەمانە کە بەشێوەی "عەقڵی ساغ لەجەستەی ساغ" نابینم، لەراستیدا چەند جوانن!

بەهەرحاڵ ئەگەر بەم دووجۆرە بێدەنگ نەبم: رۆیشتن وسەفەری تەنها لەشەودا بەرەو رووی ئاسمان، تاکولای خودا، ئەو کاتەی کەووشەکان دادەنێم‌و خۆم دەرۆم ویان گەڕانەوە بەماندوویی‌و غەم لەگۆشەی حاڵ وهیچ نەوتن‌و سەرداخستن ونەبیستن و

هەستنەکردن.... هەندێجار لەنێوەی رێگادا دەگەڕێمەوە و لەسەربانی ماڵەوە دادەنیشم وجارێکی دی ووشەکان دەخوێنمەوەولە نێوانیاندا هەڵدەبژێرم وسەفەرێکی دیکە ورێگایەکی دیکەو بەرەولایەکی دیکە دەست پێدەکەم وجارێکی ئەوان چەند هەنگاوێکی دی لەگەڵدادێنو جارێکی دی دەمێننەوەو جارێکی بەتەنها دەمێنمەوەو جارێکی دی دوودڵی و دوودڵی و دوودڵی و پاشان، یان "تاکوێ"؟ دەڕۆم بەتەنیایی وهەندێجار بۆماڵەوە دەگەڕێمەوەو ئیدی هیچ ولێرەدایە کەدەبینین لەم لقەوە بۆ ئەولقەولەم رێگەیەوە بۆ ئەو رێگەیەو هەرچی دەست پێدەکەم بەخێرای کۆتایی پێدێتو قسەکان هیچ کات کۆتاییان نایەت و هەرچی دەڵێم نەوتراو زۆرتردەبێت و هەرچی دەنووسم، نەنووسراوەکان درێژدەبن ومن لەم کێشمە کێشە گێژو دژوارو تێکەڵە پارچە پارچە دەبمۆ هەرپارچەیەکم بەرەولایەك دەپەرێت و وون دەبێت و بەم شێوەیە هەمیشە شاهێدی هەوڵدان ورژانو کەوتن و بەباداچوون و لە چاوی خۆم وونبوونی خۆم وەچەند سەخت ودژوارە!

* * *

ها.... قسە لەبارەی دروستبوونی ئادەم بوو و قسەی قورئان کەخودا بۆچی ئادەمی دروستکرد، ناچۆن دروستی کرد کە ئەمەم بەکورتی تەفسیرکردووە، وبۆچ کارێکی دروستکردو ئادەم چ سوودێکی بۆ خودا هەیە؟ وەخودا بۆچی خۆی، لەقورئاندا بەئاشکرا وەڵامی ئەم پرسیارە دەداتەوە، بەڵام بەداخەوە بۆچی لە درێژایی مێژووی ئیسلامدا، زۆرێك لەراڤەکاران وتوێژی گوتاربێژانو کۆمەڵی زانایان وفەقیهەکانو فەیلەسوفان وعاریفان هاتوونو رۆیشتوونوکەسێك لەم قسەیە تێنەگەیشت؟ وەسەرم سوردەمێنێت کەچۆن لەونێوانەدا تەنها ئەم مانایە بۆمن ئاشکرابووە ومن بەدروستی ئەوە دەزانم کەئەوەی کەلێی تێدەگەم بەجۆرێك لەحەقیقەتەوە نزیکە کەدەڵێی خودا خۆی تەفسیری ئەم گوتە هێمادار و لێڵەی خۆی بەسەرمندا خوێندوتەوە وئیمانم هەیە

بـەوەی کـە لـە بەرئـەوەی ماناکـەی بـۆ هـەمووان والآنـەکردووە، لەبەرئەوەیـە کـە بەهۆی"تێگەیشتنە کورت"ەکانەوە گەورەیی ومەزنی وجوانی نهێنی ئامێزی ئەم ئایەتـە بکەنە دەفری شکاو تەنگ وپیسی تێگەیشتنەکانی خۆیان.

ئایەتەکەش ئەمەیە:

﴿وماخلقت الجن والانس الاليعبدون﴾ الذاريات-٥٦.

(پەریەکان و مرۆڤەکانم دروستنەکردووە، جگە لەوەی کە "بەندایەتیو پەرستش" بکەن)، مانای چیە؟ ئەمە خۆویستیە کەخودا ئادەم دروست بکات بۆئەوەی پەرستشی بۆ بکات!

ئایا مانای ئەم ئایەتە بەم کرچو کاڵیو بەمجۆرەیە؟ ئایا جگـە لەخۆویـستی خـودا قسەیەکی دیکەی تێدانیە؟

چ خۆویستیەکی بێهودە!

بـەلآم بـەرزایی ئـەم قـسەیە سـەرووترە لـەم سـنورانە، خۆویـستی هەیـە، چـۆن؟ بەندایەتیو پەرستش هەیە، بەلآم چۆن؟

ریشەی زاراوەی"عبد" منی بەرەو قوڵیی ئەم ئایەتـە رینمـونی کـرد: عبـدالطريق، بەندەی رێگـە، بەرێگەیـەم دەڵێـت کەرێگەیـەك بێـتو هەمیـشە بـێ بـەرزونزمی، نـەرمو سـاف، بـەمجۆرەی کـەرێبوار (سـالك) هـەروەك بەلـەمێك لەسـەر سـنگی نـەرم شـەپۆل دەبرێت ودەروات، تاکو مەبەست بەهەمیشەیی ورێبـواری، رێگـەی ببرێـت و رێگـە پـێی رێبواری خۆی ئازارنـەدات، درکـی رێگـە بـەپێی ئـەم رێبـوارەی رێگـەی کەعبەنـەڕوات، پێەکانی بریندار، گەنیو، خوێنـاویو شـکاو و ئـازاراوی نـەکات، رێگەیـەك نـەبێت لـەژێر هەنگاوەکانی ئەم سەودازەدەی کەعبەیە، چاكو نەرمو میهرەبان، هەروەك ئاو یان هەوا لەژێر هەنگاوی کەشتیدا...

وەخـودا ئـادەمی دروسـتکرد تـاکو ببێتـە رێرەوێکـی رامکـراو هەمیـشەیی لـەژێر هەنگاوەکانی ئیرادەی خودایی، مرۆڤ ببێتە رێرەوی خوداو رێگوزەری ویستەکانی خودا.

چۆن مرۆڤ دەتوانێت رێرەوێکی نەرمو رامکراوبێت بەسەر رێگەی خوداوە؟ هەربەو جۆرەی کەرێگەیەكو رێگوزەرێك تەخت و چاك دەكەن، دەبێت پێی پیابنرێت، بکوترێت، بەردو وردەبەردەکان و بەرزیەکان ونەرماییەکان تەخت بکرێت وبکوترێنەوە، دركو داڵەكانی ریشەكێش بکرێتو وردە رەنجو شتە زیادەکان بکوترێتەوەو نەرم بێنو چاك بکرێت وببێتە "رێگا" و پاشان ئیرادەی خودای گەورە هەروەك تیشك بڕواتو بەرەو پێشەوە بڕواتو بەرەو مەنزڵ بگات.

بەمەنزڵ؟ مەگەر خودا دەیەوێت بۆكوێ بڕوات؟ مرۆڤ کەبوبە رێگەو رێگوزەرێو رێگە چاککراوو رێرەوی رامی ئەو بێت، ئەم نەزانراوە جارێکی دی دەمێنێتەوە کە بەرەو کوێ؟ وەخودای گەورە لەم ریگوزەرە لەكوێ ئاهەنگی هەیە؟ سەری مەنزڵی مەبەستی چیە؟

ئای کەچ قوڵ وجوان وپڕ شەوق وتاسەو هەژێنەرە ئەوەی کەئێستا بیرلەوەڵامی دەکەمەوەو وچ گەورەو سەرنج راکێشو هەتاهەتاییە ئەوەی کە تیایدا هەستی پێدەکەم!

بەڵێ، خودا لەم رێگوزەرە چاککراوە، بەمجۆرە پڕ لەخۆشیو سەرکەوتوو ورازیبوو وموشتاق بەرەو کوێ دەڕوات؟

دەبێت هەموو ئەو هێزەی کەهەلە لەتێگەیشتنو دۆزینەوەدا، بۆ وەرگرتنی ئەم مانایە پڕچەکی بکەیت.

(لەم رێگەیەدا، سەرمەنزڵێکی هێمادار کەخودا بەمجۆرە بەرەو رووی دەڕوات بریتییەلە مرۆڤ.)

چی دەڵێم؟ رێگوزەر مرۆڤە، رێگەیەکی کەوتوولەژێر هەنگاوەکانی ئیرادەی خوداوەند، مرۆڤە، بەڵێ، بەڵام سەرمەنزڵێك کەخودا بەم شێوەیە موشتافانە بەرەو رووی دەڕوات، مرۆڤە.

مەگەر دەبێت؟ رێگە ومەبەست هەردووکیان یەك بن؟ بەڵێ، رێگە و مەبەست هەردووکیان یەکن.

چی دەڵێی ئەی تێگەیشتن کەخووت گرتووە بەشتەکەمەکان! دەبێت تاکو ئەو جێگەیە برۆی کە بەروونی خۆر ئەوەت بۆ دەربکەوێت کەرێگەو مەبەست یەکێکن، چی دەڵێم؟ دەبێت لەم سنورەش تێپەر یتو بچیتە سەر ئەو بەرزاییانەو بتوانی ئەوە ببینی کەرێگەو رێبوارو مەبەست هەرسێکیان یەکێکن ولێرەدا تەکە سیالیزم (تثلیث)ی گشتی بەرەو یەکتاپەرستی (توحید) دەکشێت و(باوك وكورو روح القدس) دەبنەیەك.

بەڵام خودا، لەرێگوزەری مرۆڤدا، بۆ مرۆڤ دێت چ شتێك دەكات؟ مەگەر ئادەم، ئەم نزیکە زیندانیەی خاك، ئەم (نیوە خاك_نیوە خودایە) لە کۆتایی ئەم رێگەیەدا چاوەروانی گەیشتنی ئەم نزیکە ئاسمانیە خۆی نیە؟

مەگەر خودا ئادەمی دروست نەکرد تاکو ئەو خەزێنەی شاراوەی دەربهێنێت؟ بیناسێت؟ لەسەحراکانی خەڵوەت وخامۆش وبێدەنگی ئاسمانەکانداو ولای کاکێشانەکاندا تەنها نەبێت؟ لەنێو ئەستێرەکاندا غەریب نەبێت؟ لەناو فریشتەکاندا ستایشکەری بێگانە نەبێت؟ لەم بوونەدا نەزانراو نەبێت؟

مەگەر ئادەم، ئەم هەناسە پاکەی خودا، ئەمانەتداری خودا، جێنشینی زەوی خودا، خاوەنی نهێنی خودا، شاگری تایبەتو مەحرەمی ئەم مامۆستا ئاسمانیە کەتەلیسمی"ناوەکان"ی تەنها فێری ئەو کرد، یان نا تەنها ئەو فێربوو و بەفێربوونی ئەم هێمایانە، کلیلی هێمای کردنەوەو واڵاکردن کە بەهۆیەوە گەنجینەی شاراوەی بەدەستهێنا، گەنجینەیەك کەخودا زۆر موشتاق بوو تاکو دەستی مەعریفەتی بکاتەوەو ئامادە کرایەوە، مەگەر ئەم ئامادەش خۆی موشتاقی دیداری پەروەردگاری خۆی نیە؟ مەگەر ئەو کەنیوەی لەگەڵ خودادا هاو سروشتەو رۆحی ئەوی لەمی خۆی بەبەردانەکردووە لە کۆتو بەندی زەوی، زیندانی خاكو نیوەکەی ئەم جیهانەی تەنگ نەبووە؟

مەگەر ئەولە کۆتایی رێگەدا چاوەروانی گەیشتنی نزیکی خۆی نیە؟ مەگەر ئەو نایەوێت کە ئەم رێبوارە نەزانراوە، رێبوارە تەنهایە، ئەم کە لە نیشتیمانی خۆیدا غەریب، ئەم بێگانە نەناسراوە خامۆشە، خودا، بگات، بگاتو ئەونیوەی خۆی

کەکردویەتی بەبەری جەستەی خاکی ونزیکی زەوی، لەزینـدانی خاکـدا دەری بهێنێـت و بیهێنێتە دەرەوە و لەگەڵ خۆیدا بۆ ئاسمانەکان، جێگای یەکەمینی بگەڕێنێتەوە؟([36])

خـودا موشـتاقی بینینـی نزیکـی زەمینـی خۆیـەتی، ئـەم ئەمانەتـدارە کەئاشـنای خۆیـەتی ولەزەمینــدا زیندانیــەو ئــادەم، ئــەم ئەمانەتــدارو نزیکــەی زەوی، ئــەویش چاولەرێگای ویسالّی ئەوە، بێ قەراری گەیشتن بەئەو، کەواتە دەبێت چی بکات؟

دەبێت ئەم رێگەیە هەرچی زیاتر ببڕێت، بکوترێـت، بـەردو وردە بـەردەکانی نـەرم بێن، درکو دالّی پاك ببێتەوە، رام بێت ولەژێر هەنگاوەکانی ئەم رێبوارە موشتاقە، ئـەم سوارە نەناسراوە کە بەتەنها دەڕوات، ساف ویەك دەست ومیهرەبان و ئارام ورام ببێت، تەسلیمی تەسلیم بێت.

وەتۆئەی مرۆڤ! ئەی تـەنها نزیکـی خـودای تـەنها ! ئـەی ئەمانەتـداری گەنجینـەی خودایی، ئەی دۆستی ئاشنای خودا لەزەوی وئاسمان، ئەی زیندانی خـاك، ئـەی کـە لـە کۆتایی رێگەدا بێقەراری هاتنی ئەوی، ئەی کەتەمەنێك چاو لەرێگەی وبۆ کەسێك کە لـە دوورەوە دەسـتت بـۆ درێـژدەکات واق ورمـاوی، ئـەی سـەرمەنزڵی مەبەسـت لـەژێر هەنگاوەکانی ئیرادەیدا ببە بـەڕێبوار ورێگـوزەر! خـۆت بکوتـەو بشـکێنە ووردبکـە، لـە بەرامبەر تەنها نزیکی تەنها خۆتدا رام ببـە، خۆیەدەسـتەوە بـدە، خـامۆش وبێـدەنگ و ئارام بە، تاکو موسافیرێك کەنیازمەند وموشتاق بەرەو رووت دێت لەرێگادا نەوەسـتێت، مانـدوو نائومێـد نـەبێت، لـەرێگادا نەمێنێتــەوەو ئـەو رێگــە درێـژەی گرتویەتیەبــەر بەسەمەتی ببڕێت و بەزوویی تۆ کە لە کۆتایی رێگەدا چاو لەرێگەی ئەوی ببینێت ولەم شـوێنی"میعـاد"دەدا کـە لـە بەرەبـەیانی"الـست"([37]) ئـەو جێگـەی لـەجیهانی گـەردا دەژیاین و بریارماندا لەم شوێنەدا دیداری یەکتری بکەین دوو نزیکی دوورکـەوتوو بەیـەك بگەن ودوو رێگانە لەگەڵ یەك ئاشنا ببنەوەو ئادەم نیـوە زینـدانی خـۆی رزگـار بکـاتو

---

[36] – ئەمەیە مانای ئایەتی بەناوبانگی "انالله وانا الیه راجعون" (ئێمە لـەخوداین ئێمـە بـەرەو لای ئـەو دەگەڕێینەوە).

[37] – ئامازەیە بەئایەتی: "الست بربکم...." سورة البقرة.

تەلیسمی خەزێنەری پەنهانی نزیکی ئاسمانی خۆی، خودا بکاتەوەو خودا بەدیداری ئەم پەروەردەو پاكو موعجیزە ئاسای خۆیەوە دەربکەوێتو بەدیهێنراوی خۆشەویستی خۆی لەگەڵ خۆی بەتەنیایی نەمری خۆی بەرێتو لەگەڵ ئەودا "مرۆڤ" نزیك ببێتەوە.

لێرەدایە کەحیکمەتی قوڵی (خۆبەدەستەوەدان وتەسلیم و رەزامەندی، تفویض([٣٨])
وپەرستش و بەندایەتی وئیسلام) کەئەوندە لە مەزهەبدا قسەی لەبارەوە دەرکرێت، ئاشکرا دەبێت. چونکە مرۆڤ دەبێتە رێبواری رێگەی خودا تاکو خودا زوتر بەمرۆڤ بگاتو لێرەدایە کە مرۆڤ هەرچەندە زیاتر لە بەرامبەریدا خۆی بەدەستەوەبدات وتەسلیم ببێت، زیاتر دەبێت مەبەستی کۆتایی و ئامانجی بەدیهێنانی کەهێندە خرۆشێنەرو جۆشێنەرە زوتر دێتەدی.

وەتۆ ئەی مرۆڤ، ئەم پەیامەی خودا ببیستە کەبۆگەیشتن بەتوانای رەهاو بۆ دەرکەوتنی رەنگ سیفەتی خودا لەتۆداو بۆ تەیکردنی دووری وماوەی درێژی نێوان زەوی و ئاسمان، دەبێت هەر لەم زیندانی جەستەدا، زنجیری خاك، غوربەت زەوی بهێنێتەوەو بمێنێتەوەو بەخۆراهێنانی خۆبەدەستەوەدانو ئەشکەنجەی پەرستش، رێگەی گەیشتن بەخودا، ئەو سەرچاوەیەی کەرۆحی تۆ شەپۆلێکە لەو، لەبەردەم پێیەکانیدا ئامادەی بکەیت وتۆدەتوانی کە لەم زیندانی خاکەدا، رزگاری خۆت بەدەست بهێنێت، لەرەنگی خودایی بگریتو خوداش سیفەتەکانی لەتۆدادربکەون، هەموو ئەمانە دەتوانی بەدەست بهێنیت، دەتوانی بگەینە هەموو ئەم شوێنانە، هەرچەندە لەگیرۆدەیی ژیانی خاکیدابیت وگرفتاری زەوی نزمی دونیا بمهێنێتەوە، ئەگەر عیبادەت

---

[٣٨] – بەمانای پێدانۆ خستنەسەری بەرژەوەندیەکانی خودو بڕیارو چارەنووس وئیرادەی خود بۆ ئیرادەی خوداو ئاماژەیە بەم ئایەتە پیرۆزە: (وافوضى امري الى الله، ان الله بصير بالصبار). هەموو کاروبارەکانم دەدەمەدەست خوداو پشت بەودەبەستم، چونکە خودا بێگومان بینایە بەبەندەکان، هەموو کارو چارەنووسم دەدەمە دەست خودا، چونکە خودا بەندەی خۆی دەبینێت (بینەری بەندەکانی خۆیەتی) وەبەمجۆرەی هەست دەکەیت، پەرستشو بەندایەتیو بەندە لێرەدا بەمانای لاری ولاوازی کەهەمیشە لێوەی دەردەهێنرێت نیە. بەم راڤەیە مانا جۆرێکی دیکەی لێ دێت کەلەسنور سەرکەشی وپوچی سەرووترە.

